٦٣

# سەردەم

سالی دوانزەهەم
هاوینی
٢٠١٠

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتوری بیانی

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

خاوەنی ئیمتیاز:
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر:
ڕەووف بێگەرد

دەستەی نووسین
ڕێبین هەردی

دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری
تاڤگە فائق

هەڵەچنی چاپ:
ساکار ڕەووف

بەرگ :
نەرمین مستەفا

-سەردەم گۆڤارێکی وەرزییە، تایبەتە بە نوسین و وەرگێڕانی کولتوری بیانی لەبواری فەلسەفە و ڕەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.

-داوا لەو بەڕێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێر، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بەچاپ و بڵاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێردراو بنێرن.

-ئەو بەڕێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداری دەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێڕەوبکەن.

-باشتروایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێردا.

-ئەو بەڕێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێرن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و ڕۆژی بڵاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.

-بەرهەمەکان گەر بڵاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.

-پەیوەندییەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.

# ناوەڕۆكی:
## سەردەم - ژمارە ٦٣

### فیکر و فەلسەفە



### گفتوگۆ



### ئەدەب



### وێستگەکانی سەردەم

---


**ناونیشان:**

سلێمانی - شەقامی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن: سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩

دەزگای سەردەم ٣١٢٩٦٠٩

**نرخی (١٢٥٠) دینار**

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

Tel _ Fax: 00447543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی
ژمارە (615/ 14665 و 616/ 14665) تاران

**لە ڕێگەی (ئیمەیل)ەوە:**
govarysardam@yahoo.com

www.serdam.org

# بانگەواز بۆ خودبەدیهێنان

## مارتین هایدگەر: بوون و کات (١٩٢٧)

ڕۆبێرت تسیمەر
لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

دەرکەوتنی هایدێگەری گەنج لە فەلسەفەی ئەڵمانیی سییەکاندا هاوشێوەی سەرهەڵدانی بیتڵس بوو لە شەستەکاندا. هەر زوو زانرا، کە هایدێگەر فەیلەسوفێکی نائاساییە، کە ئەو فەلسەفەی وشکی ئەکادیمییانەی تووڕ داوە و خودی فەلسەفەی گەڕاندۆتەوە بۆ لای کێشە کرۆکییەکان. هایدێگەر ساڵی ١٩٢٣ لە ماربورگ بوو بە پرۆفیسۆری یاریدەدەر و فێرخوازانیش پۆل پۆل بەو هەستەوە دەهاتن بۆ ماربورگ کە گوایە لەوێ فەلسەفە فێرناکرێت، بەڵکو بە پراکسیس دەنوێنرێت.

بڵاوبوونەوەی نووسینی «بوون و کات» ئەو تێڕوانینەی ڕاستاند کە بەو پێیە هایدێگەر دەنگ و شێوازێکی نوێی هێناوەتە نێو سێیدنی فەلسەفەوە. گەرچی ئەو کتێبە بە زمانێکی زۆر ئاڵۆز و تایبەتمەند نووسراوە، کەچی سەرەڕای ئەمە خوێنەرانی سەرەتای هایدێگەر سەرسامبوون بەوە کە ئەو بە چ شێوەیەک ڕووی دەکردە پەیوەندییە کۆنکرێتیەکانی ژیانی مرۆڤ. لە سەنتەری ئەم کتێبەدا کاتیگۆری و پرنسیپ یان یاسا خۆیان نەدەبینییەوە، بە پێچەوانەوە «بوون و کات» ڕوو دەکاتە بابەتەکانی وەک «ترس»، «زۆرگە»، «مەرگ»، ئەمانەش ئەو بابەتانە بوون کە دەمێک بوو لە فەلسەفەی ئەکادیمیدا بزر بوو بوون.

پێش هەموو شتێک ئەو داواکارییە بە خوێنەر گەیشت کە گەرەکە ئەو خۆی لە ژیانی بێهۆشی (بێهزری) ڕۆژانە بپچڕێنێت و ئاگامەندانە و بەڕوونی ئەکزیستێنسی خۆی بفۆرمێنێت. «بوون و کات» بانگەوازێکی فەلسەفی بوو بۆ خۆریالیزەکردن.

هایدێگەر بەم ئیشەی سەرەتا پلانی دیکەی لە مێشکدا بوو. ئەو دەیویست مێتافیزیک و

ئۆنتۆلۆژی، زانیندنومای بوون و دوایەمین بناغەکانی رووداگە، نوێبکاتەوە، ئەو دەیویســـت بناغەی «ئۆنتۆلۆژییەکی بناغەیی» برێژێت و بە شــێوەیەکی نوێ وەڵامی پرســـیارەکە سەبارەت بە بوون، واتا ســـەبارەت بە تاریکترین و گشـــتیترین تێگەی فەلسـەفە، بداتەوە. بەڵام هایدێگەر لەسەر ئەم رێگەیە لەلای تێمێک گیری خوارد، کە ســـەرەتا دەبوو تەنها بریتی بێت لە رابەرییەک رووەو بوون: تێمـــی ئەکزیستێنســـی مرۆڤ. «بوون و کات» تەنها فراگمێنتێک مایـــەوە و رەنگە هەر لەبەر ئەم هۆیەش بووبێت کە کاریگەرییەکی ئاوها گەورەی نواند. «بوون و کات» بوو بە شرۆڤەیەکی مرۆڤ و بەســـتراوەییەکەی مرۆڤ بە جیهانـــەوە، بە کۆمەڵەوە لەتەک مرۆڤانی دیکـــەدا، بەڵام بەتایبەتی بەستراوەیی ئەو بە ئاسۆی کاتێتی و لەناوچوونەوە.

بێگومان گەرچی خوێندنەوەی «بوون و کات» خوێنەری دووردەخستەوە لە تەنگیی دانوستاندنە فەلسەفی و شرۆڤە تایبەتییەکان، بەڵام بە نووسەری «بوون و کات»ـەوە، بە هایدێگەری مرۆڤەوە، بە دەرکەوتن و زمان و پێگەیشتنی ئەوەوە، «لادێیەتییەک»ی تایبەتی لکابوو. هایدێگەر خۆی نەک تەنها لە گەورەشارەکان بەدوور دەگرت، بەڵکو تەنانەت لە جیهانی مۆدێرنی تەکنیک و میدیاکانیش. ئەو هەرگیز لە دەرەوەی شارە زانکۆییە بچووکەکانی وەک فرایبورگ و ماربورگ کاری نەکرد.

هایدێگـــەر زۆر وێنـــە و بەراوردکاری لە باشـــووری بادنی زێدی خـــۆی وەردەگرێت کە وڵاتێکی گەشـــتیاری و پێشمۆدێرن بوو. تێگەکانی وەک لیشـــتونگ (Lichtung = کلاورۆژنە)، هۆڵتسڤێگە (Holzwege = تولەرێی شـــاخ / تەیمان) بوون بە لکی زمانە فەلسەفییەکەی ئەو. هایدێگەر حەزی دەکرد لە پۆشاکی میللیی ناوچەکەی خۆیدا دەربکەوێت و لەتەک فێرخوازانیدا شی (Ski) بئاژوێت. ئەو لە نزیکی فرایبورگەوە، لە تۆتناوبێرگ، کووخێکی شڤارتســـڤالدیانەی بۆ خۆی دروســـت کرد و تێیدا بەدوورەپەرێزی لە جیهانی مۆدێرن چاوەڕوانی ئیلهامی دەکرد. ئەو تەنانەت «بوون و کات»ی لـــەم کووخەدا نووســـی، رووبەڕووی بیرێک و چیمەنـــی قەدپاڵەکان. هایدێگـــەر هەرگیز نەبوو بە «پیاوی جیهان». ئەو تەنها لە باشـــووری خۆرئاوای ئەڵمانیا کە شەقڵێکی ئەلەمانیی وەرگرتبوو، بەڕاستی هەستی دەکرد لە ماڵی خۆیدایە.

لە جیهانی منداڵیی هایدێگەردا کاریگەریی کلێســـەی کاتۆلێکی هەردەم لەسەر ژیان و پەروەردە ئامادە بوو. ئەو ســـاڵی ١٨٨٩ لە شـــارۆچکەی مێسکیرش لە کەناری باشـــووری شڤارتسڤالد هاتە جیهانەوە، ئەم رەچەڵەکەی هەر لە ســـەرەتاوە مۆرکی ئایینێتییەکـــی تایبەتیی بە ئەو دا. ئەوەش پاشان هەر کلێسەی کاتۆلیکی بوو کە نەک تەنها رێگەی پەروەردەی ئەوی دیاریکرد، بەڵکو تەنانەت خەرجیی ئەو پەروەردەیەشـــی لە ئەستۆ گرت: دوای ئەوەی کڵێسە دەرماڵەی خوێندنی بۆ بڕییەوە، سەرەتا رۆیشت بۆ ئینتەرناتێکی کاتۆلیکی لە کۆنستانس، پاشان ساڵی ١٩٠٦ شوێنی خوێندنەکەی گـــۆڕی بۆ کۆنڤیکتی مەترانی لە فرایبورگ، بەڵام مەرجی گوزەرانکردن لەو کۆنڤیکتەدا ئەوە بوو کە ئەو دەبوو لە فرایبورگ تیۆلۆژی بخوێنێت و رێگەی قەشەیەک بگرێتە بەر.

بێگومان هایدێگەر ســـاڵی ١٩٠٩ هەنگاو دەنێتە نێو ئـــەم فێربوونە زانکۆییەوە، بەڵام پاش دوو ســـاڵ وازی لێدەهێنێت. هێدی هێدی دەلاقەیەک لە نێـــوان هایدێگەر و زانیندنومای کاتۆلیکیدا دێتە

ئاراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو پابەند بوو بە پارەی کلێسەوە، ئەوا ناچار بوو رێگەچارەیەکی نێوانی هەڵببژێرێت: هایدێگەر بڕیار دەدات «فەلسەفەی کاتۆلیکی» وەک چەقی قورسایی دابنێت تاکو بەم شێوەیە درێژە بە دیراسەکەی بدات.

هایدێگەر تەرکیز دەخاتە سەر فەلسەفەی کریستیانیی چەرخی نێڤین و ساڵی ١٩١٥ هابیلیتاسیۆنەکەی بە ئیشێک لەبارەی دەنس سکۆتوس ئەنجام دەدات. بەڵام هایدێگەر ساڵی ١٩١٩ بە فەرمی واز لە کلێسە دەهێنێت، سەرەڕای ئەمەش خەریکبوونی پێشینی ئەو بە ئیمان و ناوەرۆکە تیۆلۆژییەکانەوە هێشتا هەر ئەسەری خۆی لە هزری ئەودا جێدەهێڵێت. تێگەکانی زانیننومای مۆرالی کریستیانەتی، لەوانە «ویژدان» و «گوناه» (خەتا) لە فەلسەفەی ئایندەی ئەودا سەرهەڵدەدەنەوە بە هەمان شێوەی داواکارییەکەی ئەو بۆ پشتکردنە جیهان و رووکردنە توێژێکی قووڵتری روودانگە، کە بێگومان مۆتیڤێکی ئایینیی هەبوو.

ئەوە هیچ جێی سووڕمان نییە کە فەلسەفەکەی هایدێگەر بە شێوەیەکی موئایەشەی وەرچەرخان سەرچاوە دەگرێت: هایدێگەر ئیشەکەی ئێدموند هوسەرلی دامەزرێنەری فێنۆمێنۆلۆژی دەناسێت. هوسەرل ویستی فەلسەفە سەرلەنوێ بگەڕێنێتەوە بۆ سەرچاوەکانی و لە باری تیۆرییە ئەکادیمییەکان رزگاری بکات. هوسەرل هەر پەیوەست بەم مەبەستەوە بانگەوازی دا بۆ «گەڕانەوە بۆ لای خودی شتەکان». بەڵام تەنها گەر ئێمە بەرەو بناغەی چالاکییەکەی بەئاگابوونمان رۆبچین، ئەوسا بە شتەکان دەگەین، واتا بە فێنۆمێنەکان دەگەین کە ئەزموونی رۆژانەی جیهانمان پێکدەهێنن. هوسەرل ویستی ئەو پێشبڕیارە یەکالا بکاتەوە کە گوایە بەئاگابوونمان شێوەیەکی ئۆرگانی تۆمارکردنە و هێدی هێدی بە ناوەرۆک پڕ دەبێتەوە. لە روانگەی هوسەرل نە سەبژێکتی پەتی و نە ئۆبژێکتی پەتی هەیە، بە پێچەوانەوە بەئاگابوون هەر لە سەرەتاوە بەستراوە بە شتەکانەوە. بەئاگابوون هەمیشە رووەو ئۆبژێکتەکان «ئاراستەی گرتووە» و جیهانی شیاوی دەرککردن وەک تۆڕێک لە نێوان ئێمە و شتەکاندا دەچنێت.

هوسەرل تەقەلایەکی گەورەی بەگەڕخست تاکو گۆڕان بە مێتۆدێکی فێنۆمێنۆلۆژیانەی لێکۆڵینەوە و «هەڵوێست»ێکی فێنۆمێنۆلۆژیانە بدات کە تێیدا چالاکی و «ئاراستەدراوی»یەکەی بەئاگابوون لە فۆرمێکی هەتا رادەی شیان پەتیدا دەردەکەون. هوسەرل دەیویست سەرجەم «گریمانە پێشینەیی» و «پێشبڕیارەکان» بکوژێنێتەوە، تاکو دید بۆ چالاکیی پەتیی بەئاگابوون ئازاد ببێت و لە کۆتاییدا ئیتر فێنۆمێنەکان «دەربکەون».

هایدێگەری فێرخوازی زانکۆ بۆ ماوەی دوو ساڵ «لێکۆڵینەوە لۆگیکییەکان»ی هوسەرلی لە کتێبخانەی زانکۆ ئیستیئارە کرد بەبێ ئەوەی لەو ماوەیەدا یەک جار بیگەڕێنێتەوە بۆ کتێبخانە. هوسەرل دوای یەکەم جەنگی جیهانی لە گۆێتینگنەوە چوو بۆ فرایبورگ و لەوێ کورسیی پێدرا، هایدێگەریش بوو بە یاریدەدەری زانستیی ئەو. ئێستا فێنۆمێنۆلۆژی دەبێت بە نیشتمانە فەلسەفییە نوێکەی هایدێگەر، بەمەش بە یەکجاری ماڵئاوایی لە فەلسەفەی کریستیانی دەکات.

بەڵام مامۆستا گەنجەکەی زانکۆ زۆر زوو لە خوێندنەوە و هزریندا رێگەی خۆی دەگرێتە بەر:

هایدێگەر ئیشەکانی ئەو فەیلەسوفانە دەخوێنێتەوە کە وەک نوێنەری «فەلسەفەی ژیان» ناسراون، بــۆ نموونە فریدریــش نیتچە، ڤیلهێلم دیلتی، ئۆنری بێرگســن. ئەم فەیلەســوفانە جەختیان لە فۆرمەکانی «تێگەیشتن»ی هەستمەندانە و ئینتوئیتیڤ دەکرد نەک لە رۆڵی بەئاگابوون و ماریفەتە پەتییەکانی زەین. دیلتی ئاماژەی دا بەوە کە نەشــیاوە مرۆڤ وەک ئۆبژێکتێکی ئاســایی زانســتە سروشــتییەکان «روونبکرێتەوە»، بەڵکو مرۆڤ لەنێو موئایەشە و بەدیهێنانە کولتوورییەکانییەوە شــیاوی «تێگەیشــتن»ـە. بێرگســن کە ئەو دەمە یەکێک بوو لە بەناوبانگترین فەیلەسوفەکانی ئەوروپا، لەپاڵ هەندێک بابەتی دیکەدا هەروەها لەو فۆرمە جیاوازانەی دەکۆڵییەوە کە ئێمە تێیاندا موئایەشــەی «کات» دەکەین. بــەڵام هایدێگەر هەروەها تیۆلۆژی دانمارکی ســۆرن کیرکەگۆردی دەخوێندەوە کە ئەو دەمە زۆر کەم ناسرا بوو. کیرکەگۆرد لە نووسینەکەیدا بە ناونیشانی «تێگەی ترس»، ئازادیی مرۆڤی پەیوەند کردبوو بە دۆخی ترسەوە و داوای لە مرۆڤ کردبوو بەرێی ئیختیارێکی بنەماییەوە مەغزایەک بە ئەکزیستێنسی خۆی بدات.

مۆرکی دۆخی هەستەکی / ورە (Stimmung) لە سەردەمی دوای یەکەم جەنگی جیهانیدا بریتی بوون لە بەئاگابوونی تەنگژە، گەڕانی هۆشــەکییانە بۆ ئاڕاســتەوەرگرتن، هەژانی نوێســەرەتا، ئەم دۆخە هەســتەکییەش هەروەها رۆڵێکی گێڕا کە هایدێگەر پتــر رووبکاتە فێنۆمێنە کۆنکرێتەکانی ئەکزیستێنســی مــرۆڤ. لە هەموو لایەک بەئاشــکرا پرســیاری ئەکزیســتێنس و ئیختیار دەکرا. بێگومان هایدێگەر پێش جەنگیش سیمپاتیی بۆ ئەو بزووتنەوانەی لاوان هەبوو کە هەڵوێستیان بۆ سروشتێتی و رەسەنێتی، بۆ گەڕانەوە لە فۆرمە وشکهەڵهاتووە کۆمەڵایەتییەکان، رادەگەیاند و نەک تەنهــا تەقەلایان بۆ نوێکردنەوەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییــەکان دەدا، بەڵکو هەروەها بۆ «ریفۆرمی ژیان»ی تاکەکەسیش.

هــەر بەم شــێوەیە هایدێگەر بوو بــە فێنۆمێنۆلۆژێکی زۆر تایبەتمەند. ئەو لە هوســەرل ئەو داواکارییــەی وەرگرتبــوو کە مەردوم گەرەکە لە بناغەوە، لە مەرجــە بناغەییەکانی مرۆڤ خۆیەوە، بکەوێتــە لێکۆڵینەوەی دەرووی مرۆڤ رووەو جیهان. بەڵام بــۆ هایدێگەر نەک بەئاگابوون، بەڵکو ژینجیهان، واتا ژیانی ئاســایی رۆژانەی مرۆڤ، دەبێت بە بابەتی لێکۆڵینەوە. هایدێگەر ســەرجەم جۆری فەلسەفاندنی خۆی ئاڕاســتەی ئەم ژینجیهانە دەکات. ئەم جۆرەی فەلسەفاندن هایدێگەری بەناوبانگ کرد، ئەمە تەنانەت لەو کاتەشدا کە ئەو هێشتا وانەبێژێکی گەنج بوو لە فرایبورگ.

فێرخــوازان ناویــان نابــوو «جادووگەرەکەی مێســکیرش»، چونکە دەیتوانی بە گرتنی شــتە رۆژانەییەکان پرســیارگەلی فەلســەفی دابگیرســێنێت. هایدێگەر لەبــەردەم فێرخوازانیدا لەبارەی مەنەسەکە دەدوا، ئینجا هەوڵی دەدا روونی بکاتەوە کە لێڕوانەر و بابەت کەرتی «شوێنەوارێک»ی هاوبەشــن، کەرتــی پەیوەندییەکی چنــراوی بابەتگەلن. لەنێو ئەم چنراوییــەوە دەرفەت بۆ مرۆڤ دەڕەخســێت «واتا»ی بابەتەکان بناســێت (erkennen). ئەوە کە لەلای هوســەرل بریتی بوو لە پێکەوەلکانی سەبژێکت و ئۆبژێکت لەنێو بەئاگابووندا، لەلای هایدێگەر بوو بە پێکەوەلکانی مرۆڤ بە شتەکانەوە لەنێو شوێنەوارێکی هاوبەشدا.

بۆیــە جیهان کــە ئێمە دەرکی دەکەین و لەنێویدا دەژین (ئەمــە زانیندنوماکەی هایدێگەرە)، لە مەغزایەکی تەواو راســتەوخۆدا هەمیشە جیهانی مرۆڤە. جیهان و مرۆڤ بەرانبەر یەک نەوەستاون، نەخێر، مرۆڤ هەمیشە کەرتێکی جیهانە. فەیلەسوفە مەزنەکان هەمیشە لە «بوون»ێکی نەگۆڕدا: لە ئیدێدا، لە پرنســیپ و کاتیگۆریدا، بۆ بناغەکانی هەقیقەتی ئەم جیهانە گەڕابوون، بەڵام ئێستا هایدێگەری بزوێنراو لەلایەن بێرگســنەوە هەوڵ دەدات ئەم «بوون»ـە بخاتە سەر بناغەیەکی تەواو نــویێ: «کات». بەڵام لەبەر ئەوەی کات بەندە بە دۆخگۆڕییەوە، ئەوا ئیتر چیدی نەدەشــیا مەردوم لەنێو پرنسیپی نەگۆڕدا بۆ بوون بگەڕێت.

کاتێک هایدێگەر ســاڵی ١٩٢٣ وەک پرۆفیســۆری یاریدەدەر بانگکرا بۆ ماربورگ، ئیتر بۆ ئەو بزێوترینــن کاتی ژیانی چ لە رووی فەلســەفی و چ لە رووی ژیانی تایبەتییەوە ســەرەتا دەگرێت. هایدێگــەر ســاڵی ١٩٢٤ هانا ئارێنت دەناســێت کە کیــژە فێرخوازێکی گەنجی فەلســەفە بوو و بۆ ماوەیەکیش دەبێت بە دەزگیرانی؛ ئەو لەتەک کارل یاسپەرســی زەمیلیدا لە هایدلبێرگ «کۆمەڵەی خەبات» دادەمەزرێنێت، کۆمەڵەیەک کە دەیەوێت بە ستایلی نوێ و تێمی نوێ تەحەدای فەلسەفەی ئەکادیمییانە بکات. هایدێگەر هەندێک کات لەنێو هەژانێکی ئافرێنەردا دەژی.

ئیتر هێدی هێدی وەک ســەرەنجامی ئەم کەشــە زۆر بەبەرهەمەی ژیان، ئەو ئیشــەی هایدێگەر شــێوەی کۆنکرێتی وەرگرت کە ئەو بەرێیەوە لە زانایەکی گەنجی ئاماژەبۆکراوی ژێرلێوەوە سەرکەوت بۆ ســەر ئاستی پاشافەیلەسوفی ئەڵمانی. پرۆژەی «بوون و کات» لە خەریکبوونێکی سەربەخۆی هایدێگەرەوە لەتەک فێنۆمێنۆلۆژیی هوســەرلدا پێگەیشــت، بەڵام هاوکات بزوێنرابوو لەلایەن دۆخە هەســتەکی / ورە و پرســیارە ژیانییەکانی ئەو قۆناغەوە. بەڵام دوایەمین پاڵهێز بۆ تەواوکردنی ئەو ئیشــە لەلایەن خودی زانکۆوە هات: ســاڵی ١٩٢٥ دەبوو لە ماربورگ سەرلەنوێ پۆستی بەتاڵبووی پرۆفیسۆرێکی فەلسەفە بگیرێتەوە، لەوە دەچوو کە هایدێگەر یەکەم کەسی شیاو بێت بۆ ئەو پۆستە، بەڵام ئەو دەبوو بۆ وەرگرتنی بڕیارێکی پۆزەتیڤی وەزارەتی کولتوور لایەنی کەم بڵاوکراوەیەکی گرنگ بخاتە بەردەم وەزارەت. ئاخر هایدێگەر لە ساڵی ١٩١٦ بەدواوە، واتا ساڵی بڵاوبوونەوەی لێکۆڵینەوەی هابیلیتاسیۆنەکەی، هیچ ئیشێکی دیکەی بڵاونەکردبۆوە.

هایدێگەر لە وردە ئامادەکارییەکانی بۆ ســمینارەکان، لە موحازەرەگەلی پەرەپێدراو و گۆتارادانی نووســراو بــۆ زانکۆ، دەستنووســی «بوون و کات»ی ئامــادە کرد. ئــەو ٢٤ ژوڵای ١٩٢٤ لەبەردەم «کۆمەڵگــەی تیۆلۆژیــی ماربــورگ»دا خوێندنەوەیەکی لەبــارەی «تێگــەی کات» ئەنجام دابوو و بەهۆی قەوارەکەیەوە نەدەشــیا وەک گۆتــار بڵاوبکرێتەوە. هایدێگەر ئەم نووســراوەی پەرەپێدا بــۆ لێکۆڵینەوەیەکی حەفتاوپێنج لاپەڕەیی، ئینجا زەمێســتەری هاوینەی ١٩٢٥ لە موحازەرەیەکدا بەناونیشــانی «مێژووی تێگەی کات» سەرلەنوێ دەستی دایەوە هەمان کێشە و لێرەشدا بۆ یەکەم جار رووی لە پرســیاری وەک «مەرگ» و «ویژدان» کرد. هایدێگەر لە پشــووی زەمێســتەردا لە کوخەکەی خۆی لە تۆتناوبێرگ ئەم تێمانەی هێنایە نێو تێکستەکەیەوە.

شکۆفەی دەستنووسێکی قەوارەفراوانی کتێب هەتا مانگی مارتی ١٩٢٦ی خایاند. هایدێگەر یەکەمین

بەشـــی دەستنووســـەکەی گەیاند بە چاپ، ئینجا لە ڕەوتی ســـاڵی ١٩٢٦دا هەنگاوی نا بۆ کارکردن لە بەشـــی دیکەی کتێبەکەدا و پاشـــان یەکی نۆڤەمبەر توانی ئەوانیش بەرێت بۆ دەزگای پەخش. لە کۆتاییدا چەند بەشـــێک مانەوە کە هایدیگەر تێیاندا لەتەک کانت، دێکارت و ئەریستۆتێلیســـدا خەریک بوو بوو، بەڵام نەیتوانی تەواویان بکات و لە بڵاوکراوەی درەنگتریدا فۆرماندنی. بڵاوبوونەوەی کتێبەکە ڕێی بۆ هایدیگەر خۆش کرد کە ناونیشانی پرۆفیسۆری پێبدرێت. ئەم ناونیشانپێدانە کە پێشتر دوو جار لە لایەن وەزارەتەوە ڕەفز کرابوو، ئۆکتۆبەری ١٩٢٧ ڕووی دا.

کـــێ بۆ یەکەم جار «بـــوون و کات» بخوێنێتـــەوە، ناچارە خۆی لەتەک زمانە نائاســـاییەکەی هایدیگـــەردا ڕابهێنێت. هایدیگەر یەکێکە لـــە ئافرێنەرە مەزنەکانی زمان، بـــەڵام هەروەها یەکێکە لە زمان–وەرفۆرمێنەرەکانی فەلســـەفە. تێگە ئاشناکانی وەک «لێرەبوون» یان «مشوور» (زۆرگە = Sorge) واتـــای تـــەواو نوێ و تەواو وەرگـــۆڕراو وەردەگرن. هایدیگەر لێـــرەدا زۆرجار دەگەڕێتەوە بۆ مەغزایەکی ســـەرچاوەیی وشـــەکە، بۆ بناغەدراوییەکی ئێتیمیۆلۆژیانەی وشەکە. بەڵام هەروەها دروستکردنی وشەی تەواو نوێ، وەک داس «مان» (مەردوم) یان داس «تسوهاندنە» (بەردەستی)، تەحەدایەکـــی خوێنەرن. خوێنەر نابێت هیچ تێگەیەکی گرنگ کە هایدیگەر بەکاریدەهێنێت، لە واتا ئاساییەکەی ڕۆژانەیدا تێبگات یان ئەو واتایە وەک پێشمەرجی تێگەیشتن لە هایدیگەر دابنێت.

«بوون و کات» بە پرســـیار سەبارەت بە «مەغزای بوون» ســـەرچاوە دەگرێت، بەڵام کتێبەکە لـــە کۆتاییدا وەڵامی ئەم پرســـیارە ناداتەوە. لـــە ڕوانگەی هایدیگەر بـــوون وەک بناغەی ڕوودانگە بریتی نییە لە «بوونەوەر»ێک، واتا شـــتێکی شیاوی وەســـفکردن و پێناسەکردن نییە، وەک چۆن پێشـــتر زۆرینەی فەیلەســـوفان باوەڕیان دەکرد. بەڵام ســـەربارى ئەمە ڕێگەکە بەسەر بوونەوەردا دەمانگەیەنێت بە بوون، بێگومان بەســـەر بوونەوەرێکی تەواو تایبەتیدا: مرۆڤ. بۆ هایدیگەر مرۆڤ پردێکە ڕووەو بوون، چونکە مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە (Wesen) کە پرســـیار لەبارەی بوون دەکات، یان چونکە مرۆڤ «تێگەیشتن (ێکی) بوون»ی هەیە و لەبەر ئەم هۆیە لەو پایەگایە/ دۆخە پەتییە تێپەڕ دەکات کە شـــت (Ding) یان کەلوپەل (Sache) هەیانە. بۆیە مرۆڤ شـــێوازە بوونێکی تەواو تایبەتمەندی هەیە و هایدیگەر ناوی دەنێت «دازاین». لێکۆڵینەوەی، یان وەک هایدیگەر دەبێژێت، «شرۆڤەی بناغەیی دازاین»، بریتییە لە تێمە ڕاستەقینەکەی «بوون و کات».

لەتـــەک «دازاین»دا تێگەیەک دێتە نێوانەوە کە ڕەنگـــە بەناوبانگترین تێگەی «بوون و کات» بێت: «ئەکزیســـتێنس». بەڵام ئەکزیســـتێنس بۆ هایدیگەر تەنها هەقیقەتی ژیان یان هەقیقەتی ئەکزیستێنســـکردن نییە، بەڵکو بەزۆریی پەیوەندییەکی نێـــوان دازاین و بوونە. ئێمە دەبێت ئەم تێگەیە لای هایدیگەر لە مەغزای وشـــە سەرچاوەییە لاتینییەکەدا تێبگەین: واتای وشەیی «ئێکس–زیستەرە» بریتییە لە «دەرکەوتن / ڕابوون» (herausstehen). لەبەرئەوەی مرۆڤ دەتوانێت گۆڕان بە پەیوەندییەک لەتەک بووندا بدات، ئەوا بەم ڕێیەوە لە جیهانی ئاســـایی شـــتەکان دەر–دەپەڕێت (ragt heraus). ئەکزیستێنس بریتییە لە لێرەبوونێکی ئاگامەندی بەدیهاتووی ڕووکردووە بوون.

هایدیگەر بەڕاســـتی دەیەوێـــت لێرەدا ڕێگەیەکی نـــوێ، ڕێگەیەکی شۆڕشـــگێڕانە بگرێتە بەر.

ئەو نایەوێت لە «پشـــت» یان لە «دەرەوە»ی شـــتەکانەوە بۆ بوون بگەڕێت، بەڵکو دەیەوێت لە بەدیهێنانێکی (Vollzug) تایبەتیی ژیانی مرۆڤدا بۆی دەگەڕێت: شێوەی بنیاتنانی ئەکزیستێنسی مرۆڤ لەلایەن خودی ئەو خۆیەوە. پاشـــان گەرەکە لە «بوون ی دازاین»ـەوە «مەغزای بوون» وەک سەرجەم هەڵبدرێتەوە.

بەڵام ئەوە کە لە کۆتاییدا وەک ســـەرجەمە دارشـــتنێک لەبەردەم خوێنەردایە، تەنها دوو باســـی بەفراوانـــی ئـــەوەن کە هایدێگەر لە بنەڕەتدا مەبەســـتی بوو وەک بەشـــی یەکەمـــی لێکۆڵینەوەکە دایبڕێژێت: هایدێگەر لە باسی یەکەمیاندا بە ناونیشانی «شرۆڤەی ئامادەکەرانەی بناغەیی دازاین» شرۆڤەی جۆرە رۆژانەییەکەی ژیانی مرۆڤ لە جیهاندا دەکات، ئینجا لە باسی دووەمدا بە ناونیشانی «دازایـــن و کاتێتی» لەتەک ئەو پرســـیارەدا خەریک دەبێت کە چۆن مـــرۆڤ دەتوانێت پەیوەند بە پاشخانی کاتەوە ئەکزیستێنسی خۆی بەدیبهێنێت، کە چۆن ئەو دەتوانێت روو لە بوون بکات. بەڵام باســـێکی ســـێیەم کە هایدێگەر لە بنەڕەتدا مەبەستی بوو و دەبوو سەرەنجامی ئەم شرۆڤانە لەژێر ناونیشـــانی «کات و بوون»دا لەخۆ بگرێت، لەنێو نووسینەکەدا نییە، هەروەها بەشێکی دووەمیش لەنێو نووسینەکەدا نییە، کە هایدێگەر پلانی دارشتنێکی فراوانی بۆ دانابوو و گەرەک بوو رۆشنایی بدات بە تێگەی بوون لەنێو مێژووی فەلسەفەدا.

هایدێگەر بە «شـــرۆڤەی دازاین» ســـەرچاوە دەگرێت، بەکورتی بە شـــرۆڤەی ئەوە کە مرۆڤ لە «بوونـــەوەر»ی دیکـــە جیادەکاتەوە. بەڵام ئـــەوە مرۆڤی ئاگامەند و خۆبەدیهێنـــەر نییە کە خۆی لـــە نێوەندی شـــرۆڤەکەدا دەبینێتەوە، بەڵکو مرۆڤی ئاســـایی رۆژانەیە کە گرێـــدراوە بە جیهانە راهاتووەکەیەوە و هەســـت بە ژیانی خۆی وەک کێشـــەیەک ناکات. هایدێگـــەر بۆ ئەم دۆخە تێگەی «ناخۆیەتـــی»ی هێنایە نێوانەوە و بەرانبەر «خۆیەتی» دایناـ واتـــا بەرانبەر ئەو دۆخە کە مرۆڤ تێیدا ئاگامەندانە پەرچەکردار لەسەر مەرجەکانی ئەکزیستێنسی خۆی دەنوێنێت.

هایدێگەر بۆ شـــرۆڤەی مەرجەکانی ژیانی ئاســـایی رۆژانە بەتایبەتی پشت بە دوو سەرەتاگریی تیۆریانە دەبەستێت: «هەڵوێست»ی فێنۆمێنۆلۆژیانەی هوسەرل کە بێگومان ئێستا لێرە روودەکاتە ژینجیهـــان، هەروەها «هێرمینیوتیک»ی ڤیلهێلم دیلتی، واتا رێبازی تێگەیشـــتن لە موئایەشـــەی مرۆڤیی. هایدێگەر دەیەوێت «هێرمینیوتیکی دازاین» بەگەڕ بخات، واتا دەیەوێت ئەو شـــێوەیە کە چۆن شـــتگەل و مرۆڤان لە کارئەنجامدانی رۆژانەدا بە یەکترییەوە پەیوەندن و پێکەوە ئاڵۆزکاون، ئاشکرا بکات و لە شێوازێکی نوێدا روونی بکاتەوە، هەتا ئیتر لە کۆتاییدا گوزارە سەبارەت بە مرۆڤ وەک سەرجەم شیاو بێت.

هایدێگەر بە تێگەی «لەنێو-جیهان-بوون» پەیوەندییە بناغەییەکانی ژیانی مرۆڤ دیاری دەکات. پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە شتەکانەوە لە لایەک، پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە مرۆڤانی دیکەوە لە لایەکی دی، سەر بەم «لەنێو-جیهان-بوون»ـەن. مرۆڤ هەردەم خۆی لەنێو «دۆخ»ێکدا بەرانبەر شتگەل و مرۆڤانی دیکە دەبینێتەوە. گەر ئێمە بمانەوێت لەو کرۆکە تێبگەین کە بە مرۆڤ تایبەتمەندە، ئەوا دەبێت دیدمان رووەو دۆخە بناغەییەکانی مرۆڤ بەر بدەین.

شتەکان بە هەمان شێوەی مرۆڤ سەر بە «شوێنەوار» (جیهانی دەورمان / Umwelt)ێکی نێوکۆیین، کە لەنێویدا هەردووکیان پێکەوە پەیوەستن و هەردووکیان ئاماژە بۆ یەکتری دەدەن. پەیوەستبوونی شتەکان بە مرۆڤەوە بەڕێی بەکارهێنان و کەڵکەوە دێتە ئاراوە. بۆیە هایدێگەر شتەکان هەروەها وەک «ئامراز» (تسۆیگ / Zeug) دیاری دەکات. ئەمە یەکێکە لە وشەداهێنانەکانی هایدێگەر، ئەمە تەواو ئاگامەندانە تێگەکانی «ئامرازی کار» یان «ئامرازی نووسین»مان دەهێنێتەوە یاد. ئامراز بۆ مرۆڤ ئینسترومێنتێکە و کاراییەکی لەنێو ژیانی ئەودا هەیە. ئامراز لە خزمەتی شتێکدایە. شتەکان هەروا سووک و ئاســان «لەگۆڕێدا نین»، وەک چۆن فەلسەفەی ترادیسیۆنی نوێنەرایەتیی دەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە «بەردەســتن»، ئەوان بۆ ئەوە لێرەن تاکو لە «بەردەست»ی مرۆڤدا بن. شوێنەواری (جیهانی دەوری / Umwelt) مرۆڤ بەڕێی «بەردەســتی»یەوە شــەقڵی پێدراوە، بە واتایەکی دی بەڕێی ئاشنایەتییەکەوە کە لەتەک-مامەڵەکردنی ڕۆژانەوە هاتۆتە ئاراوە.

«لەتەک-بــوون» مۆرکێکی دیکەی «لەنێو-جیهان-بوون»ـە، ئەمــەش بریتییە لەو هەقیقەتە کە مرۆڤ هەرگیز بەتەنیا ناژی، بەڵکو هەمیشــە پەیوەســتە بە مرۆڤانی دیکەوە. بە هەرحاڵ ئەم «لەتەکبوون»ـــە فۆرمێکی تــەواو تایبەتیی لە ژیانی ڕۆژانەدا وەرگرتووە و بریتییە لە گونجاوی و هاوهەڵوێســتی / یەکگرتنەوە. ئێمە لەبریی ئەوەی بەڕێی خەریکبوونمانەوە لەتەک ئەوانی دیکەدا ئاڕاســتەیەکی تەواو تایبەتی بە ژیانمان بدەین، کەچی هەوڵ دەدەین دەرنەکەوین و تەقەلا دەدەین وەک ئەوانــی دی بین. ئێمە بەرپرســیاری بۆ ژیانمان دەدەین بە ســەروەرێکی (ئینستانســێکی) بێڕوخسار و سەیر بێلایەن، جا ئەو سەروەرە هۆشی سەردەم بێت، چێژی عەوام یان ئاکار بێت.

هایدێگەر ئەم ســەروەرە ناو دەنێت داس «مان» (das Man = مەردوم)، ئەمەش تێگەیەکە کە ئەو واتا و کارایی ناوێکی ئامادە (اســم مجارع)ی پێدەدات. مەبەست لە مەردوم بریتییە لەو سوڵتە (ئۆتۆرێتییە) گشــتییە کە هەرگیز بە کۆنکرێت شــیاوی دیاریکردن نییە، ئەمەش بۆ نموونە لەم جۆرە داواکاریانەدا دەردەکەوێت: «مەردوم ئەمە دەکات» یان «مەردوم ئەمە ناکات». «دیکتاتۆریی مەردوم» کە هایدێگەر لێی دەدوێت، بریتییە لە دیکتاتۆریی مامناوەندێتی کە ڕێ لە مرۆڤ دەگرێت خودی خۆی بەدیبهێنێت. مەردوم بۆ هایدێگەر پێکهاتەیەکی ئاسایی (نۆرمالی) ژیانی مرۆڤە و ئێمە هەرگیــز ناتوانین خۆمانی بە تەواوی لێبپچڕێنین، بەڵام ئێمە دەتوانین بە شــێوازێکی ئاگامەندانە هەڵوێســت لەبارەی وەربگرین، ئێمە دەتوانین کۆتایی بەو ســەروەرییە بهێنین کە مەردوم بەســەر ژیانماندا دەینوێنێت.

شرۆڤەی مەردوم کە هایدێگەر ئەنجامی دەدات، سەر بە بەناوبانگترین برگەکانی کتێبەکەیە. ئەم شرۆڤەیە چووە پاڵ ئەو ڕەخنەیە کە لە ئانۆنیومێتیی (نادیاریی) کۆمەڵگەی مۆدێرنی جەماوەرەکان دەگیرا، بۆ نموونە لەو شــێوەیەدا کە پاش چەند ســاڵێکی کەم فەیلەسوفی ئیسپانی ئۆرتێگا ی گاسێت لە ئیشە سەرەکییەکەیدا بەناونیشانی «ڕاپەڕینی جەماوەرەکان» گرتی. هایدێگەر هەروەها هەمیشە دژبەرێکی فۆرمە مۆدێرنەکانی ژیان مایەوە، دژبەرێکی جیهانی ئوربانی، جیهانی کۆگەرایی، کە بەتایبەتی لە شارە گەورەکاندا هاتبووە گۆڕێ. ڕەفزکردنەکەی هایدێگەر ڕووی دەکردە دێمۆکراتیی

وەک فۆرمێکی سیاسـیی ژیان، بەڵام هەروەها رووی دەکردە نێوەندی گشـتیی شەقڵپێدراو لەلایەن میدیاکانەوە، واتا نێوەندێک بە هەواڵە یان رەهەندە خێراژیاوەکانییەوە. مۆدێرنە بۆ هایدێگەر بریتی بوو لە جێیەکی ژیانی «ناخۆیی».

لەم پەیوەندییەی رەخنەدا لە ژیانی ناخۆیی هەروەها بڕگەیەکی دیکەی بە هەمان شێوە بەناوبانگ لە «بوون و کات»دا هەیە کە لەتەک «چەقەچەق» و «فزوولیەت»دا خەریکە. مەبەستی هایدێگەر لە «چەقەچەق» یان «فزوولیەت» شـێوە رواڵەتییەکانی کۆمونیکاسیۆنە (پێوەندیی نێومرۆڤییە) کە رێگرن لە تێگەیشتن لە نێوان مرۆڤاندا، نەک دەرفەتی لەیەکتێگەیشتنیان بۆ برەخسێنن. هەموو شتێک لەو روانگەیەوە دەبینرێت کە داخۆ شتەکە وەک دەرکەوتەی نوێ یان هەواڵ شیاوی بەکارهێنان بێـت. لە روانگـەی هایدێگەر «چەقەچـەق و فزوولیەت لەنێو دوو واتاییەکەیانـدا رۆڵێکی ئەوتۆ دەگێڕن کە ئیتر دروسـتکراوی رەسەن و نوێ یەکسەر لەتەک دەرکەوتنیدا بۆ نێوەندی گشتی کۆن بووە». گەر ئێمە لەنێو ئەم فۆرمانەی کۆمونیکاسـیۆندا بمێنینەوە، ئەوسا لێرەبوون «بەرەڵابووە» (Verfallen). «بەرەڵابوون» بۆ هایدێگەر ئەدگارێکی لێرەبوونی ناخۆییە. مرۆڤ بەرێی شێوەکانی کۆمونیکاسـیۆنی رۆژانەوە، بەڵام بەتایبەتی بەرێی ئیغراکردنەکانـی جیهانی مۆدێرنی راگەیاندن و میدیاکانەوە، بەردەوام لە مەترسیدایە کە لە خودی خۆی دووربخرێتەوە، لە خودی خۆی ژێربپەرێت (بپچرێت).

شێوە جیاوازەکانی لەنێو-جیهان-بوون سەرەتا دەمانبەستنەوە بە ژیانێکی نامۆبووی ناخۆییەوە. هایدێگەر دەبێژێت کە «لەنێو-جیهان-بوون هەمیشـە بەرەڵابوونە». مرۆڤ بۆ نێو جیهان فڕێدراوە، نەک ئەو خۆی لەوێ دانابێت. بەڵام ئەم فڕێدراوییە، وەک چۆن هایدێگەر دیاریی دەکات، دوو لایەنی هەیە: بەرمان دەدات بۆ رووداوگە، بەڵام هەروەها ئەسـپێکتی کراوەییش، شـیمانەی پڕۆژەی خۆیی ژیان، لە خۆ دەگرێت.

ئـەم جۆرە تێڕوانینـە دوولایەنییەی فڕێـدراوی و پڕۆژە-توانین خۆی هەروەهـا لەنێو تێگەی «زۆرگـە»دا (Sorge) دەبینێتەوە. هایدێگەر هەوڵ دەدات بەم تێگەیە ئەسـپێکتە کرۆکییەکانی دازاین پوختبکاتەوە، بەڵام ئەو لە حاڵەتی ئەم تێگەیەشـدا لە بەکارهێنانی ئاسـاییی زمان لادەدات: تێگەی «زۆرگە» بۆ ئەو واتای «خەم» (Kummer) ناگەیەنێت، بەڵکو مەبەستی ئەو لەم تێگەیە مامەڵەی ئامانجداری پلانرێژی مرۆڤە لەتەک جیهاندا، ئەمەش بۆ نموونە بەرێی وشەی ئەنجامدانەوە (besorgen) دەردەبڕرێت. کاتێک ئێمە ئەنجامدەرانە رەفتار بە ئاراستەی شتەکانی جیهانی دەورمان دەنوێنیـن، ئەوا ئێمە لە مشـوورخواردندا (Fürsorge) بە هاومرۆڤمانـەوە پەیوەندین، واتا ئێمە ئەویدی وەک دازاینی هاوبەها لە پلانڕشتنی ژیانماندا رەچاو دەکەین.

لە روانگەی هایدێگەر پەیوەندیی ئەنجامدەرانە بە جیهانی دەورمانەوە مەرجە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بتوانێت پەیوەندییەکی تەواو خۆیی بە بوونەوە بینا بکات، بەکورتی بتوانێت ئەکزیستێنسی خۆیی بەرێوە ببات. ئاخر لە مامەڵەکردنی پلانرێژدا کە لەنێو ژیانی خۆدا رەچاوی شتگەل و مرۆڤان دەکات، رەهەندێکی نوێ دێتە نێوانەوە کە خۆی لە چەقی بەشی دووەمی کتێبەکەدا دەبینێتەوە: کات. زۆرگە

هەمیشـــە توخمێکی یادهێنەرەوە و توخمێکی بەرەوپێشـــڕەوانەرانەی لەخۆ گرتووە، واتا لە زۆرگەدا پەیوەندییـــەک هەیە بە رابوردوو و ئاییندەوە. دانانی لێرەبوونی مرۆڤ وەک لێرەبوونی کاتەکی، ئەو شـــرۆڤەیەی دازاین بە شـــێوەیەکی نوێ دیاردەهێنێت، کە هایدێگەر لە بەشـــی یەکەمی کتێبەکەدا ئەنجامی داوە. ئێســـتا مەســـەلەکە روو لەوە دەکات کە داخۆ چۆن، لە ئاسۆی (هۆریزۆنتی) کاتدا، مـــرۆڤ لە پەیوەندییەکانی رۆژانەوە کە ئەو خۆی تێیاندا دەبینێتەوە، لە لەنێو-جیهان-بوونەوە، بە ژیانێکی خۆچارەنووسساز بگات.

ئـــەم خۆبەدیهێنانەی مرۆڤ کە لەلای هایدێگەر واتای بەدیهێنانی «خۆیەتی»، بەدیهێنانی خود (Selbst) یان «ئەکزیستێنس» دەگەیەنێت، نەک تەنها وەرچەرخانێکە لە نادیاری (ئانۆنیومێتی)، لە رواڵەتێتی و کۆنڤەنســـیۆنەکان، بەڵکو بەتایبەتی هەروەها خودبەدیهێنانێکە کە پێکەوە لەتەک بەئاگابوونـــی دوایەکێتیی ژیاندا، لەتـــەک بەئاگابوونێکی هەردەم لەگۆڕێدابووی کاتدا، رەت دەبێت. «بوون و کات» رێگەی رووەو ئەم بەئاگابوونە دەگرێتە بەر. ئەم رێگەیە بەسەر دۆخی هەستەکیی (Stimmung) ترســـدا، بەسەر قبووڵکردنی مەرگدا وەک ئاســـۆی ژیان، بەسەر «بانگی ویژدان»دا، رەت دەبێت و هەتا ئەو قەنائەتە بڕەکات کە مرۆڤ بە یاریدەی دەســـت بە ئەکزیستێنســـی خۆی دەکات.

کـــە مرۆڤ ئازادە بۆ ئەوەی ژیانی خۆی بفۆرمێنێت، هەروەها کە «بەرەڵابوون» دوایەمین قەرار نییە، بەڵکو مەردوم هەروەها دەتوانێت ئاگامەندانە مەرج و پەیوەندیی دیاریکراو بفۆرمێنێت، ئەمە ئـــەو حاڵەتەیە کە پێش هەمـــوو زانینێکی ئاوەزمەندانە لە دۆخی هەســـتەکەیدا دەردەکەوێت، ئەم دۆخانەش بۆ هایدێگەر وەک هەستەوەر وان و ئێمە بەرپێیانەوە پەیوەندی لەتەک جیهاندا دەبەستین، لێرەشدا ترس کە دۆخێکی هەستەکیی بناغەییە، رۆڵێکی تایبەتی دەگێڕێت.

کیرکەگۆرد راڤەی ترســـی کردبوو وەک هەستێکی دیارینەکراو کە بۆ مرۆڤ گوناهبارییەکەی ئەو خۆی، بەمەش ئازادی و بەرپرســـیارێتییەکەی بەرانبەر بە خودا، ئاشـــکرا دەکات. ترس (Angst) لە لای هایدێگەریش، بە پێچەوانەی سڵەمینەوە (Furcht)، دۆخێکی هەستەکیی دیارینەکراوە کە روو ناکاتە رووداوێکی یان بابەتێکی تایبەتی، بەڵکو ترسە لە نادیاریی (ئانۆنیومێتیی) ژیانێکی کراوەی دامەزرێنراو لە لایەن خودی خۆوە. ئیدی هەموو شـــتە ئاســـاییی و وەک راســـتی وەرگیراوەکانی ژیان لەق ببن، هیچ (نەبوون) دەئەنگوتێت و بەمەش هەروەها شـــیمانە بۆ ئەوە دێتە گۆڕێ کە بۆشاییە ســـەرهەڵداوەکە پڕبکرێتەوە، واتا شـــیمانە بۆ ئیختیارکردنی ئەکزیستێنســـی خۆ سەرهەڵدەدات. هایدێگەر دەنووسێت: ترس «ئازادبوون بۆ ئازادیی خودی-خۆ-ئیختیارکردن» ئاشکرا دەکات.

ئەم بێداربوونەوەیـــەی مرۆڤ لە بەئاگابوونی ئازادی پێکەوە لەتەک دەرککردندا بە بمرێتیی خۆ روو دەدات. لەژێر ســـەروەریی مەردومدا مەرگ لە ژیان دادەبڕێت و دەچەپێنرێت. کاتێک هایدێگەر دەبێژێـــت کە ژیان «رەوتبەســـتن»ێکە رووەو مەرگ، ئەوا ئەو بەم دەربڕینە تەنها مەبەســـتی لەو هەقیقەتە ســـادەیە نییە کە مەرگ خۆی لە کۆتایی ژیانماندا دەبینێتەوە. کات لەلای هایدێگەر راوم (فەزا) نییە و ئێمە بەنێویدا رەتببین، بەڵکو لەنێو ئێمەدایە. کات وەک دەزوولەیەکی سوور بەنێو

خۆتێگەیشتنماندا، بەنێو «لێڕوانین(مان)دا» بۆ ژیان، رایەڵ بووە. کات ئەوەیە کە لەلایەن مرۆڤەوە ئەنجام دەدرێت.

هایدێگەر بۆ ئەوەی کات وەک رووداو و ئەنجامدان پیشان بدات، گۆڕان بە وشەی «کاتاندن» (zeitigen) دەدات. بەوەدا کە ئێمە لە بمرێتیی خۆمان بەئاگادێین، ئەوا لەم هەقیقەتەوە کاتیش ئاگامەندانە دەهێنینە نێو تێگەیشتنمانەوە بۆ ژیان. ژیانی مرۆڤ، واتا لێرەبوون، لەو مەغزایەدا بریتییە لە «بوون رووەو مەرگ»، کە بە ماریفەتی سنوورەکانی هەروەها هێزی ژیان و پێویستی بۆ پرۆژەیەکی ژیانی خۆ پەرەدەسێنن.

مرۆڤ لەسەر رەوتێکی هێواش لەم پێویستییە بەئاگانایەت، بەڵکو لە بانگەوازێکدا، لە داواکارییەکدا بەئاگادێت، کە، هەروەک بڵێین، مرۆڤ بەرەو رووی خودی خۆی دەکاتەوە. هایدێگەر لێرەدا تێگەی وەک «ویژدان» و «گوناه / خەتا» بەکاردەهێنێت، بەڵام واتا ترادیسیۆنییە مۆرالی و ئاینییەکەیان لێدادەکەنێت. «بانگی ویژدان» بۆ هایدێگەر بێداربوونەوەیە لە شێوازی کۆنڤەنسیۆنیانەی ژیانی مەردوم (مان). مەبەستی ئەو لە «گوناه / خەتا» بەئاگابوونە سەبارەت بەوە کە مرۆڤ دەبێت خۆی بکات بە شتێک، بەئاگابوونە لەوە کە مرۆڤ شتێک «قەرزبار»ی شیمانەکانی ئەکزیستێنسی خۆیەتی.

مرۆڤ بۆ نێو لێرەبوون فڕێدراوە. بانگی ویژدان کە «گوناهباری»یەکەی ئەو دەهێنێتەوە یادی ئەو خۆی، وای لێدەکات کە پاسیڤ نەمێنێتەوە، بەڵکو بە پرۆژەیەکی خودی خۆی وەڵامی تەحەداکانی لێرەبوون بداتەوە، بەکورتی لێرەبوون بکات بە ئەکزیستێنس. لەنێو قبووڵکردنی ئەم تەحەدایەدا «ویستی ئیختیار» هەیە، ئەمەش لە زمانە تایبەتمەندەکەی هایدێگەردا بریتییە لە: «ویستی ئیختیار بەواتای: دەرفەت بدرێت کە خۆ بۆ خۆییترین گوناهباربوون بانگ بکرێت».
مرۆڤ دەبێت لە روانگەی هایدێگەر تەسلیم ببێت: ئەو تەنها کاتێک پەیوەندییەک بە بوونەوە دادەمەزرێنێت یان ئەکزیستێنسی خۆی بەڕێوە دەبات، گەر ئەو لەنێو بەئاگابوونی کاتدا بژی، گەر ئەو لەنێو بەئاگابوونی رابوردووی خۆیدا، لەنێو گرتنی هەنووکە و لەنێو دیدی ئاراستەگرتوو رووەو شیمانەکانی خۆی لە ئاییندەدا، بژی. کێ خۆی بخاتە ژێر رکێفی دیکاتۆریی مەردومەوە، ئەو یەکە رابوردووی خۆی بیردەچێتەوە و خۆی لەنێو ئەنجامدانەکانی (Besorgungen) رۆژانەدا بزر دەکات.

زۆر کەس بەوە ساکان کە «بوون و کات» هیچ وەڵامێکی پرسیارەکە سەبارەت بەوە ناداتەوە کە داخۆ مەردوم لە پرۆژەی ژیانی خۆیدا بڕیار بۆ چی بدات، کە داخۆ ئەکزیستێنس، داخۆ لێرەبوونی خۆچارەنووسساز، لە کرۆکەوە چۆن بنوێنێت. بەڵام پەیامی کتێبەکە لە بنەڕەتدا ئەمەیە: ئەوە گرنگ نییە کە تۆ بڕیار بۆ چی دەدەیت، بەڵکو ئەوە گرنگە کە تۆ گەرەکە بەرەنگاری تەحەداکانی ژیان ببیتەوە و پرۆژەیەکی خۆیی ژیان هەڵببژێریت، پرۆژەیەک کە نەچەقێت لەنێو مەردومدا، لەنێو کۆنڤەنسیۆن و بێواتاییدا. «بوون و کات» بانگەوازە بۆ هەڵوێستێکی ژیان، بۆ بڕیاردان و هەڵبژاردنێک. بەڵام ئەوە بۆ خودی تاکەکەس جێهێڵراوە کە داخۆ بڕیاردانەکەی چۆن بێت.

لایەنی کەم بەو تێزە کە دەڵێت پەیوەندیی دازاین بە بوونەوە هەمیشــە بەرێی کاتەوە شــەقڵی پێدراوە، روون دەبێتەوە کە هایدێگەر لە چ شێوازێکی نوێدا لە تێگەی «بوون» تێدەگات. بوونێکی یان ژیانێکی ئەزەلیی نەگۆڕ کە ئاڕاستەیەکی رووەو پێورێکی نەگۆڕی سەربەخۆ لە کات وەرگرتبێت، چیــدی لەلای هایدێگەر نەماوە. «بوون» و «کات» خۆیــان لەنێو پەیوەندییەکی چڕدا دەبیننەوە. بەڵام خوێنەر ئەو ئەزموونە ناکات کە داخۆ چۆن ئەم پەیوەندییە بەپوختی شــیاوی رونکردنەوەیە. کتێبەکەی هایدێگەر بە پرسیار تەواو دەبێت، پرسیاری وەک: «ئایا رێگەیەک لە کاتی سەرچاوەییەوە رووەو مەغزای بوون هەیە؟ ئایا کات خۆیشی وەک ئاسۆی (هۆریزۆنتی) بوون دەردەکەوێت؟»

بــەڵام لەبــەر ئەوەی هایدێگــەر وەڵامی ئەم پرســیارانە ناداتەوە، ئەوا «بــوون و کات» نابێت بەو «ئۆنتۆلۆژییە بناغەی»یە کە هایدێگــەر لە رێبەریی کتێبەکەیدا رایگەیاندووە، بە پێچەوانەوە ئیشەکە لەبریی ئەمە تیۆرییەکی مرۆڤ و پەیوەندییەکەی ئەو بە جیهانەوە لە خۆ دەگرێت، لەنێو چەقی ئەم تیۆرییەشدا شیمانەکانی خۆچارەنووسی تاکی و خودبەدیهێنان خۆیان دەبیننەوە.

نووســینەکە ئەپریلــی ١٩٢٧ وەک بەندی هەشــتەمی «ســاڵنامەی فەلســەفە و توێژینەوەی فێنۆمێنۆلۆژیانە» کە لە لایەن هوســەرل دەردەچوو، بڵاوبۆوە و لەسەری نووسرا بوو: «پێشکەشە بە ئێدموند هوسەرل، بە رێز و دۆستایەتییەوە». بەڵام ئەم نووسینە بوو بە یەکێک لە بەناوبانگترین فراگمێنتەکانی مێژووی فەلسەفە. هایدێگەر بەم ئیشە رێی خۆش کرد بۆ کاریەرێکی (تەرقیەیەکی) ئەکادیمــی، بەڵام ئەو بەم ئیشــە هەروەها بۆ یەکەم جار لە نێوەندێکی گشــتیی فراواندا ناســرا. بڵاوبوونەوەی کتێبەکە ناوبانگی ئەوی وەک یەکێک لە فەیلەسوفە بەواتاکانی سەردەمەکەی چەسپاند، بێگومــان ناوبانگێــک کە ئەو خۆی زیانی پێگەیاند، ئەویش بەوە کە ئەو ســاڵی ١٩٣٣ پەیوەندیی کرد بە نازیەکانەوە، هەروەها ئەو پێشکەشکردنەشــی لەسەر کتێبەکە سڕییەوە کە لە یەکەم چاپدا ئاڕاستەی ئێدموند هوسەرلی رەچەڵەک جوولەکەی کردبوو.

«بوون و کات» بوو بە یەکێک لە کاریگەرترین ئیشــەکانی فەلســەفەی سەدەی بیستەم، ئەم ئیشــە، وەک بڕوانامەی دامەزرێنەری فەلسەفەی ئەکزیستێنس، بەتایبەتی لە ئەڵمانیا و فەڕەنسا هەرەســێکی هێنایە گۆڕێ. ئیشە سەرەکییەکەی ژۆن-پۆل سارتر بەناونیشانی «بوون و نەبوون» یەکەم ئیشێکی پڕواتا بوو کە لە پرسیار و تێمەکانیدا راستەوخۆ پابەند بوو بە «بوون و کات»ـەوە. بەڵام هەروەها نوێدامەزراندنەوەی هێرمینیۆتیکی فەلسەفی لەلایەن هانز-گیۆرگ گادامەر لەسەر ئەم ئیشە سەرەکییەی سەرەتای هایدێگەر بنیات نراوە.

لە ئایندەدا تێمی ئەکزیستێنســی مرۆڤ لەلای هایدێگەر پاشەکشــەی کرد، ئەمەش لە پێناوی بەرژەوەندیی هەوڵێکدا: نوێدیاریکردنەوەی تێگەی «بوون». هایدێگەر وەک رەخنەگر لە مێتافیزیکێکی ئاڕاستەگرتوو رووەو ئاوەز و هۆش، بوو بە یەکێک لە باوکانی فەلسەفیی پۆستمۆدێرنە.

بەڵام «بوون و کات» ســەرباری ئەوە هێشتا هەر پرۆژەیەکی مەزنی هایدێگەر مایەوە، کتێبێک کە (وەک زۆر دەگمەنە ئیشــی دیکەی فەلســەفی) شــرۆڤەگەلی ئاڵۆز گرێ دەدات بە کارەکتەری بانگەوازێکی کەســییانە ئاڕاستەدراوەوە رووەو هەموو مرۆڤێک. ئەوە بێدارکردنەوەیەکی فەلسەفییە،

ئەوە داواکارییە بۆ دابەزین لەوە کە ئاستەنگە لەبەردەم ژیانێکی هەڵبژێرراودا لەلایەن خودی خۆمانەوە.

## گلۆسار

(تێبینی: لەپاڵ دیاریکردنی واتای هەندێک واژەدا، ئەم روونکردنەوانەی خوارەوە لە گلۆسارردا ئەنجامدراون کە وەک پێویستییەک بۆ چاکتر تێگەیشتن لە فەرهەنگی هزری هایدێگەرەوە وەرگیراون و تێیاندا ژمارەی پەرەگراف و لاپەڕە لە کەوانەدا دیاریکراون. بەڵام دەبێت سەرباری ئەمە بیدرکێنین کە هەندێکی واژەکان، بەتایبەتی ئەکزیستێنسیالەکانی «ئەنجامدان» و «بەرەڵابوون» بەکاتی دامانناون، کە بێگومان دەشێت لە کۆتاییدا بۆمان بچەسپێن، بەڵام ئەمە بەڕاستی ئێستا جەخت نییە — ک. ج.)

**ئەکزیستێنسیال**: هایدێگەر تێگەکانی ناودەنێت ئەکزیستێنسیال.

ئەنجامدان: (besorgen) بێزۆرگن برتییە لە «جۆری بوونی کردن و وازلێهێنان. واتای «بێزۆرگن» پێشزانستیانە، ئۆنتیانە (هەبوویيانە — و)، بریتییە لە ئەنجامدان، بەجێگەیاندن، تەواوکردن (erledigen)، بۆ خۆ هێنانی شتێک، بەڵام هەروەها: سەڵەمینەوە لە شتێک. «بێزۆرگن» ئۆنتۆلۆژییانە بریتییە لە ئەکزیستێنسیالێک: بوونی لەنێو-جیهان-بوونێک ی شیاو» (§ ١٢ , S. ٥٦-٥٧). ئەنجامدان / گرنگیپێدان / بێزۆرگن (besorgen): بوون-لەلا ی زۆرگە بریتییە لە بەردەستی (§ ٤١ , S. ١٩٣).

**بەرەڵابوون**: (فێرفالن / Verfallen). وشەی فێرفالن بەگوێرەی فەرهەنگ واتای داڕزین، بۆگەنکردن، دەگەیەنێت، هەروەها دەشێت تیۆلۆژییانە دیارییبکرێت وەک ژێرپەڕینی مرۆڤ بەهۆی گوناهە رەچەڵەکییەکەیەوە کە لە بەهەشتی خودایەتی ئەنجامی داوە. بەڵام ئەم وشەیە لە لای هایدێگەر بریتییە لە ئەکزیستێنسیالێک: «بەرەڵابوون بریتییە لە جۆرێکی ئەکزیستێنسیالانەی لەنێو-جیهان-بوون» ((§ ٣٨ , S. ١٧٦). بریتییە لە جۆرە بناغەییەکەی بوونی رۆژانە: «لێرەبوون سەرەتا و بەزۆریی لە لای «جیهان»ی ئەنجامدەرە / مشوورخۆرە، ئەمەش بەزۆری وەک بزربوون بۆ نێو نێوەندی گشتیی مەردوم، کەواتە وەک لەتەکیەکبوونێکی بەڕێوەبراو بەڕێی چەقەچەق و فزوولیەت و دووواتاییەوە» (§ ٣٨ , S. ١٧٥). بەرەڵابوون بریتییە لە ناخۆیەتیی دازاین (§ ٣٨ , S. ١٧٦). بەرەڵابوویی دازاین بریتی نییە لە «ژێرپەڕین» لە «دۆخێکی هەرە سەرەتایی» باڵاترەوە. دازاین لە خودی خۆی جیابۆتەوە و بۆ جیهان کە سەر بە بوونی ئەو خۆیەتی، بەرەڵابووە. بەرەڵابوون دیاریکردنێکی ئەکزیستێنسیالانەی دازاینە نەک بریتی بێت لە کارەکتەرێکی ئۆنتیانەی شایانی داخبۆخواردن کە گەرەکی یان شیاوی نەهێشتن بێت (§ ٣٨ , S. ١٧٦). بەڵابوون ئەکزیستێنسیالانە نەک تەنها لەنێو-جیهان-بوون دیاری دەکات، بەڵکو هەروەها فرێدراویش (§ ٣٨ , S. ١٧٩). بەرەڵابوون بۆیە دەشێت، چونکە کێشەی دازاین بریتییە لە لەنێو-جیهان-بوون ـەکەی خودی خۆی. کەواتە بەرەڵابوون ئەکزیستێنسی دازاین دەڕاستێنێت نەک دژبێژیی بکات. بەرەڵابوون ناشێت ئۆنتیانە روونبکرێتەوە (بۆ نموونە وەک «شەوەڕوانینی» دازاین، وەک «بۆگەنبوونی سروشتی مرۆڤ»، وەک «خنکاو لەنێو گوناهدا» و هتد). (§ ٣٨ , S. ١٧٩-١٨٠). بەرەڵابوون هەڵاتنێکی دازاینە لە خودی خۆی (...). «بزواویی» بەرەڵابوون بەربوونەوەیە. دازاین بەردەبێتەوە

بـــۆ نێو قووڵایی و هیچێتیی ڕۆژانەی ناخۆیـــی (§ ٣٨ , S . ١٧٨). بەربوونەوە كارەكتەری گێژاوی (Wirbel) هەیە. (§ ٣٨ , S . ١٧٨)

**زۆرگـــە**: (Sorge) بریتییـــە لە بوونی دازاین (§ ٣٩ , S . ١٨٢). نـــەك ئۆنتیانە (هەبووییانە) وەك خەم، وەك بێخەمی. زۆرگە بریتییە لە: خۆ-هەر-پێشـــتر-هەبێت-لە (نێو-جیهانـــدا) وەك بوون-لەلا (ی بوونەوەری نێوجیهانیانە پێگەیەردا. (§ ٤١ , S . ١٩٢).

**زەمێســـتەر**: سیســـتەمی فێربوونی زانكۆیی لە ئەڵمانیا ســـاڵانە نییـــە، بەڵكو زەمێســـتەرییە، كەواتە كۆرسییە.

**سیمپاتی**: سۆزێكی پۆزەتیڤ

**فراگمێنت**: كەرتە ئیش، ئیشێكی / لێكۆڵینەوەیەكی تەواونەكراو

**فزوولیەت**: (نۆیگییر / Neugier) واژەی فزوولیەت تا رادەیەكی لەبار مەبەستەكەی هایدێگەر دەداتەوە، بەڵام هێشتا هەر پێویستە روونبكرێتەوە، چونكە تێیدا ئەو حەزە / خواستە / ئەزرەتمەندییە (Gier) بۆ نوێ (Neu) بە تەواوی دەرناكەوێت كە هایدێگەر دەیەوێت هەڵیبداتەوە. لە كوردیدا واژەی نوێخوازی واتای شـــێوازە هەڵوێســـتێكی ناترادیســـیۆنی دەگەیەنێت كە كراوەیە بۆ هەر نوێیەك، بەڵام لـــە بنەڕەتدا ئەم واژەیە پوختتر مەبەستەكەی هایدێگەر دەداتەوە: خوازیاری یان ئەودالبوونی هەواڵ و دەركەوتەی نوێ.

**كۆنفیكت**: خۆیی یان نیشتەجێگەی فێرخوازانی تیۆلۆژیی كاتۆلیكی

**مشووربۆ**: (فیورزۆرگە / Fürsorge) مشووربۆ بریتییە لە ئەكزیستێنسیالێك، بریتییە لە مامەڵەكردن لەتەك هاولێرەبووە نێوجیهانییەكاندا. (مشووربۆ) بریتییە لە فێنۆمێنە تەرییەكەی ئەنجامدان (بێزۆرگن) كە (ئەمیش — و) بریتییە لە مامەڵەكردن لەتەك بوونەوەری نێوجیهانیدا (§ ٢٦ , S . ١٢١). مشووربۆ زۆرگەیەكە كە بوون-لەلا كەی بریتییە لە هاولێرەبوونێكی ئەوانیدی (§ ٤١ , S . ١٩٣).

**ئوربانی**: رەفتاری شاری، كراوە بۆ جیهان

**هێرمینیۆتیك**: فەلسەفەی تێگەیشتن

**ئینتوئیتیڤ**: (ئینتوئیسیۆن واتا حەدەس)، روانینێكی روون و ئاشكرای كرۆكێك یان حاڵەتێك.

## سەرچاوە:

Robert Zimmer: Das Philosophenportal. Ein Schlüssel zu klassischen Werken. München 2004

## ئامانجی رۆشنگەری:

# ناسینی زانستی مرۆڤ

ری پۆرتەر
لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

هەوڵی سەرەکی حەکیمەکانی سەردەمی رۆشنگەری بریتی بوو لە دەستگەیشتن بە «مرۆڤناسی زانستی». بیریارانی جیاواز لەبارەی ئەوەی چ شتێک ئەبێت لەناو ئەم زانستەدا جێی بێتەوە، بیروبۆچونی جیاوازیان ئەخستە روو. لامتریە و ماتریالیستەکانی تر (کەسانێک کە بوونی سەربەخۆی «زیهن»، «دەرون» و «رۆحیان» رەد ئەکردەوە) هیواداربوون کە بتوانن فیزیۆلۆژیای زانستی-پزیشکی مرۆڤ بەجۆرێک پەرەپێبدەن کە بتوانن مرۆڤ وەک مەکینەیەکی ئاڵۆزو ورد، یان رەنگە وەک سەرکەوتوترین «primate»پێناسی بکەن. هەندێکیان وەک هلوتیوس بڕوایان وابوو کە پێش هەموو شتێک میکانیزمی رەوتی فکری مرۆڤ ئەبێت بکەوێتە ژێر لێکۆڵینەوەوە. ئەوانی تر وەک ڤیکۆی ئیتاڵی بڕوایان وابوو کە باشترین شێوەی ناسینی مرۆڤ ئەوەیە بەداوی قۆناغەکانی پێشکەوتنی مرۆڤدا لەکاتی پەیدابونیەوە لە هەلومەرجی سەرەتاییدا یان لە دۆخی سروشتیدا بچین (قۆناغێک کە هەندێک بە قۆناغی زێڕینو هەندێک بە قۆناغی دڕندەیی ئاژەڵیان ئەزانی). هەندێکی دی بڕوایان وابوو کە شیکردنەوەی ئەو یاسا سیاسی و ئابوریانەی بەسەر کاردانەوەی دولایەنەی نێوان تاک و کۆی کۆمەڵگادا باڵادەستە، دەستگەیشتن بە کۆمەڵناسی زانستی مومکین ئەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا بیریارانێکی جیاواز لە ناسینی مرۆڤدا جەختیان لەسەر خاڵی جیاواز ئەکرد، بەڵام زوربەیان بە وتەی ئەلکسەندەر پاپ لەو خاڵەدا هاوڕابوون کە «شێوەی راستی لێکۆڵینەوەی مرۆڤایەتی، لێکۆڵینەوەی خودی مرۆڤە». زۆرێک لە بیریارانی رۆشنگەری لەگەڵ ئەو بانگەشەیەی دیڤید هیومی فەیلەسوفی سکۆتلەندیدا هاودەنگبوون کە خۆی بە «نیوتنی زانستە ئەخلاقیەکان»

(یان بە زمانی ئەمڕۆ زانستە مرۆییو کۆمەڵایەتیەکان) ئەزانی. تێگەیشتن لەو خاڵەی بۆچی هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ناسینی زانستی مرۆڤ ئەوەندە جێی سەرنج و لەهەمانکاتدا ئاڵۆزو دولایەنە بوو، ڕێنماییمان ئەکات بۆ جەرگەی ڕوداوە فکریەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری. لەکاتی بڵاوبونەوەی بەرهەمە کلاسیکیەکەی یاکۆپ بۆرکهاردەوە «شارستانیەتی ڕێنسانس لە ئیتاڵیا» لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەو گریمانەیە بە شتێکی بەدیهی ئەزانرا کە شانازی دۆزینەوەی «مرۆڤ» (بە جیاواز لە عارفی مەسیحی)، و بەتایبەتی دۆزینەوەی تیورەی «تاکانەیی» (فەردیەت)ی مرۆڤ، بەر ئیتاڵیای مۆدێرن ئەکەوێت. ڕاستیەک لەم قسەیەدا هەیە، بەڵام مرۆڤباوەڕی (Humanism) سەردەمی رینسانس بە هیمەتی خەڵکانێکی بێباکی وەک مۆنتان لە فەڕەنسای سەدەی شانزەهەم، کە پرسیاری گومانکارانەی «چی ئەزانم»ی هێنایە ئارا، توانی بە دەرونگەری (Introspection) وردبینانەی هەلومەرجی مرۆیی مرۆڤ کۆتایی بێت. هاملێتی شکسپیر لەو بیرەدا ڕۆئەچێت «کە مرۆڤ چ جۆرە بونەوەرێکە».

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو «مرۆڤە»ی ڕێنسانس دۆزیەوە، بەگشتی سیمایەکی تەقلیدی هەبوو، ئەو هێشتا هەمان ئەو بونەوەرە کامڵو بێ کەموکوڕیە بوو کە خوای مەسیحیەت لە سەرەتای جیهاندا (پێش هاتنە خوارەوە) لەسەر شێوەی خۆی دروستی کردبوو. بەم مانایە فەلسەفەی مرۆڤباوەڕانەی ڕێنسانس بەهەمان ئەندازەی لوتەریزم یان هەر ئاراستەیەکی تری مەسیحی، بڕوای بە مەسیحیەت هەبوو. مرۆڤی ڕێنسانس کە بەهۆی وێنەکێشانەوە بەشێوەیەکی پڕ شکۆ «وەک مرۆڤێکی پتەوو جوانو ڕوت» یان وەک «مرۆڤی ئایدیالی (ڤیترڤیانی)(Vitruvian man) لەسەر شێوەی یاسا ئەندازەییەکان وێنە ئەکرا، هێشتا ئەتوانرا وەک جیهانێکی بچوک کە هاوشێوەی جیهانی گەورەیە دابنرێت (جیهانی بچوکی مرۆڤ وەک ڕەمزی جیهانی گەورەی دنیا). لەڕاستیدا سەرجەم بیریارانی سەدەی حەڤدەهەم جگە لە کۆپرنیکۆس هێشتا بڕوایان وابوو کە مرۆڤ سەنتەری بوون (Homocentric) و زەوی سەنتەری جیهانە (Geocentric). ئەم باوەڕە کە مرۆڤ نمونەی سیستەمی جیهانیە کە خودا دروستیکردووە، سەرەتا بەهۆی زانایانی یۆنانی دێرینەوە هێنرایە ئاراوە. هەر لەبەرئەمەش زوربەی حەکیمانی سەردەمی رینسانس بەشێوەیەکی بڕاوە بەدوای مێژووی مرۆڤدا شەجەرەنامەی مرۆڤیان بەشێوەیەکی پێکەوە بەستراو تا نوحو دواجار ئادەم ئەگەیاند. بەمشێوەیە مرۆڤ جێگەی نەگۆڕی خۆی کە بەهۆی ئیرادەی ئیلاهیەوە دیاریکرابوو، هەروا لە زەمەنو شوێندا ئەپاراست.

لەڕاستیدا کاتێک بیریارانی ڕێنسانس ستایشی هەر شتێکی یۆنانی و ڕۆمیان ئەکرد، باوەڕدارانی کەنیسەی ئەنجیلیان زویر ئەکرد کە بەردەوام ئاموژگاری ئەوەیان ئەکرد کە مەسیح بۆ لێبوردنی گوناهەکانی مرۆڤو بۆ ڕزگار بوونی لە کفر و گومڕاهی کوژراوە. بەڵام کاریگەری بەربڵاوی «ئەنتیکۆمانیا»ی (Anticomania) رینسانس ئەگەڕایەوە بۆ ئەوەی بیریارانی ئەم قۆناغە توانیان ڕوانگەیەکی پتەوو هاوئاهەنگ بۆ سروشتو چارەنوسی مرۆڤ سەقامگیر بکەن. فەیلەسوفانی ئەخلاق لە سەردەمی ڕێنسانسدا بڕوایان وابوو کە نمونەگەلێکی فەزیلەتو مەعنەویەتێک هەیە کە ئەکرێت

لای شاعیرانی کلاسیک، فەیلەسوفان، ئەخلاقباوەڕان، مێژوونوسانو دەوڵەتدارانو- بەر لەهەموویان لای سنکا، سیسرۆ، لیڤۆیوس بدۆزینەوە. بەپێی بڕوای ئەمانە مرۆڤی بەڕاستی حەکیم ئەتوانێت پەیڕەوی ئەم نمونە مەعنەویانە بکات، بێ هیچ جۆرە ناکۆکیەک لەگەڵ ڕێبازی مەعنەویەت و ڕزگاری لە مەسیحیەتدا و بە هاوئاهەنگی تەواو لەگەڵ ئەم ڕێبازەدا.

بەم پێیە بەپێی تێگەیشتنی بیریارانی ڕێنسانس هیواو چاوەڕوانیەکانی مرۆڤ لەسەر دوو بناغەی جیاواز و لەهەمانکاتدا تەواوکەری یەکتر دامەزراوە. ڕێنسانس جارێکی دی ڕەواجی بە زانینی کلاسیکی داو لەم ڕێگەیەشەوە شێوازەکانی ئەم دنیاییەی ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیان دۆزیەوە. بەڵام لەهەمانکاتدا هەر ئەم ئامانجە ڕەسەنانەی کلاسیکیان تێکەڵ بە ڕاستیە زوڵاڵەکانی مەسیحیەت کرد، بەو شێوەیەی کە لەکتێبی پیرۆزدا هاتووەو کەنیسەش سەلماندونی. بڕوابوون بەم ئامانجە دولایەنیە، واتە یەکێتی لەنێوان مرۆڤی باشو مەسیحی باش، زیاد لە سەدەیەک ڕەواجی لەناو ناوەندە فکریو فەلسەفیەکانی سەرتاسەری ئەوروپادا هەبوو.

بەڵام ئەم دوو ئامانجە هێواش هێواش لەیەک جیابونەوە. یەکێک لە هۆکارەکانی ئەم جیابونەوەیە جیاوازی توندی مەزهەبی و ناکۆکی نێوان زنجیرە جیاوازەکانی سەڵتەنەتی بوو، کە ئەوروپای لە سەرەتای بزوتنەوەی ریفۆرمی دینیەوە تا کەناری جەنگی سی ساڵە هێنایە لەرزە. دەرئەنجامی ناچاریانەی ئەم ڕوداوانە لەرزاندنی ئەو باوەڕە خۆشبینانەیەی ڕێنسانس بوو بەوەی کە مرۆڤ بونەوەرێکی پاکو بێگەردە، کە چارەنوسی بریتیە لە سەلماندنی بونی خۆی لەڕێگەی بەشداریکردن لە ژیانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگایەکی ئازادا. لەناو هەلومەرجێکی وادابوو کە تیورەی گاڵتەئامێز (سینیکاڵ) (cynical) و بەدبینیانەی مەکیاڤیلی لەبارەی مرۆڤەوە کاریگەری خۆی دەرخست. هۆکارێکی تر وەک پیتر بۆرک بە دروستی دەریخستووە، ئەوەبوو کەی بە پەرەسەندنی بەردەوامی هوشیاری مێژوویی، تێگەیشتنو تێڕوانینێکی تازە بۆ ڕابردوو شکڵی وەرگرت. دواجار ئەم تێڕوانینە پەردەی لەسەر جیاوازی بەرچاوی نێوان «دنیای کۆنی» یۆنانو ڕۆمی دێرینو «دنیای تازە» بە دەسەڵاتی دەوڵەتیو دیبلۆماسیەوە و بە تفەنگو دەزگای چاپیەوە لابرد. بەدەر لەمەش «دنیاکانی تر» بەتایبەتی ئەمەریکا کە بۆ یۆنانو ڕۆمی دێرین نەناسراو بوون، دۆزرانەوە. دۆزینەوەی ئەم ناوچانە بە دیمەنی نامۆو خەڵکە «کافرو دڕندەکەیەوە»، ئەو باوەڕە خۆپەسەندانەی ڕۆشنبیرانی ڕینسانسی لەرزاند کە فلۆرانسی بە ئەسینای تازەو ئیمپراتۆری پیرۆزی ڕۆمی بە میراتگری خودی ڕۆم ئەزانی.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو گۆڕانانەی بەدرێژای سەدەی حەڤدە لەئاستی بیروڕادا ڕویدا، چەندانجار خێراتر و وروژێنەرتر بوون لە گۆڕانە فکریەکانی سەدەی شانزە. «زانستە درەوشاوە تازە»کانی ئەستێرەناسی، گەردونناسیو فیزیا کە پێشڕەوانی کەسانی وەک کپلەر، گالیلۆ، دیکارتو پەیڕەوانیان بوون، تەبایی پێشووی جیهانی سەنتەریزمی مرۆڤی وێرانکرد (anthropocentric universe)، جیهانێکی داخراوو بچوک کە ناوەندی سەرنجی خودی مرۆڤ بوو. هەم زانستەکانی یۆنانی دێرینو هەم ئەنجیل ئەم باوەڕە کۆنەیان ئەسەلماند. ئەستیرەناسی کۆپەرنیکی کە بە هیمەتی

زنجیرەیەک زانای بەرجەستە لە کۆپەرنیکۆسەوە بیگرە تا نیوتن لەسەدەی شانزەدا هاوئاهەنگی وەرگرت، جێگەی زەوی لە سیستەمی بونو لە هەموو ئەمانە گرنگتر ناوەندی جیهان بوونی زەوی گۆڕی. لەم سیستەمەدا زەوی هەسارەیەکی بچوکو ناگرنگ بوو کە هیچ جێگەیەکی تایبەتی لە فەزایەکدا نەبوو، کە بێ سنور ئەهاتە بەرچاو (ئەستێرە بێ ئەژمارەکان هەنوکە بەهۆی تلسکۆبەوە پێشکەوتوە تازەکانەوە قابیلی بینین بوون). فەزایەک کە بێ کۆتایی و مەزنێتیەکەی باسکالیان ئەتۆقان.

«فەلسەفەی میکانیکی» تازە کە زانایانی «ئەتومباوەڕ» (atomistic) لایەنگری بوون. سروشتیان بەشتێکی زیاتر لە گەردیلەی تەن(مادە) نەئەزانی، کە کۆمەڵێک یاسای گەردونی بەسەریاندا زاڵبوو. بێگومان بەکارهێنانی هاوکێشە ماتماتیکیەکان بۆ رونکردنەوەی شێوەی کارکردنی ئەم یاسایانە، بە دەستکەوتێکی مەزن ئەژمێرا بۆ پێشخستنی لێکۆڵینەوەکانو چەمکسازی. بەڵام ئەم فەلسەفەیە هەنوکە هەموو شتێکی کە بەردەوام بە سروشتی گیاندار ناو ئەبرا، بە بێ گیان و نا شەخسی (impersonal) ئەزانی. سەرەڕای ئەمە دیکارتی فەیلەسوفو زانای فەرەنسی بڕوایوابوو هەموو بونەوەرە گیاندارەکان جگە لە مرۆڤ مەکینە یان مەکینەئاسان (automata) کە تەنانەت هوشیاریان نیە. هێنانە ئارای ئەم مەسەلەیەش شتێکی ناچارانە بوو، کە رەنگە مرۆڤ خۆی مەکینەیەکی تر بێت بەو جیاوازیەوە کە ئامادەی گرفتاربونە بە خۆپەسەندی و خۆهەڵخەڵاتاندن.

لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەدا جان دادنی شاعیری میتافیزیکی رایگەیاند کە «فەلسەفەی تازە هەموان ئەخاتە گومانەوە». لە هەمانکاتدا نابێت تەسەور بکەین کە دۆزینەوەکانی «زانستی تازە» هەموو بیریارانی نائومێد کردووە و خستونیەتە گومانەوە. بەڵام ئەو گۆڕانە بنەڕەتیانەی لە تیورەکانی سروشتدا رویدابوو، زۆرکەسی قەناعەتی پێکرد کە بیرورا جێگێرەکان لەبارەی مێژوو، سروشتو چارەنوسی مێژووی مرۆڤەوە، ئەبێ پیاچونەوەی بۆ بکرێت.

بابەتێکی تر لە نیوەی دوهەمی سەدەی حەڤدەدا هێنرایە ئاراوە، کە بەشێویەکی زۆری هێنایە ئاراوە. لە هەمان سەرەتای بزوتنەوەی ریفۆرمی دینیو بزوتنەوەی دژ بە ریفۆرمی دینی (Counter-Reformation) وتوێژێکی توند لەنێوان کەلام ناسانی پرۆتستانتو کاسۆلیک لەسەر تەفسیری ئنجیلو بناغە سەرەکیەکانی ئیمان رویدا. رەگەزی سەرەکی ئەم وتوێژانە ئەم بیرورا ناکۆکانە بوو، بەوردی چ کەسو چ شتێکو لە کوێ نوێنەرایەتی «کەنیسەی راستەقینە» ئەکات؟. سەرچاوەی دەسەڵاتو بایەخی چیە؟ ئایا یەک بە یەکی وشەکانی کتێبی پیرۆز قسەی خودایەو مانای راستەقینەی هەر وشەیەکیش هەمان مانای زمانەوانیەتی؟ و شتی تر.

لەمجۆرە وتوێژە توندو هەندێکجار تاڵو بریندارکەرە، بەشێوەیەکی ناچاریانە بناغەی بایەخی ئەخلاقی ئەهلی کەنیسەی لەبەردەم زیهنە ئازادو رەخنەگرەکاندا وێرانکرد، و توێژەرانی وردبینو راستگۆی وا لێکرد کە بە شێوازێکی نادینی خەریکی مەسەلە بنەڕەتیەکانی چارەنوسو مێژووی مرۆڤ بن. بە خوێندنەوەی وردتری ئنجیل، مەسەلەی لەمشێوەیە هێنرانە ئارا کە ئایا مومکینە لەکاتی پەیدابوونی جیهانەوە وەک لە ئنجیلدا هاتووە تەنها ٦٠٠٠ هەزار ساڵ تێپەڕی کردبێت؟ ئایا

بەڕاستی یەکەم مرۆڤ لەسەر زەویدا ئادەم بووە؟ ئایا بەڕاستی مارێک لەگەڵ ئادەمو حەوادا لە بەهەشت قسەی کردووەو حەوای هەڵخەڵەتاندووە؟ ئایا خوایەکی دادپەروەرو بە بەزەیی ئەتوانێت هەموو مرۆڤەکان جگە لە نوحو خێزانەکەی لە تۆفانندا لەناوببات؟ بەهەر شێوەیەک ئەو هەموو ئاوە بۆ دروستکردنی تۆفانی نوح لە کوێوە هاتووە؟ پاشان ئەو هەموو ئاوە چی لێهاتووە؟ ئایا تۆفانی نوح موعجیزە بووە؟ یان ئەوەی وەک هەموو «موعجیزەکانی» تری کتێبی پیرۆز ئەبێت بەیارمەتی یاسا سروشتیەکان کە زانستی مۆدێرن دۆزیبویانەوە روونبکرێتەوە؟ ئایا کاتی داگیرکردنی شاری ئەریحا، خۆر لەبەرخاتری یوشعی پێغەمبەر لە جوڵە وەستابوو؟ لەم بابەتە شتانە. هێندانە ئارای پرسیاری لەم چەشنە سەدان مەسەلەی مێژوویی، ئەخلاقیی، زانستییو کەلامناسی تازەی هێنایە پێشێ. مەسەلەگەلێک کە هیچ وەڵامێکی روونی پێشوەخت لە کتێبی پیرۆزدا بۆ نەئەدۆزرایەوە. ئەم مەسەلەیە چارەسەری مەسەلە ئیمانیو پراکتیکیەکانی بۆ مەسیحیەکان کێشەئامێزتر کرد. لەوێ بەدواوە دەسەڵاتو بایەخی بێ چەندوچونی مەزهەبی وەحی (revealed religion) لەرزاند. مرۆڤ دەبوو ئیتر رێگەیەکی ترو باشتر بۆ دەستگەیشتن بە زانینی واقعی هەڵبژێرێت.

پییر بابلی پرۆتستانتی فەرەنسی کە بە لادان لە ئاین بەناوبانگ بوو، لە سەردەمی لوی چواردەهەمدا پەنای بۆ هۆڵەندا برد، لەساڵی ١٦٩٧ دا کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناونیشانی «فەرهەنگی مێژووو رەخنە»(Dictionnnaire histotique et critique) کە تیایدا گرنگیەکی بەرجەستەی بە مەتەڵ و نارونیەکانی سەرەوە بەخشی. بابل هەروەها پوچی مناڵانەی نەریتە مەزهەبیەکانی کافرانی بەشێوەیەک هێنایە ئاراوە کە ئەکرا بە هێرشێکی ناڕاستەوخۆ بۆ خودی مەسیحیەت دابنرێت. توێژەرەوان لەو بارەیەوە بۆچونی جیاوازیان هەیە کە ئایا بابل لە دڵەوە «ئیمان باوەڕ» (fideist) واتە باوەڕدارێک بووە کە بڕوای وابووە ئەرکی مەسیحیەت حوکم ئەکات باوەڕبوون بە تێزەکانی کەنیسە وەک ئامرازێک بۆ سەرکەوتن بەسەر گومانی لۆژیکیدا ببینین، یان ئەوەی کە گومانکارێک (sceptic) بووە کە ئامانجی پیشاندانی پوچی بنەماکانی مەسیحیەت بووە؟ بەهەرحاڵ گومانی تیا نیە بابل لە شاردنەوەی ئامانجە راستەقینەکانیدا، لێزانیەکی تایبەتی هەبووە.

لەنێوەی سەدەی حەڤدەهەم بەدواوە زۆرێک لە بەرجەستەترین بیریارانی ئەوروپا بەو ئەنجامە گەیشتن کە بۆ تێگەیشتن لە مێژووو چارەنوسی واقعی مرۆڤ، ناکرێت نە پشت بە ئیمانی کوێرانە بە ئنجیل ببەسترێت، و نە چیدی دەکرێت ناهوشیارانە پشت بە بایەخی زانستو فەلسەفەی یۆنانو رۆم (کلتوری دێرین) ببەسترێت. لێرەوە ئەبێت ماهیەتی مرۆڤ کە هێشتا بەتەواوی نەناسراو بوو، لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت. «میتۆدی زانستی»شیان کە زانایانی زانستە سروشتیەکان (مۆدێرنیستەکان) بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە لە بوارەکانی ئەستێرەناسی، فیزیاو زیندەوەرزانیدا بەکاریان هێنابوو، بۆ ئەمجۆرە لێکۆڵینەوانە پێشنیار بکرێت.

گومانی سیستیماتیکانە (بە مانا دیکارتیەکەی) واتە تاقیکردنەوەو پشت بەستن بە ئەزمونی راستەوخۆ لەبری بایەخی لاوەکی و پشتبەستن بە رێکخستنو یاسای سروشت، رەوتێکە کە یاساکانی بوونی مرۆڤ وەک بونەوەرێکی هوشیار و کۆمەڵایەتی ئاشکرا ئەکات، بەگشتی بەهەمان شێوە

کە یاساکانی راکێشان جوڵەی هەسارەکان لە مەنزومەی خۆردا رونئەکاتەوە. ئەمجۆرە لێکچونانە لەگەڵ زانستە سروشتیەکاندا، هەمان ئەو شتە بوو کە هیوم کاتێک خۆی بە «نیوتنی زانستە مرۆییەکان» ناودەبرد، لەبەرچاوی بوو. «بیرورا کۆنەکان» کە بەهۆی مەسیحیەتو کلاسیکیەکانی پێش مەسیحیەتەوە دەربڕابوون، کۆمەڵێک کێشەیان بۆ زانایانی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی سەردەمی رۆشنگەری دروستکرد، لانیکەم لەو روەوە «مۆدێرنیزمەکان» لەو شتەی کە زۆرجار بە «ململانێی کتێبەکان» ناودەبرێت، پێش «دێرینەکان» کەوتبوون.(باسەکە لەسەر ئەوە بوو کە ئایا مۆدێرنیستەکان هیچ ئیمتیازێکیان بەسەر یۆنانیەکاندا هەیە یان نا).

بەمشێوەیە بڕوای فرانسیس بیکۆن بەوەی بەکارهێنانی میتۆدی زانستە سروشتیەکان ئەبێتە هۆی «پێشکەوتنی پەروەردە»، هیوای پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لە دڵی بیریارانی سەردەمی رۆشنگەریدا زیندووکردەوە. بەپێی بڕوای رۆشنگەران ئەمجۆرە زانینە تازە لەدایکبوانە، بونەتە هۆی زیادبوونی دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا، بەمشێوەیە بە زمانی خودی بیکۆن «کار لەسەر هەموو شتێک ئەکات». وەک ڤۆڵتێر لە «نامە فەلسەفیەکان»یدا (١٧٣٣) جەختی لێئەکات، دەستکەوتەکانی نیوتن بەڕاستی دەریئەخات کە زانستە مۆدێرنەکان، رەمزی پێشکەوتنی مرۆڤە. یان وەک ئەلکسەندەر پۆپ لەم دێڕەدا ئەیڵێت:

کەس نەیزانی ئەم گەردونە بەچ جۆرێک بوو

کاتێک خودا فەرمانی کرد « نیوتن ببە» جیهان هەمووی روت بووە

کاتێک کەنیسەی کاسۆلیکی رۆم تیورەی کۆپرنیکۆسی بە کفرئامێز لەقەڵەمدا و گالیلۆی بۆ دادگا راکێشا، تەنها ئەو راستیەی سەلماندووە کە هەقیقەت هەمیشە دوژمنانی خۆی هەبووە، بەڵام هەقیقەت خاوەن هێزێکی وا مەزنە کە دواجار سەرئەکەوێت.

پۆل هازاردی مێژوونوسی فەڕەنسی قۆناغی نائارامیو یاخیبونی کۆتاییەکانی سەدەی حەڤدەی، بە قۆناغی «قەیرانی» بیرکردنەوەی ئەوروپا ناونا. بیریارانی رۆشنگەری بڕوایان وابوو دەکرێت لەرێگەی تێگەیشتنی زانستی مرۆڤەوە بەپێی شێوازێکی سیستیماتیک، بەسەر ئەم «قەیرانە»دا زاڵ بن. پرۆژەی «مێژووی سروشتی مرۆڤ» لەبری «مێژووی پیرۆز» ی سەردەمی عەهدی دێرین، هەوڵێک بوو بەم ئاراستەیە. زۆرێک لە فەیلەسوفانی رۆشنگەری هەوڵیاندا بەشێوەیەکی ئەزمونی/ شهودی یا سیستیماتیک، دیدێکی مێژوویو مرۆڤناسیانە پەرەپێبدەن، کە بەپێی ئەوە ئەگەری بەدواداچونی رەوتی پەیدابونی مرۆڤی ئەوروپی لە قۆناغی «دڕندەیەوە» کە بە سەرچاوەی یەکەمی مرۆڤ دائەنرا ـ تا سەردەمی هەنوکە مومکین بکات. قۆناغی «دڕندەیەتی» هەلومەرجێکی «سەرەتایی»و هاوشێوەی هەلومەرجی خێڵە سەرەتاییەکان بوو کە گەڕیدەکان لە سەفەرنامەکانی خۆیاندا بۆ قولایی ئەفەریقا، ئەمەریکاو دواجار ئوستورالیا دۆزیبویانەوە.

بۆ ئەوەی تواناو لێهاتوی مرۆڤە سەرەتاییەکان بۆ پێشکەوتنی بەشێوەیەکی زانستی تاقیبکرێتەوە، هەندێکجار خەڵکە سەرەتاییەکانی ئەفەریقاو ئەمەریکایان بۆ پاریس یان لەندەن ئەهێنا، ئەیانخستنە

بەر تاقیکردنەوەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان. کاپیتان کۆک، «ئۆما»ی لە تاهیتیەوە کە تازە دۆزرابۆوە، لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەوروپا هێنا. تاقیکردنەوەی هاوشێوە لەسەر ئەو منداڵە «درندە» سەرگردانانە کرا کە لە جەنگەڵەکانی ئەوروپادا پەیدا بوو بون. باوەڕی فەیلەسوفانی سەردەمی رۆشنگەری بە «پێشکەوتن» ی دوایی، بە «کامڵبوون» ی ئەم دنیاییەی مرۆڤ، وەک هردەر، کۆندریسە و فەیلەسوفانی سکۆتلەندی وەک فرگسون، میلار دەریانبڕیوە، لەسەر ئەو گریمانەیە دامەزرابوو کە بەشێکی زۆری مرۆڤایەتی هەنوکە لە «بەربەریەتەوە» بەرەو «مەدەنیەت» یان وەک سکۆتلەندیەکان ئەیڵێن لە «خامیبونەوە» (rudeness) بۆ «حەکیمایەتی» (refinmen) تێپەڕیون.

دیارە هێنانەئارای گریمانەی لەمچەشنە سەبارەت بە تواناکانی مرۆڤ بۆ پێشکەوتن، بەبێ بڕوابون بە توانای شکڵوەرگرتنی بێ سنوری تواناکانی مرۆڤو بەبێ بڕوابوون بە توانای فێربوونو گۆڕانو چاکسازی رەگەزی مرۆڤ، قابیلی وێناکردن نەبوو. کەلامیەکانی بونیادگەری مەسیحی، هەم کاسۆلیک و هەم پرۆتستانیەکانیان بەشێوەیەکی تەقیلیدی مرۆڤیان بە گوناهبارێکی بێ دەرمانو میراتگری «گوناهی یەکەم» پێناس ئەکرد. بەپێی بڕوای ئەوان هەموو ئەو شتانەی خەڵکانی بێ ئیمان یان ئەو کەسانەی کەنیسە لێیان خۆش نەبوو بوو، ئەنجامیانئەدا، خۆبەخۆ خراپەو بەد بوو. فەیلەسوفانی بەدبینی یۆنانی کلاسیکیش بەشێوەیەکی هاوشێوە مرۆڤیان بە بونەوەرێک ئەزانی کە بەشێوەیەکی ناچاریانە لەناوخۆیدا بەردەوام لە جەنگدایە. ئەوان بڕوایان وابوو لێهاتوی و توانای شکۆمەندانەی عەقڵانی مرۆڤ، زۆر بەسادەیی لەبەردەم ئارەزووی ئاژاوەو شەهوانیەکانی مرۆڤدا شکست دێنێت. لێرەوە رواقەیەکان بڕوایان وابوو باڵاترین ئاستێک کە مرۆڤ ئەتوانێت بیگاتێ دورکەوتنەوەیە لە منی پەستر (دەرون تەنراوە بە خراپە).

سەیرکردنی فەیلەسوفانی رۆشنگەری بۆ ماهیەتی مرۆڤ، بەتەواوی دژی ئەو دیدەی سەرەوە بوو. ئەوان تیورەی «گوناهاویبون»ی خودی مرۆڤیان وەک تیورەیەکی نازانستیو بێ بناغە رەدئەکەنەوە. بەپێی بەڵگاندنەکانی رۆشنگەران ئارەزوەکانی وەک عەشق، شەهوەتو غرور و چاوچنۆکی بەناچار وێرانکارو خراپئاسا نین، ئەگەر لە رێگەیەکی گونجاودا دابنرێن، دەیانتوانی یارمەتی پێشکەوتنی مرۆڤ بدەن. لە فۆرمۆلە پارادۆکسیەکەی برنارد مەندوێلدا «رەزیلەتە فەردیەکان» (وەک چاوچنۆکیو خۆپەرستی) ئەتوانن بچنە خزمەت «بەرژەوەندیە گشتیەکانەوە» (بۆ نمونە لەرێگەی هاندانەوە بۆ مەسرەفی زیاتر، جوڵە بخەنە ئابوریەوە). زۆرێک لە بیریارانی رۆشنگەری وەک هلوتیوس لە فەرەنسا، بنتهامی پێشڕەوی «سودباوەڕان» (utilitarian) لە ئینگلتەرا، یارمەتی تێڕوانینی دەرونناسانەیان بۆ ماهیەتی مرۆڤ دا. ئەوان لەبەرامبەر تێڕوانینی ئەخلاق باوەڕانەی رابردوو کە مرۆڤیان بە بونەوەرێکی عەقڵانی ئەزانی کە بەردەوام لە رێگەی ئارەزووە نەفسیەکانیەوە هەڕەشەی لێئەکرێت، ئەو تیورە تازەیەیان هێنایە پێشێ کە مرۆڤ ئاژەڵێکە سروشت بەشێوەیەکی ناسک وا بەرنامەڕێژی کردووە کە بەردەوام بەدوای لەزەتا ئەگەڕێت و لە ئازار رائەکات. بەمشێوەیە بەپێی بڕوای ئەوان ئامانجی سەرەکی سیاسەتی رۆشنگەرانەی کۆمەڵایەتی ئەبێت هاندانی هوشیاری بێت بۆ بەرژەوەندی شەخسی و بەدیهاتنی «زۆرترین خۆشبەختی مومکین بۆ زۆرترین تاکی مومکین».

رۆحانیەکانو ئامۆژگاریکارە تەقلیدیەکان وروژاندنی ئارەزوویان بۆ «بنەمای گەڕان بەدوای لەزەتدا» وەک شتێکی گوناهئامێز، ئاژەڵیو کفرئامێز مەحوکم ئەکرد. بەپێچەوانەی ئەوانەوە نەوەی تازەی «ئابوریزانانی سیاسی» کە بەرجەستەترینیان ئادام سمیسی سکۆتلەندی بوو، تیورەیەکی تریان ئەهێنایە پێشێ. ئادام سمیس لە کتێبی «سامانی نەتەوەکان» (١٧٧٦) ئەڵێت کە رەفتاری خۆویستانەی بەرهەمهێنەران و مەسرەفکەران، ئەگەر بەپێی یاساکانی ململانێی بازاڕی ئازاد کاربکەن، بە قازانجی گشتی ئەبێت- دیارە تاڕادەیەک بەهۆی یارمەتی «دەستی نادیاری» ئیرادەی ئیلاهیەوە. بەهەمان شێوە کەسانی وەک بکاریای ئیتاڵیایی کە بەدوای چاکسازی یاساکانی دادوەریەوە بوون، ئەرگۆمێنتیان ئەهێنایەوە کە زانستی یاسا لەکاتێکدا ئەتوانێت بناغەیەکی زانستی هەبێت کە لەسەر بناغەی دەروونناسی خۆویستی لۆژیکی بینا بکرێت. واتە سەختیو دەردو سزادان ئەبێت بەشێوەیەکی ورد بەپێی ئەو بناغەیە دابڕێژرێت، کە بتوانێت ئەو لەزەتە پوچەڵ بکاتەوە کە لەرێگەی خراپەکاریەوە بەدەست دێت.

توانای گۆڕانو گرنگتر لەمەش توانای گونجان لەگەڵ هەلومەرجی تازەدا، پێشمەرجی ناچاریانەی پێشکەوتنو پەرەسەندنی مرۆڤە. لەبەرئەوە سەرسوڕهێنەر نیە کە دەروونناسانی سەردەمی رۆشنگەری هەموو سەرنجی خۆیان خستە سەر پرۆسەی فێربوون (Learning process) و ئومێدێکی زۆریان بە پەروەردە بەستبوو. زۆرێک لە بیریارانی ئەم سەردەمە لەژێر کاریگەری دوو بەرهەمی بنەڕەتی جۆن لۆک «وتارێک لەبارەی تێگەیشتنیمرۆڤەوە» (Esay Conncerning Human Understanding ١٦٩٠) و «هەندێک تێبینی دەربارەی پەروەردە» (ome Thoughts Concerning Education ١٦٩٣) بڕوایان وابوو مێژووی مرۆڤایەتی قابیلی بەراوردکردنە بە پرۆسەی فێربوونی منداڵ. پەیڕەوانی لۆک ئەو حوکمەی ئاموژگاریکارانی کەنیسەیان رەد ئەکردەوە کە مرۆڤ بە گوناهبار لەدایک ئەبێت، و بەهەمان رێژە ئەو تیورەیەی ئەفلاتۆنیان بە هەڵە ئەزانی کە مرۆڤ خاوەنی «ئایدیای خودێتیە» (لەبارەی راست و ناڕاستەوە). بەبڕوای ئەوان مێشکی مرۆڤ لە سەرەتای لەدایکبوندا زۆرتر وەک لەوحەیەکی سادە (tabula rasa)، تابلۆیەکی رەنگ نەکراو یان «کاغەزێکی سپی» وایە. پاش لەدایکبون مێشک بەردەوام پێدراوە جیاوازەکان لەرێگەی ئۆرگانەکانی هەستی خۆیەوە (چاو، گوێ و ئەوانی تر) وەرئەگرێت، پاشان ئەم زانیاریانە ریزبەند ئەکاتو ئەیانکات بە «ئایدیاکان» کە بەها ئەخلاقیەکانو زانینی ئەزمونی مرۆڤ بۆ جیهان پێکئەهێنن. لێرەوە دیدی سروشتی مرۆڤ، تواناو زانینەکەی، بەشێوەیەکی کامڵ بەرهەمی فێربونی ئەزمونیە لەرێگەی رەوتێکەوە کە بەگشتی پێی ئەگوترێت «تەداعی ئایدیاکان» (association of ideas) (دروستکردنی تیورە پێکهاتیەکان لە یەکەی سادە). بەمشێوەیە مرۆڤ کوڕی فەزای سروشتیو کۆمەڵایەتی خۆیەتی، بەڵام لە هەمانکاتدا خاوەن ئەو توانایەشە کە ئەم فەزایە بگۆڕێت.

بەپێی تێڕوانینی سەرەوە مرۆڤ لەرێگەی کارو کاردانەوەی دیالەکتیکی لەگەڵ هاورەگەزو دەوروبەریدا بەردەوام کامڵ ئەبێتو هەر بەم ئاراستەیەشە روبەڕوی تەحەداکانی بەردەمی ئەبێتەوە کە بەردەوام ئەیانگۆڕێت. لێرەوە ستایشکەرانی لۆک وەک کۆندیاک و هلۆتیوس ئەو ئەنجامگیریەیان

کردووە کە مرۆڤ خولْقێنەری خۆیەتیو تواناکانی بۆ گۆڕانی خۆی، خاوەن سنورێکی لە پێشەوە دیاریکراو نیە. کۆندریسە لە کۆتایەکانی سەدەی هەژدەدا وتارێکی بەناوی «پرۆژەیەکی وەسفی بۆ پەرەسەندنی مێژووی زیهنی مرۆڤ» (١٧٩٣) نوسی کە تیایدا هەموو قۆناغە مێژوویەکانی پێشکەوتنی بیری مرۆڤی لە رابردووەوە تا ئێستاو ئاییندە وێنا کردووە. زمانی کۆندریسە لەم بەرهەمەدا هەرچەند لە وەسفی ئاییندە نزیکتر ئەبێتەوە، شەوقو حەماسەتی زیاد ئەکات. کۆندریسە (کە خۆی بوو بە یەکێک لە قوربانیەکانی شۆڕشی گەورەی فەڕەنسی) سەرسەختانە بڕوای وابوو کە مرۆڤ لەبەر توانای «کامڵبوونی» (perfectsbility) ئەتوانێت بەسەر لاوازی، نیاز، نەخۆشیو تەنانەت مردنیشدا سەرکەوێت. هەم «لامارک»ی سروشتزانی فەڕەنسیو هەم ئەراسمۆس داروینی زیندەوەرزانو دکتوری ئینگلیزیو باپیرەی چارلز داروین، پرۆژەی سەرەتایی تیورەی پەرەسەندنی رەگەزەکانیان وێنە کێشا، و تیایدا هەریەکەیان بەشێوەی خۆی پێشبینی توانای بونەوەرەکانیان بۆ فێربون، گۆڕانو گونجان لەگەڵ هەلومەرجی تازەدا و گواستنەوەی خەسڵەتە وەرگیراوەکانی خۆیان بۆ نەوەکانیان کردبوو.

شارستانیەتی رۆژئاوا لە دامێنی سەدەی بیست و یەکدا هێشتا نرخ بۆ تێڕوانینی نادینی رۆشنگەری بۆ رەوتی بێ سنوری مرۆڤ بەرەو گەشەکردنی ئابوری، داهێنانی زانستیو پێشکەوتنی مرۆڤایەتی دائەنێت (بە بڕوای هەندێکیش کۆیلەی ئەم چوارچێوەیەیە). زانستە مرۆییەکانی سەردەمی ئێستا: کۆمەڵناسی، ئابوری سیاسی، دەروندناسی، مرۆڤناسی هەموویان لەو تۆوانەوە گەشەیان کرد کە لەسەردەمی رۆشنگەریدا چێنران . ئەمڕۆ پیاوانی دەوڵەت هێشتاش بۆ پاساوهێنانەوە سەبارەت بە بڕوای خۆیان بە هێزەکانی بازاڕ و ئەوەی کە هەوڵدان بۆ سودی تایبەتی دواجار ئەبێتە هۆی سودی گشتی، پشت بە تێزەکانی ئادام سمیس ئەبەستن.

لێرەوە ئەبێت لەژێر رۆشنایی ئەوەی گوتمان لە دژایەتیو ئاڵۆزی و تەمومژاوی زانستە مرۆییەکان بەوشێوەیەی لە سەدەی هەژدەدا دروستبوو تێبگەین، نەک لە ئاڵۆزی میراتەکەیدا. فەیلەسوفانی رۆشنگەری بڕوایان وابوو «ئەفسانەی» دۆگمای مەزهەبیان لەبارەی مرۆڤ و جێگەی مرۆڤ لە سروشتدا لەژێر فەرمانی خوداوەندا تێکشکاندووە، و زانینی زانستی راستەقینەیان لەبری داناوە کە پشتی بە ڕاستیە بابەتیەکان بەستووە. بەمشێوەیە زۆرێک لە مێژوونوسان لەوانە «گی» ئەم فەیلەسوفانەیان لەبەر تێپەڕاندنی بیرکردنەوەی «ئەفسانە ساز»(mythopoeic) و جوڵە «لەئەفسانەوە بۆ عەقڵ» ستایشکردووە.

بەڵام رەنگە راستر ئەوە بێت بگوترێت فەیلەسوفانی رۆشنگەری ئەفسانەی زانستیان کە زۆرتر لەگەڵ سەردەمی پیشەسازیو تەکنەلۆژیدا ئەگونجێت، خستە جێی ئەفسانەی مەزهەب. لەڕاستیدا نمونەکانی ئەم دوو ئەفسانەیە بەشێوەیەکی بەرچاو لەیەک ئەچن. وەک کارل بەکر ئەم بابەتەی لە بەرهەمەکەی خۆیدا کۆکردۆتەوە کە بە هوشیارانە ناوی ناوە «شاری ئاسمانی فەیلەسوفانی سەدەی هەژدەهەم»، تیورەی دۆخی سروشتی بەو شێوەیەی لە مێژوونوسی تیوریدا بەهۆی فەیلەسوفانی رۆشنگەریەوە دروستکراوە، لێکچونێکی سەرسوڕهێنەری لەگەڵ بەهەشتو کەوتنە خوارەوەی ئادەم

لە دینی مەسیحیدا هەیە. بەهەمانشێوە تیورەی رۆشنگەری بۆ پێشکەوتنی بێ سنوری مرۆڤ، ئەکرێت بە ریوایەتێکی ئەم جیهانیەی بڕوابوون بە بەهەشت دابنرێت. ئەو بیروڕایانەی پەیوەندی بە دڕندەی نەجیب (noble savage) و پێشکەوتنو پەرەسەندن کە جێگەی شکڵبەندیەکانی مەزهەبی مەسیحیان گرتەوە، بەرلەوەی کۆمەڵێک «راستی» قاڵبدراوو نەگۆڕ بن، چەمکگەلێکی تیوریو رەمزینو پەیوەندیان بە (پێش گریمانە preconceptions) و تەنانەت ئەکرێ بگوترێت بە مەسەلە ئیمانیەکانەوە هەیە.

هێنانەئارای ئەو مەسەلەیە کە فەیلەسوفانی رۆشنگەری زانستیان نەخستۆتە جێگەی ئەفسانە، بەڵکو ئەفسانەیەکی تازەیان لەجێگەی ئەفسانە کۆنەکە داناوە، بەمانای «ئابروبردنی» بزوتنەوەی رۆشنگەری نیە، بەڵکو بەو مانایەیە کە نابێت بۆ بانگەشەکانیان بەهایەکی ناوی (face value) دابنێن، بەڵکو ئەبێت وەک پڕوپاگەندەیەکی کاریگەر تەماشای بکەین. بۆ نمونە پەرەسەندنی ئابوری سیاسی لەبەرچاو بگرین. ئادام سمیس لە بەرهەمەکەی خۆیدا بەناوی «سامانی نەتەوەکان» ١٧٧٦ رەخنە لە سیاسەتی تەقلیدی «سودباوەڕی»(mercantilism) و «پشتگیریکاری» (protectionism)ی دەوڵەتە ئەوروپیەکان ئەگرێت، دۆخێک کە بە بڕوای سمیس بۆتە هۆی ئیفلیج بونی بازرگانی، چونکە دەوڵەتەکان بۆ زیادکردنی دەرامەتی خۆیان رویان ئەکردە رێ و شوێنی گومرگکردن. سمیس ئەو بڕوا تەقلیدیەشی رەخنەکرد کە بڕوای وابوو جەنگ رێگەی بەدەسهێنانی سامانەو ئەو سودە سەقامگیرەی (vested interest) کە لە رێگەی پشتگیری پاوانکردنەکانەوە بە زیانی بەرژەوەندی گشتی بەدەست دێت، مەحکوم ئەکاتو رایئەگەیەنێت کە ئەگەر بە دروستی لە میکانیزمی بازاڕ بگەین، لە دور مەودادا لە بەرژەوەندی گشتی ئەبێت. لەژێر رۆشنای ئەمجۆرە بانگەشانەدا دەرککردنی ئەو خاڵە ئاسانتر ئەبێت کە بۆچی «گی» ئابوری ئازادی سمیسی بە «مرۆڤانەتر»و «زانستی تر» لەو سیستەمە ئابوریانە ئەزانێت کە سمیس و پەیڕەوەکانی هێرشیان ئەکردە سەر.

بەڵام نابێت ئەو خاڵە گرنگەش فەرامۆشبکرێت کە ئابوری سیاسی سمیس (یان کلاسیک بەشێوەی جیاواز، لەوانە بە پێشنیارکردنی ئازادکردنی هێزی کار (کە بەدەربڕینی خۆی بە «هێزی کاری ئازاد» ناوئەبرا)، پاساوو بیانوی بۆ سەرمایەداری لەسەردەمی پیشەسازی بەرهەمهێناندا دروستکرد، بەڵام خودی ئادام سمیس ئەوەندە راستگۆ بوو کە ئەو راستیە قەبوڵبکات کە ئەو دابەشبونە کارە توندەی پێداویستی بەرهەمهێنانی مۆدێرنە (نمونەی سەرەکی سمیس بەرهەمهێنانی دەرزی بوو) کرێکاری کردووە بە یەک «دەست»، بە بونەوەرێک کە لەرووی زیهنیەوە ئیفلیجەو کردوێتی بە مەکینەیەکی کۆیلە. بەڵام ئەوەندە «مرۆڤ دۆست» نەبوو کە پێشنیاری رێگەچارەیەک بۆ ئەم کێشەیە بکات. تیوریەکانی ئابوریزانانی کلاسیک لەبارەی سودو قازانجی «یاسای ئاسنینی کرێکان» (iron law of wages) ئەمجۆرە دەستێوەردانەی لە میکانیزمەکانی بازاڕدا رەد ئەکردەوە (ئەوان بڕوایان وابوو هەموو جۆرە دەستێوەردانێک لە میکانزمی رکەبەرایەتیدا لە بنەڕەتدا ئەبێتە هۆی ناکارایی). بەمشێوەیە ئابوریزانانی لایەنگری بازاڕی ئازاد لەژێر ناوی «یاسا سروشتیەکانی»

هێزەکانی بازاڕ، بەرگریان لە سیستەمی ئابوری نادادپەروەرانەی سەرمایەداری ئەکرد. یاساگەلێک کە بەبڕوای ئەدمۆند برکی سیاسەتمەداری ئینگلیزی پیرۆز بوون، چونکە بە بەشێک لە «یاساکانی خوداوەند» ئەژمێرران.

زانستە کۆمەڵایەتیە تازەکان کە بەهۆی فەیلەسوفانی سەردەمی رۆشنگەریەوە گەشەیان کرد، تێڕوانینەکانی مەسیحیەتیان لەبارەی حکومەتی هەڵبژێراوی خوداو سیستەمی هیریدیانە (hierarchy) و دەستنیشانکردنی (subordination) فیودالیانە بەتوندی رەخنە کرد. بەڵام (جگە لەچەند ئاوارتنێک وەک رۆسۆ) هیچ رەخنەیەکی وردبینانەیان لە کۆمەڵگای بەرخۆر کە موڵکایەتی تایبەتیو بەرژوەندیە فەردیەکانی پیرۆز ئەکرد، پێشکەش نەکرد. سرودی ستایشکردنی رۆشنگەری لە «پێشکەوتن» لە زۆرێک لەبوراەکاندا، نایەکسانیو ستەمی ستەمکارانەی سیستەمەی پیشەسازیو مەسرەفی تازەی فەرامۆش ئەکرد (بەو بەهانەیەی کە مەگەر هەموو شتێک لە دۆخی باشتردا نەبوو؟». بێ هۆ نیە رۆمانسیەکی وەک ویلیلم بلیک بەو حەماسەتو گەرمیەوە هەلومەرجی باڵادەست بەسەر «کارخانە رەشو شەیتانیەکان»ی مەحکوم ئەکاتو فەیلەسوفانی رۆشنگەری وەک بیکۆنو لۆک و نیوتنو ڤۆڵتێر وەک کۆمەڵێک بلیمەتی ئەهریمەن سیفەتی پشتیوانی ئەم رژێمە، بە شایەنی سەرزەنشتکردن ئەزانێت. ماورین مک نیل بەشێوەیەکی قابیلی قەبوڵ ئەو بابەتە دێنێتە پێشێ کە ئەراسمۆس داروینی پزیشک، پسپۆری پەروەردە، زاناو لە هەموو ئەمانە گرنگتر فەیلەسوفی بەرجەستی رۆشنگەری کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە، پڕ حەماسەتترین و تامەزرۆترین بانگەشەکاری بەهاکانی کۆمەڵگای پیشەسازی تازە بوو.

**سەرچاوە:**

*وەرگێڕانی فەسڵی دوهەمی ئەم کتێبەی خوارەوە

روی پۆرتەر: روشنگەری. ترجمە: سعید موقدم. تهران. اختران ١٣٨٧

# شۆڕشی سەدەی حەڤدەیەمی بەریتانیا

مایکل ریچاردز
لە ئینگلیزییەوە: شاهۆ قادر خانزادە

ئەوەی ئێستا زۆر لە مێژوونووسان بە شۆڕشی بەریتانیا ناوی دەبەن، واتە رووداوەکانی ١٦٤٠ەکان و ١٦٥٠کان لە دوورگەکانی بەریتانیا هێشتا زۆر کەسی تر بە شۆڕشی ئینگلیز یاخود شەڕی ناوخۆی ئینگلیز باسی دەکەن.

هەندێ کەس وەک سەرهەڵدانێک و هیچی تر ئەیبینن و هەندێکی تر وەک تەنگژەیەکی سیاسی لە کۆنترۆڵ دەرچوو. ئەو باسەی لێرەدا پێشکەش دەکرێت ئەوەیە کە رووداوەکانی ئەو سەردەمە، بەتایبەتی کاتێک لەگەڵ شۆڕشی ١٦٨٨ چاویان لێ دەکرێت، شۆڕشێک پێکدێنن کە ئەکرێ بە یەکەم شۆڕشی راستەقینە لە مێژووی جیهاندا ناو بنرێت. لە باتی شەڕکردن لەگەڵ سیستەمی سیاسی سەردەم بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی بە تەواوی تازە، هەر وەک چۆن لە زۆربەی شۆڕشەکانی دواییدا روویدا، ئینگلیزییەکان هەوڵیاندا لە نەریت و مافە لە کۆنەوە رێزلێگیراوەکان پارێزگاری بکەن. بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا توانییان سیستەمێکی نوێ دابمەزرێنن.

ئینگلیز لە ناوەندی شۆڕشی بەریتانیادایە. رووداوەکانی سکاتلەند و ئایرلەند بێگومان لە خۆیاندا و بۆ خۆیان گرنگییان هەبوو بەڵام ئەو گرنگییە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ئەو رووداوانە لەسەر هەلومەرجی شۆڕشگێرانەی ئینگلیز. بە سەرنجدانی هەموو ئەمانە پێکەوە، رووداوەکانی بەریتانیا لە گۆڕینی مێژووی جیهاندا یارمەتیدەر بوون.

لە کاتێکدا مێژوونووسان ئیتر شۆڕش بە بەرگرییەکی دوور و درێژ و ئاگادارانە لە مافە سیاسییەکانی ئینگلیزییەکان لە دژی زۆرداری پاشایەتی نازانن، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵک لە هەموو

ئاســـتەکانی کۆمەڵگاوە لە ١٦٢٠ەکان و ١٦٣٠یەکاندا کێشە سیاسیەکانیان زۆر بە جیدی وەردەگرت. لەوانەیە هیچ کەس هێندەی چارلزی یەکەم ئەو کێشانەی بە جیدی وەرنەگرتبێت. هەوڵەکانی ئەو بۆ حکومەتکردن بەو شێوەیەی کە ئەو بیری لە دەسەڵاتی شا ئەکردەوە لە ١٦٤ ٠ە کاندا بە هەڵە شەڕی ناوخۆ و شۆڕشـــی لێکەوتەوە . ئەکرێ بڵێین لە ١٦٤٠ەکاندا هیچ کەس بیری لە شۆڕش نەدەکردەوە، بەڵام ئەو پێشـــنیارانەی کە وەک بەرگری لە مافەکانی پەرلەمان پێشـــکەش کران هێدی هێدی بوونە هۆی گۆڕانێکی پڕ واتا لە هاوسەنگی رێکخراوەیی هێزدا.

لە شۆڕشـــی بەریتانیادا ئایین دەورێکی ســـەرەکی بینی. تا رادەیەک هێزی بەرهەڵســـتکار دژی دەســـەڵاتی شـــا پێکهات ئەویش بەهۆی پشـــتگیری شـــا لە رێبازە ئایینیەکان کە کڵێســـەیەکی ئەنگلیکانـــی[1] بە بەراورد تەنگە جیکڵانەی دامەزراند کە زۆر لە کڵێســـەی کاســـۆلیک ئەچوو. بۆ ئەوانەی کە خۆیان بە پیوریتان[2] ئەزانی مەسەلەی ئایین گرنگترین شت بوو. بۆ کەسانی تر ئایین لەوانەیە تەنیا نموونەیەک لە دەســـت تیۆەردانی شـــا بووبێت لە کاروبارێکدا کە هیچ دەسەڵاتێکی یاســـایی بە ســـەریاندا نەبوو. بێگومان بۆ لایەنگرانی چارلز رێبازە ئایینیەکان و ئەنســـتیتۆکانیش هۆکارگەلی گرنگ بوون. بۆ ژمارەیەکی بچووکیش بڕوا ئایینیەکان بیروباوەرە رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابورییە رادیکاڵەکانی لێکەوتەوە .

## سەرچاوەکانی شۆڕشی بەریتانیا:

لە کاتێکدا سیاســـەتەکانی ١٦٢٠ و ١٦٣٠ەکان بە پێویست نەبوونە هۆی سەرهەڵدان و شۆڕش لە ١٦٤٠ دا بەڵام هەندێک رووداو بە ئاســـانی بوونە هۆی دروســـتکردنی بارودۆخێکی شۆڕشگێڕانە . ئەو رێبازانـــەی چارلزی یەکەم و راوێژکارانی لە ١٦٢٠ەکانـــدا گرتیانەبەر، بە تایبەتی لە بواری کاروباری دەرەوەدا، هەندێک گرژی و بەرهەڵســـتکارییان خوڵقاند. ســـکاڵانامەی مافەکان (١٦٢٨)، کە لەسەر بنچینـــەی پەیـــڕەو و یاســـاگەلی جۆراوجۆر بـــوو، دوای دانانان بە چەند بنەمای ســـەرەتاییدا بوو. رێـــی تێدەچێ گرنگترین بنەمـــا لە ناو ئەوانەدا ئەوە بوو کە بێ رەزامەنـــدی پەرلەمان نەدەکرا باج کۆبکرێتەوە . هەندێکیتریـــان دووپاتکردنەوەی مافی بابیا کۆرپس[3] (واتا بەند نەکردنی هیچ کەس بێ خســـتنە رووی بەڵگە) و پێداگری لەســـەر ئەوەی کە نەدەبوو ســـەرباز لە ماڵی سیڤیل یان لە فەرمانڕەوایی ســـوپایی کە لە کاتی ئاشـــتیدا رادەگەیەنرا جێگەیان بکرایەتەوە . چارلز لە بەرامبەر قەبوڵکردنی ئەو ســـکاڵانامەیەدا سوبســـید یاخود یارمەتی پێدرا. هەر چۆنێ بێ ساڵی دوایی چارلز ئاشبەتاڵی بە پەرلەمان کرد و لە ١٩٣٠ەکاندا بە بێ دروستکردنەوەی پەرلەمان فەرمانڕەوایی کرد.

لە ١٦٣٠ەکاندا رێبازەکانی شـــا لە پێوەندی لەگەڵ کاروباری ئایینی و هەروەها کاروباری دارایی بـــەردەوام بێ بڕەو بوون. باجی ســـەرپاپۆڕەکان (باجێک کە پێشـــتر تەنیا لـــە ناوچە کەناریەکان وەردەگیرا ئەویش بە مەبەستی دابینکردنی پارەی پێویست بۆ بەرگریکردن) لە ١٦٣٨ دا بە تایبەتی ســـەلماندنی کە بێ بڕەو و ناپەسەندە . وادیاربوو کڵێسەی ئەنگلیکان بەرەو بیر و باوەڕی کاسۆلیک هەنگاوی هەڵدەهێنا. پیوریتانەکان ئەیانویست ئۆفیسی سەرۆک قەشە دابخەن و کۆتایی بهێنن بە

کەڵک وەرگرتن لە پەرتووکی نوێژی ئەنگلیکان. پرێسبە تێریەکان[٤] و کۆمەڵانی تر بۆچوونی خۆیان هەبوو لەبارەی چۆنیەتی رێکخستنی کڵێسەوە. رێبازی ئایینی بە ئاسانی بەناو پرسە سیاسیەکاندا بڵاوبووەوە. ئەو بۆچوونەی کە کڵێســـەی ئەنگلیکان بۆ دواوە واتا بەرەو کاسۆلیزم رێگەی گرتبووە بەر یەکســـەر مەترســـی پیلانی لەلایەن پاپاوە دروســـت کرد بۆ رووخاندنی سیســـتەمی حکومەتی ئینگلیز.

پۆلێنکردنی بەرهەڵســـتکاری پەرەســـێنەر دژی دەســـەڵاتی شـــا بە رێک و پێکی مومکین نیە. بۆچوونـــی لـــە مێژینەی کەلێنی روو لە زیادبوونی نێوان کۆشـــکی پاشـــا و دانیشـــتوانی وڵات تا رادەیەک یارمەتیدەرە بەڵام لایەنگرانی شا لە سەرانسەری ئینگلیز و لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگادا بەرچـــاو دەکەوتن. گۆڕانکاری گرنگـــی کۆمەڵایەتی، ئابووریی و فەرهەنگیی روویان ئەدا. بەتایبەتی گەشەسەندنی ئابوری بازرگانی لەگەڵ خۆیدا بەرزبوونەوەی نرخەکانی هێنا. لەگەڵ ئەوەشدا، هاتنە سەرەوەی کۆمەڵە کۆمەڵایەتیە تازەکان و چوونە خوارەوەی کۆمەڵە کۆنەکان هیچ کامیان کلیلێک بۆ کردنەوەی رووداوەکان نادەن بە دەســـتەوە. لەو کاتەدا هیچ کەســـێک لە بیری شۆڕش یان تەنانەت ســـەرهەڵداندا نەبوو. زیاتر ناڕەزایی پەرەسێنەر لە رێبازەکانی بنەماڵەی پاشایەتی بوونی هەبوو و بە داخەوە چارلز لێپرسراوێتی ئەو رێبازانەی لە ئەستۆ گرت.

سەرهەڵدانی سکاتلەند لە ١٦٣٩ رووداوەکانی گەیاندە خراپترین ئاست. ئەو سەرهەڵدانە بە پلەی یەکەم دژی کارپێکردن بە مەشـــقەکانی ئایینی ئەنگلیکان لەلایەن شاوە بوو و بە تایبەتی دژایەتی هەوڵی ســـەپاندنی پەرتووکی نوێژی ئەنگلیکانی بەسەر پرێسیەتێریەکانی سکاتلەند ئەکرد و بووە هۆی خوڵقاندنی تەنگژەیەکی سیاســـی و دارایی کە چارلزی ناچار کرد لە ١٦٤٠دا داوای کۆبوونەوەی پەرلەمان بکات.

«پەرلەمانی کورت خایەن»[٥]، کە بۆ ماوەی سێ هەفتە کۆبوونەوەی کرد، نەیتوانی لەسەر پارەی پێویســـت بۆ شـــەڕی دژی ســـکاتلەند دەنگ بدات. دوای ئەوە چارلز داوای پێکهێنانی پەرلەمانێکی کرد کە بە «پەرلەمانی درێژخایەن»[٦] ناوی دەرکرد. ئامانجی دەســـت بە جێی ئەندامانی پەرلەمان کۆتاییهێنان بەو هەنگاوانە بوو کە پێوەندییان هەبوو بە یانزە ســـاڵ فەرمانڕەوایی بەبێ پەرلەمان و لەسەرکار لابردنی ئەو کەسانەی کە بەرپرسی ئەو هەنگاوانە بوون. یاسایەکی سێ ساڵە[٧] پێویستی بە کەمتر لە سێ ساڵ هەبوو بۆ ئەوەی لە نێوان دانیشتنەکانی پەرلەمان دا تێپەڕ ببێت. یاسایەکی تر هەڵوەشـــاندنەوەی پەرلەمانی بەبێ رەزامەندی خۆی قەدەغەکرد. باجی سەر پاپۆڕەکان نایاسایی راگەیەنـــدرا. تۆماس وێنتورس، ئێرلی ســـترافۆرد[٨]، یەکێک لە گرنگترین کاربەدەســـتانی چارلز، بە تاوانی خیانەتی گەورە راپێچی دادگا کرا و پاشـــان لە ســـێدارە درا. ســـەرەک قەشـــە ویلیام لۆرد، نەخشەکێشی سەرەکی رێبازە ئایینییەکانی ئەنگلیکان، لە تاوەری لەندەن بەندکرا.

ئەو ماوە کورتە لە چاکسازی لەوانەیە کۆتایی تەنگژەی سیاسی و دارایی بووبێت. بیروبۆچوونێکی هەرە بەرچاو لە بارەی شۆڕشـــی بەریتانیاوە ئەوەیە ئەو شۆڕشـــە بە زۆری تەنیا خراپ بەڕێوەبردنی سیاسی بوو و هیچی تر. بە پێی ئەم بۆچوونە ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی پەرلەمانی جەماوەری[٩] کە

حەزیان لە کەڵەکەکردنی کێشەکان تا ئاستی شەڕی ناوخۆ نەدەکرد لەوانەیە لەو سەردەمەدا حەزیان لە ڕێبازگەلی زیرەکانە تری شـــا یان کەســـایەتی تاڕادەیەک جیاوازی شا کردبێت. چارلز ناچار بوو ڕووبەڕووی ئەو کێشانە بوەســـتێتەوە کە پاشایەتیە جۆراوجۆرە دەسەڵاتدارەکان خوڵقاندبوویان و هەروەها ئەو کێشانەی کە پێوەندییان هەبوو بە دووبەرەکی ئاییندا. هاوتاکانی چارلزیش لە بەشەکانی تری ئەوروپا ڕووبەڕووی ئەو کێشانە دەبوونەوە. هەرچۆنێ بێ زانایانی پێداچوونەوەخواز[١٠] گرنگی «دارِمانی سیستەمێکی دارایی و سیاسی لە بەرامبەر هەڵاوسان و تێچووی ڕوو لە زیادبوونی شەڕ» دووپـــات دەکەنەوە. ئەم ڕێکارە بە ئەگـــەری گۆڕانی کۆمەڵایەتی یـــان جیاوازییەکانی نێوان بنەما سیاسیەکان وەک هۆکارگەلێکی گرنگ بۆ هاتنە کایەی شەڕی ناوخۆ بایەخ نادات.

لەگـــەڵ ئەوەشـــدا بـــە ڕوونی دەرئەکەوێـــت کە گۆڕانـــی کۆمەڵایەتـــی و دروســـتکردنی پێگە ئایدیۆلۆجیکیەکان لە دەستنیشـــانکردنی دەرەنجامەکانی ڕووداوەکانی ١٦٤٠ تا ١٦٤٢ دا یارمەتیدەر بـــوون. لەو کاتەدا کە هەڵبژاردەی کۆمەڵ بەردەوام ڕێبەرایەتی ئەو ڕووداوانەیان دەکرد کە شـــەڕی ناوخۆیان لێکەوتەوە، فراوان بوونی بەرچاوی نەتەوەی سیاســـی لە ئارادا بوو. ئەو نەتەوە سیاســـیە فراوان بووە، چ لە ئاســـتی خۆجێیی و چ لە ئاســـتی نیشتمانیدا بەشـــداری کردبێت، سنوورەکانی ڕووداوە سیاسیەکانی سەرلەنوێ پێناسەکرد. لەو دەمەدا ڕێبازی ئایینی گرنگیی تایبەتی هەبوو و، هەروەک پێشـــتر باس کرا، بە گشـــتی بۆچوونە ئایینیەکان بە خێرایی بۆ ناو بۆچوونە سیاسیەکان پەرەیان ســـەند. ژمارەیەک بۆچوون هەبوو ســـەبارەت بە دەســـەڵاتی پاشـــایەتی لەسەر بنەماگەلی ڕێکەوتن، یاسا و ڕەزامەندی. ئەگەرچی بەرهەڵستکارانی پاشایەتی بە گشتی حەزیان لە دۆزینەوەی بنچینەی هاوبەش لەگەڵ شادا بوو، بەڵام هەڵوێستێکیان گرتبووە بەر کە سازشی لەسەر نەدەکرا.

لە ١٦٤٤ و ١٦٤٢ چەند کۆمەڵی نوێ چوونە ناو سیاســـەتەوە. لەوانیش بازرگانان و پیشەسازان، خەڵکانێک کە لە هەڵبژاردەی کۆمەڵدا ئەندام نەبوون. لەندەن بوو بە شـــارێکی شۆڕشـــگێڕانە. لە مانگی مەی ١٦٤٤ هەزاران کەس لە شەقامەکانی لەندەن گوشاریان خستە سەر پەرلەمانی لۆردەکان بۆ ئەوەی ئێرلی ستراففۆرد، وەزیری یەکەمی چارلز لە دادگا تاوانبار بکات. ئەو کەسانە لە بڕیاری چارلز بۆ قوربانیکردنی ئەو وەزیرەدا دەوریان هەبوو. لە دیســـامبری هەمان ساڵدا جارێکی تر لە گوشاری گەل بۆ لابردنی قەشـــەکان لە پەرلەمانی لۆردەکان کەڵک وەرگیرا. هەرچەندە ئەو خۆپیشاندانانە بە تەواوی خۆکرد و بێ ئامادەکاریی نەبوو، بەڵام چەند شتیان پیشان ئەدا وەک پشتگیری لە پەرلەمان، بێ بڕوایی بە ڕاوێژکارانی چارلز و ترس لە پیلانی کاسۆلیک.

هێزی بەرهەڵســـتکار بڕوایان بە چارلز نەبوو و لە کردەوەکانیدا هەوڵێکیان بۆ گرتنەوە دەســـتی دەســـەڵات ئەبینی. ئەوان نیگەرانی دەستگرتنی چارلز بەسەر سوپادا بوون. پەرلەمان وەک باشترین بەرگری لە دژی هەر جۆرە کەڵکوەرگرتنێکی بێ ســـەروبەر لە دەســـەڵات سەیر دەکرا. سەرهەڵدانی ئایرلەندییەکان دژی فەرمانڕەوایی ئینگلیزییەکان بارودۆخەکەی خراپتر کرد. جارێکی تر سەرهەڵدانی ئایرلەند ترسی لە پیلانی کاسۆلیکەکان دژی گەلی ئینگلیز زیاتر کرد.

لە سەرەتای ١٦٤٢ دا هەوڵی سەرنەگرتووی چارلز بۆ گرتنی پێنج کەس لە ڕێبەرانی بەرهەڵستکار

لە پەرلەمانی گشــتیدا ئەگەری هەڵگیرســانی شــەڕی ناوخۆی مســۆگەر کرد. پەرلەمان لە مانگی جوونــی ١٦٤٢ لەلایەن خۆیەوە بەیاننامەیەکــی دەرکرد کە نۆزدە داواکاریــی تێدابوو، لەوانیش نە تەنیا چاکســازی کڵێســە و حکومەت بە درێژایی ئەو هێڵانەی کە پەرلەمان دیاریکردبوون، بەڵکو کۆنترۆڵکردنی سوپا و دانانی وەزیرانی شا لە لایەن پەرلەمانەوە. ئەو پێشنیارانە کاریگەرییان هەبوو لەسەر پێدانی سەروەری بە پەرلەمان، هەڵوێستێک کە رێی تێدەچوو چارلز پشتگیری بکات.

لە بەرەبەیانی شــەڕی ناوخۆدا نەتەوەیەکی سیاســی بناغە —فراوان لە ســەر پرســە ئایینی و سیاسیەکان دووبەرەکی تێکەوتبوو. ئەو نەتەوەیە هەرچەندە متمانەی بە شا نەمابوو بەڵام خۆبەستە نەبوو بە هەڵوەشــاندنەوەی سیســتەمی پاشایەتی. شــەڕی ناوخۆ کە لە هاوینی ١٦٤٢ دا دەستی پێکــرد هەلێکی لەباری رەخســاند بۆ ئەوەی بیروڕاکان بە دوو جەمســەری جیاوازدا دابەش ببن و هەڵوێستەکان زیاتر رادیکاڵ ببن.

## شەڕی ناوخۆ

بــەر لە ئۆگســتی ١٦٤٢ لایەنە دژ بە یەکــەکان پێکهاتبوون و هەر دوو لایەن بانگەشــەیان بۆ یــەک ئامانج ئەکرد: ئەوان هەردووکیان پارێزەرانی سیســتەمی سیاســی راســتەقینەی ئینگلیز و ئایینی پروتســتانت بوون. ئەو دوو تاقمە لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیشدا تاڕادەیەک لەیەک ئەچوون و هەڵبــژاردەی ئاریســتوکراتیک رێبەرایەتی هەردوو لایەنیان گرتبووە دەســت. لە هەمان کاتدا کە شا بەهێزترین پشــتگیری خۆی لە پەرلەمانی لۆردەکانەوە بەدەست دەهێنا، کەمینەیەکی گەورەی ناو پەرلەمانی گشــتیش پشــتگیری ئامانجەکەی ئەویان ئەکرد. ئەنگلیکەکان و کاسۆلیکەکانیش پاڵپشتی شایان ئەکرد. لە بارەی جوگرافییەوە، هێز و توانایی شا لە باکور و رۆژئاوای وڵاتدابوو.

کۆمەڵی پەرلەمانیی بە شــێوەی سروشــتی هێزی خــۆی لە ئەندامانی پەرلەمانی گشــتییەوە وەردەگــرت. ئەو کۆمەڵە بە چینە بازرگان و پیشەســازەکانیش لە لەندە، نۆرویچ (norwich)، هاڵ (hull)، پلەی ماوس (plymouth)، گلۆسێســتر (gloucester) پشــت ئەســتوور بوون. لە باری جوگرافییەوە پشــتگیری بۆ ئەمان لە ناوچەکانی باشوری رۆژهەڵاتەوە سەرچاوەی ئەگرت. لە باری ئایینیەوە ئەم کۆمەڵە ئەو کەســانەی راکێشــابوو بە لای خۆیدا کە خۆیــان بە پیوریتان ئەزانی و هەروەها ئەو کەسانەی کە ئەندامی تاقمە رادیکالترەکان بوون.

بەشی سەرەتایی شەڕی ناوخۆ یەکلاکەرەوە نەبوو، هەرچەندە رووداوێکی گرنگ دەرکەوتنی خێرای ئەندامێکی «پەرلەمانی درێژخایەن» بە ناوی ئۆلیڤر کرۆموێڵ[١١] وەک سەرکردەیەکی سەربازی بوو. ئەندامانی پەرلەمان هاوڕێ لەگەڵ ســکاتلەندییە پرێســبەتێریەکان پەیمان و یەکێتی پیرۆز[١٢]یان قەبووڵ کرد و تێیدا لەسەر دامەزراندنی کڵێسەیەکی نیشتمانی و بە ناوەندیکراو رێکەوتن. کارتێکردنی کەســانی سەربەخۆییخواز بۆ کڵێســە[١٣] و کەسانی هەڵگەڕاوە لە کڵێسە[١٤] لە سوپادا زیادی کرد و ئەم کارتێکردنە کەلێنێکی لە نێوان سوپا و پەرلەماندا دروست کرد.

لە ١٦٤٤ و ١٦٤٥ بەرژەوەندیی شــا تووشی شکســت بوو، یەکەمجار لە مارستن مور (marston

moor) لە ١٦٤٤ و پاشان لە نازبای (naseby) لە ١٦٤٥. لە نێوان ئەو دوو شەڕە سەرەکییەدا سوپای پەرلەمان وەک مۆدێلێکی نوێ لە سوپا چاوی لێکرا کە کرۆموێل کەسایەتی سەرەکی ئەو سوپایە بوو، هەرچەندە سەرکردەی هەموو هێزە چەکدارەکان نەبوو. بەشی یەکەمی شەڕی ناوخۆ لە ١٦٤٦ کۆتایی هات. ساڵی دوایی سکاتلەندییەکان چارلزیان دا بە پەرلەمان.

لە هەمان کاتدا جیاوازی بیروبۆچوون لە نێوان پەرلەمان و سوپادا پەرەی سەند. سوپا دژی هەوڵەکانی پەرلەمان بۆ ئاش بەتاڵ کردن بە سوپا وەستا. سەربازان نیگەرانی مووچە و هەروەها چارەسەرییە ئایینی و سیاسیەکانی پێشنیار کراو لەلایەن پەرلەمانەوە بوون. دەمەتەقێکانی پوتنی (putney) لە ١٦٤٧ کاریگەری لێڤلرەکانیان (levellers) دەرخست کە کۆمەڵێکی رادیکاڵ بوون و حەزیان لە سەروەری جەماوەر و یەکسانیی کۆمەڵایەتی ئەکرد. ئەمە دەربڕی بزاڤێک بوو کە لەو رێبازانەی زیاتر بایەخیان بە رابردوو و گۆڕانی شۆڕشگێرانە و بیرورا گەردونیەکان ئەدا دوور ئەکەوتەوە. کۆمەڵانی تر، بۆ وێنە دیگرز (Diggers) بە بیرورای خۆیانەوە سەبارەت بە خاوەنێتی پێکەوەیی سامان[١٥]، تەنانەت لە لێڤلریەکانیش رادیکاڵتر بوون.

چارلز کە بە دەستی سوپا لە ئاهەنگێکی پەرلەمان داگیرابوو، ئامادە نەبوو لەسەر مەرجەکانی ئاشتی (سەر باسی پێشنیارەکانی) ئەنجومەنی سوپا رێک بکەوێت. لە نۆڤەمبەری ١٦٤٧ دا چارلز توانی رابکات و پاش دانوستان لەگەڵ پەرلەمان و سکاتلەندییەکان، لەگەڵ سکاتلەندییەکان بوو بە هاوپەیمان و دەستی کرد بە بەشی دووهەمی شەڕی ناوخۆ لە ١٦٤٨ دا. ئامانجی پاشایەتی بە خێرایی وورد بوو. لە دیسامبریی ١٦٤٨ سوپا لە ناو پەرلەماندا نەیارانی دەرکرد (پاککردنەوەی شانازیی) و پەرلەمانی درێژخایەنی بۆ پەرلەمانی پاشەرۆک[١٦] نزم کردەوە. ئەو پاشەرۆکە دادگایەکی باڵای دادیان دامەزراند کە شای بە تاوانی خیانەت دادگایی کرد. چارلز سزای مەرگی بۆ بڕایەوە و لە ٣٠ جانوییە ١٦٤٩ سەری لێکرایەوە.

## شۆڕشی 1649ی بەریتانیا؟

کوشتنی شا یەک دەیە لە تاقیکردنەوەی هێنایە کایەوە. چی ئەبوایە بخرێتە جێی پاشایەتی؟ لە نەهێشتنی پاشایەتی زیاتر ئایا ئینگلیزییەکان لە ئەنجامدانی شۆڕشێکی راستەقینەدا سەرکەوتوو بوون؟ بەشێک لە وەڵامی ئەم پرسیارانە لە پێوەندی نێوان شەڕ و شۆڕشدا دەرئەکەوت. شۆڕشی فەرانسا شەڕی ناوخۆی لێکەوتەوە. ئەو کێشانەی لە پاراستنی شۆڕش و هاوکات تێوەگلان بە شەڕ و هەروەها شەڕی ناوخۆوە تووشی بوون رێبەرانی شۆڕشگێڕی رۆژ بە رۆژ هیوا براو تری وا لێکرد هەنگاوی رادیکاڵی گونجاو بنێن. فەرانسیەکان لە ١٧٩٠ەکان و هەروەها لە کاتی رێبەرایەتی ناپلیۆندا ئەنستیتۆ و ئایدۆلۆجیە شۆڕشگێڕانەکانیان بۆ زۆر بەشی ئەوروپا نارد. شەڕی ناوخۆ لە ئینگلیز رەوتی سیاسی لە چەند قۆناغەوە تێپەڕاند کە رێی تێدەچێ نێوانڕەوەکان لەو قۆناغانەدا حەزیان لە وەستاندنی شەرەکە کردبێت بەڵام نە تا ئاستی شۆڕشێکی پێکەوە نووساو لە سیاسەتدا. ئینگلیز لە ١٦٥٠ کاندا تووشی شەڕ بوو بەڵام لە دوورگەکانی بەریتانیا شەڕ زیاتر شەڕی داگیرکردن

بوون و لەو شـــەڕانەدا ســـوپای كرۆموێل ســـكاتلەندی گرتەوە و ئایرلەندی ئارام كردەوە. دڕندەیی مـــل پێكەچكردنی ئایرلەند، كە بە «بەڵای كرۆموێل» نـــاوی دەركرد، میراتێكی تاڵی لە دوای خۆ جێهێشـــت كە هێشتا بە ســـەریدا زاڵ نەبوون. لە دەرەوەی وڵات لە ١٦٥٢ تا ١٦٥٤ ئینگلیز خەریكی شـــەڕی دەریایی بوو لەگەڵ هۆڵەندا. شـــەڕ و زیاتركردنی باج لەسەر سامان و باجی گومرگ لە ١٦٥٣ تەنگژەیەكی لێكەوتەوە. پەرلەمان ویســـتی ئاشبەتاڵ بە ســـوپا بكات بەڵام كرۆموێل زووتر دەست بەكاربوو و كۆتایی هێنا بە پەرلەمانی پاشەرۆك و خۆی وەك پارێزەری خوا ڕاگەیاند.

لە ڕاستیدا كرۆموێل لە ١٦٥٠كاندا حكومەتێكی دیكتاتۆری و ڕێگە چارەیەكی لەناكاو و بێبەرنامەی پێشـــوو و كەسیی پێكهێنا كە تەنیا بۆ شۆڕشێكی ســـنووردار ڕێگەی خۆش كرد و هەروەك دواتر دەركەوت بە شـــێوەی كاتی دەرفەتی هەر جـــۆرە گەڕانەوەیەكی بۆ دۆخی جاران لەبار برد. كرۆموێل كـــە خۆی بە نوێنەری خوا ئەزانی ڕۆژنامەكانی داخســـت و بۆ دۆزینەوەی هەر بەرهەڵســـتكارێكی ڕێ تێچوو لە ســـیخوڕ كەڵكی وەرگرت. لە كاتێكدا كرۆموێل بە گشـــتی ڕێگەی بە ئازادی ئایینی دابوو، بەڵام كاسۆلیكەكان مافی خواپەرستیان بە ئاشكرا نەبوو و ئەنگلیكەكانیش نەیانئەتوانی لە پەرتووكی نوێژی خۆیان كەڵك وەرگرن. ڕێبەرایەتی بە زەبری كرۆموێل ئەو ڕێكخستنەی لە ١٦٥٠كاندا جێگیـــر كرد بەڵام نەیتوانی بە تـــەواوی چالاكییە تێكدەرانەكانی گۆرانیدانەران و نامیلكەنووســـان بوەســـتێنێت. لە ١٦٥٠كاندا ئینگلیز تووشـــی شـــتێكی لە وەك خولی تیرۆر لە فەرانسا (١٧٩٣ تا ١٧٩٤) نەبـــوو (هەرچەنـــدە ئەكرێت بڵێین بارودۆخی ئایرلەنـــد زۆر خراپتر بوو). مەرگی كرۆموێل لە ١٦٥٨ ئەو ڕێكخســـتنەی هەڵوەشـــاندەوە و بوو بە هۆی بێ ســـەروبەری سیاسی و دروستبوونی ترس لە ســـەرهەڵدانەوەی شـــەڕی ناوخۆ. لە ١٦٦٠ دا پەرلەمان هەڵبژێردرا و هەر لەو ساڵەدا بە پەلە بانگهێشتی چارلزی دووەم، كوڕی شای لە سێدارەدراوی كرد پاشایەتی بگرێتە دەست.

لە ڕاســـتیدا سڕینەوەی پاشایەتی و پەرلەمانی لۆردەكان بۆ خولقاندنی شۆڕشێكی ڕامیاری بەس بوو. بۆ ماوەی چەند ساڵ نوێنەرانی خەڵك لە پەرلەمان بە شێوەی تیۆرك لە ئینگلیزدا حكومەتیان ئەكرد. ڕادیكاڵەكان لە پەرلەمان ڕازی نەبوون. ســـوپا ڕەخنەی ئەگرت. لە ١٦٥٣ كرۆموێل دەسەڵاتی كەسیی وەرگرت. لەگەڵ ئەمانەشدا بیروڕا و هەڵوێستەكانی ١٦٤٠ەكان و تەنانەت پێشتریش ناكرێت لە بیر بكەین، تەنانەت ئەگەر بكرێت بۆ ماوەیەكی كاتی پشت گوێ بخرێن. سیاسەت بە شێوەیەكی تەنانەت ڕیشـــەییتر سەیر دەكرا، ئەویش لە ژێر ڕۆشناییەكی جیاواز لە دۆخی پێشووتر لە ئینگلیز و هەروەها جیاواز لە دۆخی سەردەمی چانل (Channel).

هابـــز (hobbes) و لاک (locke) هەردووكیان لەســـەر لایەنی مرۆڤی لە سیاســـەتدا پێداگرییان ئەكرد. لای ئەمان سیاســـەت شـــتێك نەبوو لەسەر بنچینەی یاســـا خواییەكان بەڵكو دروستكراوی دەستی خەڵكێك بوو كە لەسەر پەیمانێك ڕێكەوتبوون.

لە ڕووی ئایینیشەوە گۆڕانكاری زۆر ڕوویدابوو. كێشەیەكی ئەنگلیكانی بووژاوە و بەهێز لەگەڵ گەڕانەوەی پاشـــایەتی سەریهەڵدا، بەڵام نەیتوانی پرێسبە تێریەكان و بەرهەڵستكارە ڕادیكاڵترەكان ســـەركوت بكات. كەمینە پڕوتســـتانتە گرنگەكان مانەوە. ئەوان لە ئاكامدا سنگ فراوانیی ئایینیان

بـــردەوە، بەڵام بەردەوام لە باری مەدەنی و سیاســـیەوە پەککەوتە بوون. کەلێنی نێوان کڵێســـە و کڵێســـەی کەمینە ئاینییەکان (chapel) بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ســـەدە پاش شۆڕشـــی بەریتانیا دەورێکی گرنگی گێرا لە فەرهەنگ، پەروەردە، و سیاسەتی ئینگلیزدا.

لە بارەی کۆمەڵایەتییەوە شتێکی وەها رووی نەدا کە پێی بوترێت شۆڕشی کۆمەڵایەتی. بۆ وێنە دیگرەکان کۆمەڵێکی بچووکی رادیکال بوون. ژمارەیەک لە پاشـــایەتی خوازەکان ســـامانەکانیان لە کیس چوو بەڵام ژمارەیەکی زۆرتریان لە سزاگەلی بەرچاو خۆیان پاراست. ئاشکرابوو کە ئەو شۆڕشە شۆڕشـــێکی بورجوازی نەبوو. هیچ چینێکی کاپیتالیش، کە هەست بە جیاوازی چینایەتی بکات و بەسەر چینی خانەدانی فیودالدا سەر بکەوێت، سەریهەڵنەدا.

بە گشـــتی، بەرامبەر بە بازرگانی و کشـــتوکاڵی بازرگانی حەزێکی زیاتر دروست بوو وردە وردە حکومـــەت وا ســـەیر ئەکرا کە دەورێکی ئەرێنی هەبێت لە کاروبـــاری وەک بواری کۆلۆنیالی نە وەک سەرچاوەیەک بۆ دەستێوەردان لە کاروباری ئابوری دا. سەیر ئەوەیە کە رووداوەکانی شۆڕش بوونە هـــۆی پێکهاتنی وڵاتێکی بەهێزتر و هەروەها وڵاتێک کە لـــە چوارچێوەی کۆمەڵگایەکی تایبەتتر و پیشەسازیتردا بەردەوام بوو.

لـــە باری جوگرافییەوە شـــۆڕش ناوەندیەتیـــی ئینگلیزی لە کاروباری بەریتانیادا چەســـپاند و بناخەی دامەزراندنی بەریتانیای مەزنی دارشـــت. شۆڕش هەروەها گرنگیی لەندەنی دووپات کردەوە. لە دوای ئەمانەش داگیرکردنی ئایرلەند لە ١٦٥٠کاندا بووە هۆی گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی و ئابوری لەو وڵاتەدا کە چەندین واتای گرنگ و درێژخایەنی سیاسی هەبوو.

تا رادەیەکی ئێجگار زۆر شۆڕشـــی بەریتانیا لەســـەر بناخەی بەرگریکـــردن لە مافە مێژوویی و سیاسییەکانی ئەو وڵاتە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بانگەوازانە بۆ رابردوو بوونە هۆی چەند لادانێکی نوێ. ئەو رابردووە شـــکۆپێدراوە بوو بە بناخەی سیستەمێکی حکومەتی لە رەگ و ریشەوە جیاواز، هەرچەندە ئەو سیســـتەمە بە دڵنیاییەوە لەو سیســـتەمە ئەچوو کە لە کاتی فەرمانڕەوایی چارلزی یەکەمدا دەســـەڵاتدار بوو. بەڵام ئەو پرســـیارەی لێرەدا لەوانەیە بکرێت ئەوەیە کە ئایا رووداوەکانی ١٦٤٠ەکان بـــە تەنیـــا و بێ رووداوەکانـــی ١٦٨٨ و ١٦٨٩، واتا چل ســـاڵ دواتر، بە شۆڕشـــگێرانە دەزانرێن؟ بە ئەگەری زۆرەوە وەڵامی کورت «نا»یە. شۆڕشی ١٦٨٨ لەوانەیە بە ئاسانی ئەنجامێکی جیاوازی هەبووبێت. ئەوەی کە ئەو شۆڕشە درێژەی کێشاوە بە واتایەک شۆڕشی ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەی بەریتانیای جێگیر کرد لە پێشەوە لە چارەنووسیدا دیاری نەکرابوو. بەبێ شۆڕشی ١٦٨٨، شۆڕشـــەکەی ناوەڕاستی سەدە بێگومان وەک شکستێک یان پچڕانێک لە بەردەوام بوونی سیاسەتدا ئەبیندرێت.

## شۆڕشی 1688

ئایا خواســـتی بەرزی چارلزی دووهەم و جەیمزی دووهەم دامەزراندنی حکومەتێکی رەها بوو لە ئینگلیزدا؟ هەندێک بەڵگە لە رووداوەکانی ١٦٨٠کاندا مەیلێک بەرەو ئەو ئاراســـتەیە پیشان ئەدەن.

مێژوونووســـان ئاماژە ئەكەن بەو ســـوپا بە بـــەراوورد گەورەی كە جەیمز لە وەڵامی ســـەرهەڵدانی مونماس (monmouth) رێكی خست. لە كاتی دەسەڵاتی جەیمزدا ژمارەیەكی زۆر لە شارە گرنگەكان لە راستیدا لە ژێر فەرمانڕەوایی سوپادا بوون. بێجگە لەم هەنگاوانە جەیمز لە هەوڵدا بوو دەسەڵاتی دادوەریی بخاتە ژێر دەســـتی خۆی و هەر لەو پێناوەدا كۆمەڵێك دادوەری دانا كە بەس لە خزمەتی پاشـــایەتیدا بوون. ئەمە رێگەی بۆ خۆش كرد لە كاتی پێویســـتدا دادگا بڕار بكات بۆ ئەوەی ئەو دادوەرانە دابنێت كە فەرمانەكانی ئەویان بەجێ ئەهێنا.

چارلزی دووهەم دەسەڵاتی یاسایی خۆی زیاتر كرد. بەڵام دووجار تووشی بەرەنگار بوونەوە بوو. یەكەمیان لەلایەن پەرلەمان و بە تایبەتی یاسانامەی پێوەری ١٦٧٣ كە هەموو كاربەدەستانی میریی ناچار ئەكرد بە ئاشـــكرا وەفاداریی خۆیان بە كڵێسەی ئینگلیز رابگەیەنن و دووەمیان لە ١٦٧٨ ئەو كاتەی پەرلەمان بە ئاشكرا لە مافی كاسۆلیكی رۆمی بۆ گەیشتن بە تەختی پاشایەتی نكۆڵی كرد. لە كەیســـی دووەمدا چارلز نەیهێشـــت ئەو كارە ببێت بە یاســـا. چارلز چالاكانە لە دژی هەوڵەكانی پەرلەمان بۆ دوورخستنەوەی براكەی لە جێگرتنەوەی خۆی كاری كرد، ئەویش لە رێگەی لایەنگریی لـــە تۆریـــەكان (tories) لە دژی ویگەكان (whigs). تریەكان حەزیان لە پاشـــایەتییەكی بەهێز و زگماكیی ئەكرد، بەڵام وێگەكان حەزیان لە باڵادەســـتی پەرلەمان بوو. زۆر كەس مەترســـی ئەوەیان هەبوو كە تەنگژەی بێبەشكردن لەوانە بوو شەڕێكی ناوخۆی دیكەی لێ بكەوێتەوە و وێگەكان داوای كۆماری بكەن.

جەیمزیش لەوانەیە لەســـەر بەهێزكردنی دەســـەڵاتی یاسایی خۆی بەردەوام بووبێت، بەڵام تەنیا كاتێك كە ئەو كارە لە خزمەت توریەكان و كڵێســـەی ئینگلیزدا بووبێت. ئایین لەو رێگەدا كۆســـپ بوو. كەڵكوەرگرتنی جەیمز لە دەســـەڵاتی خۆ بۆ پێشخســـتنی بەرژەوەندییەكانی كاسۆلیكی رۆما، بەرهەڵســـتی لایەنەكانی تری لێكەوتەوە. كەســـێكی هاوچەرخ تێبینی كرد ئـــەوەی كە زۆر لە ژێر دەستەكانی قەبوڵیان نەدەكرد تێكەڵاوێك لە «دەسەڵاتی بێ سەروبەر و كاسۆلیكی» بوو. هەرچەندە ١٦٨٨ زۆر جـــار وەك شۆڕشـــێكی ویگەكان چاوی لێدەكرێ، بەڵام زۆر لە لایەنگرانی ئەو شۆڕشـــە هاوپەیمانی شا بوون، تەنیا لە مەسەلەی ئاییندا نەبێت.

جەیمز پاش لەدەستدانی پشتگیری زۆر لە ئەنگلیكەكان، كە هەندێكیان تۆری بوون، لە ١٦٨٧ هەوڵیدا لەگەڵ وێگەكان و بەرهەڵســـتكارانی كڵێســـەی ئەنگلیكان[١٧] ببێتە هاوپەیمان. هەرچەندە زۆر كەس گومانیان هەبوو بەڵام كەســـانیتر ئامادەی هاوكاریی بوون. زۆر لەو كەسانەی حەزیان لە هاوكاری ئەكرد لە ئاســـتێك خوارتر لە چینی هەڵبژاردەی سیاســـی بوون. كەوابوو لە زۆر رووەوە شۆڕشی ١٦٨٨ بزوتنەوەیەكی كۆنەپارێزانە بوو بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتدارە كۆنباوەكان بۆ دەسەڵات لە پارێزگاكاندا. ئەو كەســـانەی بە شـــوێن كاركردن لەگەڵ شادا بوون شایان وەك باشترین هەل بۆ وەدەستخســـتنی سنگ فراوانیی ئایینی چاولێدەكرد. ئەوان بە یارمەتی شا پەرلەمانیان لەلایەنگرانی خۆیان پڕ ئەكرد، پەرلەمانێك كە لە خزمەتی ئامانجی ئەواندا بێت بۆ بەدەســـتهێنانی یاســـایەكی پەرلەمان بۆ چەسپاندنی لێكبوردنی ئایینی ، ئەویش لە رێگەی بەدیهێنانی جاڕنامەی لێخۆشبوونی

شا و ئاواتی شا و مسۆگەرکردنی پەرلەمانێک کە لە قسەی شا دەرنەچێت.

هەموو ئەو بەختانەی جەیمزی دووەم لەوانەبوو لە هاوپەیمانی لەگەڵ وێگەکان و بەرهەڵستکارانی کڵێسەی ئەنگلیکان بە دەستی بهێنایە، لە دەستی چوو. چونکە رێبازەکانی خۆی پێچەوانە کردەوە، ئەویــش بە هۆی ئەوەی بۆی دەرکەوت مێردی کچە گەورەکــەی، مێری، واتا ویلیام کە فەرمانڕەوای کۆمــاری هۆڵەند بوو، بە هێزی ســەربازییەوە بــەرەو ئینگلیز رێکەوتبوو. هــەر وەک دابلیو ئەی ســپێک[١٨] تێبینی ئەکات جەیمزی دووەم لە هەوڵێکدا بۆ دڵنیاکردنی هاوپەیمانە کۆنەکانی، واتە توریەکانی ئەنگلیکان خۆی وەرگەڕاند، بەڵام تەنیا لەوەدا سەرکەوت کە «ساختەچێتی تەواوی خۆی دەربخات» («١٦٨٨: شۆڕشێکی سیاسی،» لە لاپەرە ٦٢ی کتێبی دەیڤید پارکر بە ناوی شۆڕش و نەریتی شۆڕشگێرانە لە رۆژئاوادا، ١٥٦٠ تا ١٩٩١ چاپی بڵاوکەرەوەی راتلیج لە لەندەن و نیویۆرک).

جەیمــزی دووەم هــەل و مەرجێکی دژواری بۆ خۆی دروســت کرد، بــەڵام تەنیا لە چوارچێوەی گەورەتری سیاسەتی ئەوروپا ئەو هەل و مەرجە کوشندە بوو. ویلیامی ئۆرنج[١٩] لە سپتامبری ١٦٨٨ دا بەیاننامەیەکی راگەیاند و جەختی کردە سەر ئەو کێشانەی لە رێی شکاندنی «یاسا، ئازادییەکان (ئیمتیازات) و داب و نەریتەکان،» بە تایبەتی ئەو کێشانەی کاریان ئەکردە سەر ئایین، دەخوڵقان. هەرچۆنێک بێت، بەرژەوەندی ســەرەکی جەیمز رێگەگرتن بوو لە هاوپەیمانی ئینگلیز لەگەڵ لوویی چواردەیەمی فەرەنســا. لویی ئەیتوانی بە ئاســانی بەری داگیرکردنەکەی بگرتایە، بەڵام هێزەکانی لە جێگەیەک لە نزیک ســنووری کۆماری هۆلەند بۆ جێگەیەک کە نزیکەی دوو ســەد مایل دوورتر بــوو گوێزرایەوە. هێزی دەریاییش، کە ئەیتوانی رێگەی لــە داگیرکرنەکە بگرتایە، رەوانەی دەریای ناوەڕاست کران بۆ ئەوەی گوشار بخەنە سەر پاپاکان.

هەندێک سەرنج بۆ ئەو راستییە رادەکێشن کە لەوانەیە هێزەکانی ویلیام بۆ شکاندنی جەیمز بەس نەبووبێت. ئەگەر ئەم شــیکارییە راست بێت. ئەگەری ئەوە هەیە جەیمز دەرفەتی بەرەنگاربوونەوە و شکستدانی ویلیامی لە دەست دابێت. تەنانەت ئەگەر جەیمز شکستی بخواردایە، هێشتا ئەگەری ئەوە هەبوو بە رووبەرووبوونەوە لەگەڵ ویلیام ســەربکەوتایە. یەکێک لە ئەگەرەکان ئەوەیە کە ئەو گومانی لە فەرماندەرێتی ســوپای خۆی هەبووبێت. بــە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە لۆرد چێرچیل، دوکی[٢٠] داهاتووی مارڵبۆرۆ[٢١]، لایەنی ویلیامی گرت، ئەو گومانە لە مێشکدا ئەگونجێت.

هەرچۆنێک بێت، لە دیســامبەری ١٦٨٨دا ویلیام داوای لە جەیمز کرد لە لەندەن بچێتە دەرە و ئەویش بە گوێی کرد و چەند رۆژ دواتر رای کرد بۆ فەرەنسا. لە شەوی کریسمەسدا هاوتاکان چاویان بە یەک کەوت و داوایان لە ویلیام کرد بانگهێشتی کۆنگرەیەک بکات و لە هەمان کاتدا فەرمانرەوایی وڵات بکات. لە راستیدا ویلیام بوو بە شا بەڵام رەنگی فەرمیی بوونی بە خۆوە نەگرت تا ئەو کاتەی لە ١٣ی فیۆرییەی ١٦٨٩ پێشنیاری پاشایەتی قەبوڵ کرد.

لە ١٦٨٥ جەیمز هیچ کاتێکی بە دەســتەوە نەبوو کە دڵی گەلی ژێر دەســتەی خۆی برەنجێنێت و ئەوان لە دژی ســەرهەڵدانی مونماوس پشتگیرییان کرد. لە دەوروپشتی ١٦٨٨ زۆر لە لایەنگرانی

جەیمز ئیتر ئامادە نەبوون گەڕانەوەی بێ مەرجی ئەو قەبووڵ بکەن. جەیمز لەلایەن خۆیەوە لەگەڵ مەرجەکان نەدەسازا.

ئەگەر ڕێکەوتنێکی گشتی هەبوایە کە ویلیام ئەبێ جێگەی جەیمز وەربگرێت، تەنیا ژمارەیەکی کەم چالاکانە لە رووداوە شۆڕشگێڕییەکاندا بەشدارییان ئەکرد. ئەو کەسانەی بۆ کۆنگرە هەڵبژێردران بە گشتی سەرکۆنەی ئەو شتەیان کرد کە بە کارە بێ سەروبەرەکانی جەیمز چاویان لێ ئەکرد و داوای دڵنیاکردنەوەیان ئەکرد لەوەی کە شاکانی داهاتوو نەتوانن بەو جۆرە هەڵسوکەوت بکەن. ئەوانەی کە پێشــتر لەگەڵ شا هاوکارییان کردبوو دواتر بۆیان دەرکەوت کە لە هاوکارییەکان دژی خۆیان کەڵک وەرگیرا.

بەشــداربووان لە کۆنگرەدا لەسەر ئەوەی چی بکەن تووشـــی دووبەرەکی بوون. ژمارەیەکی کەم لەســەر ئەو بڕوایە بوون کە جەیمز هێشــتا تاج و تەختی پاشــایەتی لە ڕێــی مافێکی خواییەوە بەڕێــوە دەبرد و ئەبێ داوای لێ بکرێت دەســت بکاتــەوە بە پاشــایەتی. کۆمەڵێکی بچووکی تر، لایەنگری کۆمار بوون. زۆرینەی بەشداربووان دانیان نا بە بوونی گیروگرفتێکی بنچینەیی و بڕیاردان لە باتی پاشــایەتی ڕەها یاخود کۆمار پاشــایەتی ســنوردار هەڵبژێرن. جاڕنامەی مافەکان سیانزە هەنگاوی جەیمزی نایاسایی ڕاگەیاند و سوور بوو لەسەر دانانی سنووری پەرلەمانیی لەسەر ئازادی کاروکردەوەی شا. گۆڕانکارییەکانی ناو سوێندی مەراسیمی تاجدانان ئەو هەڵوێستە پیشان ئەدەن. جەیمز سوێندی خوارد ئەو یاسایە «بپارێزێ و بیدات» کە «شاکانی ئینگلیز پێیان دابوو» ویلیام و مێری ســوێندیان خوارد «فەرمانڕەوایی بکەن.. بە گوێرەی ئەو یاساگەلەی لە پەرلەماندا ڕێکەوتن هەیە لە سەریان...»

ڕێگە چارەی جۆراوجۆر، لەوانیش جێنشــینی تەختی پاشــایەتی یان کردنی مێری بە شــاژن، پێشنیار کران، بەڵام هەڕەشەی ویلیام بۆ دەرچوون لە وڵات هاوڕێ لەگەڵ هێزەکانیدا ئەگەر تەخت و تاجی پێ نەدرێت کۆتایی بە باسەکە هێنا. ئەو لەگەڵ ژنەکەی پێکەوە بوون بە فەرمانڕەوا. پەرلەمان لە ڕێی سەربەخۆنەکردنی ئەوان لە ڕووی داراییەوە، سنوورداربوونی پاشایەتی مسۆگەر کرد.

ئەوانەی کە شۆڕشـــی ١٦٨٨ یان ئەنجام دا، ژمارەیەک شۆڕشــگێڕی دوودڵ بوون، هەروەک چۆن دابلیو. ئەی. ســپێک لــە کتێبەکەیدا لە بارەی ١٦٨٨ بە شۆڕشــگێڕانی دوودڵ ناویان لێدەبات. بە واتایەک، ئەو شۆڕشگێڕانە هێڵە سەرەکییەکانی شۆڕشی ناوەڕاستی سەدەی بەریتانیایان درێژە پێدا و بەهێزیان کردن و لەسەر جێگەی پەرلەمان لە سیستەمی حکومەتی بەریتانیدا پێداگرییان کرد. بە واتایەکی تر، ئەوان کاردانەوەیان کرد لەســەر ئەو شتەی شۆڕشی بەریتانیا ئەنجامی دابوو و لەسەر پاراستنی پەرلەمانی لۆردەکان وەک جێگەی دەسەڵاتی سیاسی و کڵێسەی ئەنگلیکان وەک کڵێسەی چەســپاو کاریان دەکرد. هەروەها بە ڕێگەگرتن لە گوشــار لە خوارەوە بۆ تێپەڕنەبوونی شۆڕش لەو ئاســتەی ئەوان ئەیانویست، کاریان دەکرد. سەیر ئەوەیە ئەوان هەروەها لە دژی هەڕەشە لەسەرەوە، لە دژی هەوڵەکانی جەیمزی دووەم بۆ گۆڕینی پاشایەتی سنوردار بۆ پاشایەتی ڕەها و بەتایبەتی لە دژی هەوڵەکانی ئەو بۆ دەستەبەرکردنی پلە و پایەی یەکسان بۆ هاوڕێ کاسۆلیکەکانی کاردانەوەیان

هەبوو. ئەمەی دواییان وەک هەوڵێکی دەســـت ئەنقەســـت چاوی لێدەکرا بۆ گەڕاندنەوەی کڵێســـەی چەسپاو بۆ رۆما. ئەگەرچی توریەکان و وێگەکان بە شێوەی کاتی بوونە هاوپەیمان بۆ رێگەگرتن لە جەیمز لە لاوازکردنی دەســـتووری دێرین، بەڵام پاش شۆڕش هەلومەرجەکە بۆ وێگەکان باشتر بوو، چونکە ئەوان ئامادەبوون شۆڕش و ئەنجامەکانی قبووڵ بکەن.

## دوا ووتە:

بەر لە کۆتایی ســـەدەی هەژدە و بە دڵنیاییەوە لە دوای جووتە راتەکانەکانی شۆڕشـــی ئەمریکا و شۆڕشی فەرەنســـا، بەریتانیەکان لە دۆخێکی وەهادابوون کە ئەزموونە شۆڕشگێرییەکانی خۆیان لەبیربکەن. سەدەی نۆزدەیەم بە دیمەنی دووبارەکراوی شۆڕش لە فەرنسا و بزوتنەوەی شۆڕشگێری بەربـــڵاو لە ١٨٤٨، تەنیا ئـــەو لەبیرچوونەوەیەی بەهێزتر کرد. کاروبـــاری ویلکەکان (Wilkes) لە ١٧٦٠ەکاندا کە کڵێشەگەلی گەندەڵی پەرلەمان و بانگەوازی بۆ چاکسازیی بەرزکردەوە، لە چاکسازیی مەزنی ١٨٣٢ دا دەنگی دایەوە. لە هەر دوو کەیســـەکەدا حکومەت ئەوەندە بەهێز بوو کە لە بەردەم گوشـــاری کۆمەڵاندا خۆی رابگرێت. لە کەیسی دووهەمدا لەوانەیە لە ژێر کارتێکردنی شۆڕشی ١٨٣٠ فەرەنســـا و هەروەها خۆپیشـــاندانە گەورەکانی بەریتانیادا، حکوومەت ئەو چاکسازییانەی پەسەند کـــرد کە زۆر لە گلێی و گازندەکانی ســـەبارەت بە کارکردن بە سیاســـەتەکانی بەریتانیا لەوکاتەدا ســـڕییەوە. هەرچۆنێک بێت، هـــەر چەندە دوور یان نزیک بووبێتن لە بووژانەوەی شـــۆڕش، خاڵی ســـەرەکی ئەوەیە کە تەنانەت بەریتانیا، کە شانازی بە سەقامگیری سیاسی خۆی ئەکرد، لەوانەیە جارێکی تر پەنای بردبێت بۆ ئامرازە شۆڕشگێرییەکانی سیاسەت.

بەرهەمی رووداوە شۆڕشـــگێڕییەکانی ســـەدەی حەڤدە کە پاشـــایەتییەکی ســـنووردار لەسەر بنچینـــەی بڵاونامە و بەڵگەنامە دەســـتوورییەکانی مافەکان بوو، کاریگەرییەکی بەهێزی لەســـەر ســـەدەی هەژدە هەبوو. فەیلەســـۆفەکان لەسەر سروشتی نموونەیی سیســـتەمی سیاسی ئینگلیز و دەرفەتەکانی بەشـــداریی بەربڵاو لە کاروباری سیاســـیدا، بە تایبەتی لە ئاســـتی خۆجێییدا بە چاکی ئەدوێن. ڤۆڵتێر (Voltaire) بە تایبەتی وڵاتی ئینگلیز لەگەڵ فەرەنســـا لە رووی سیستەمی سیاســـی چاکتر و کۆمەڵگای کراوەتری بەراورد ئەکات. کۆلۆنیەکانی بەریتانیا لە ئەمریکای باکوور لە شۆڕشـــی ئەمریکادا خەباتیان کرد بۆ ئەوەی سیســـتەمێکی سیاســـی دابمەزرێنن کە هەرچەندە شای نەبوو و زۆر دیموکراتیکتر بوون، بەڵام لە زۆر رووەوە لە سیستەمی سیاسی بەریتانیا ئەچوو. هەندێک لە شـــرۆڤەکاران وای بۆ دەچن کە شۆڕشـــی ئەمریکا جگە لە پەســـەندکردنی سیستەمێک کە تاڕادەیەکی زۆر لە سیســـتەمی بەریتانیاوە هەڵهێنجرابوو، هیچی تری پێنەبوو. ئەوەی کە ئەمە بە بووژانەوە خوێناوییەکەی لەشـــەڕی ناوخۆی ئەمریکا و دەنگدانەوە توندوتیژەکەی لە بزوتنەوەی مافە مەدەنیەکان لە ١٩٥٠کان و ١٩٦٠ە کاندا، کۆتایی شۆڕشـــی ئەمریکا چیرۆکێک نییە کە بتوانین لێـــرەدا باســـی بکەین. ناوەڕۆکی مەســـەلەکە ئەوەیە کە ئەنجامەکانی رووداوە شۆڕشـــگێرییەکانی ســـەدەی حەڤدەی ئینگلیز لەو سەدەیە و لەو وڵاتە تێپەڕ بوون. شۆڕشی بەریتانیا یەکەم شۆڕشی

مۆدێرن نەبوو بەڵام لە ڕێگەگەلێکی هەســـتپێکراوەوە یارمەتیدەر بوو لە داڕشـــتنی بناخەکانی دوو شۆڕشـــی سەرەکی و ئەو دوو شۆڕشەش پێکهێنەری بیروڕا باوەکان بوون سەبارەت بە ئامرازەکان و ئامانجەکانی شـــۆڕش تا شۆڕشی ١٩١٧ی ڕوسیا. هەر چۆنێک بێت، بیرکردنەوە لە ڕوودانی شۆڕشی ئەمریکا بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕوودانی شۆڕشـــی بەریتانیا بەر لەو شۆڕشە دژوارە. شۆڕشی فەرانسا نەک هەر شۆڕشـــی بەریتانیا بەڵکو چەند ســـەرچاوەی دیکەشی هەبوو، بەڵام سەرباری ئەمەش زۆر قەرزداری شۆڕشی بەریتانیا بوو.

ئەوەی کە شۆڕشـــی بەریتانیا لە شۆڕشـــی فەرەنســـا جیا دەکاتەوە، پێداگریی لەسەر پاراستن یان هێشـــتنەوەیە. بەرهەمی ڕووداوەکانی سەدەی حەڤدەیەمی ئینگلیز پاشایەتییەکی سنورداربوو، پاشایەتییەک کە لە ماوەی دوو سەدەی دواییدا هەنگاو بە هەنگاو بوو بە پاشایەتیەکی دەستووری و لە زۆر ڕووەوە بوو بە شـــتێک کە بە تەواوی جیاواز بوو لەو شـــتەی بەر لە شۆڕشـــی بەریتانیا بوونـــی هەبوو. ئەوە تەنیا بە واتای هەوڵدان بوو بۆ هێشـــتنەوەی شـــتێکی پیـــرۆز بە پێی داب و نەریتە کۆنباوەکان و بێ مەیلی بۆ تاقیکردنەوەی هەرشتێکی نوێ کە زۆر زۆر داهێنەرانە بوو و بە زۆری شۆڕشی بەریتانیای وەک نموونەیەکی زۆر باش لە نێوانرۆیی هێشتەوە. بەشداربووان هەستی شۆڕشـــگێرانەیان هەبوو بەڵام لە هەڵبژاردنی ڕێگەکانی ئەنجامدانی شـــۆڕش وریا و نێوانڕۆ بوون. بۆ دڵنیابوون ئەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە لە شۆڕشـــی بەریتانیادا کەســـانێک هەبوون ئەیانویست لە سیاســـەت و هەروەها لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا هەنگاوی زۆر زیاتر بنێن، بەڵام ئەوانەی لەســـەر دەســـەڵات بوون بۆ کەمکردنەوەی کارتێکردنی ئەوان تووشی کێشەیەکی ئەوتۆ نەبوون. لە شۆڕشی فەڕەنسا لە کاتێکدا زۆر کەس بە پاشایەتییەکی دەستووری دڵشاد بوون، بەڵام نەکرا بە دڵشادییەوە پاشایەتییەک پێکبهێنرێت. ئەمە ســـەرەتایەکی خستە بەردەم ئەوانەی هیواداربوون سیستەمێکی سیاسی نوێ و بە ناو زۆر چاکتر دابمەزرێنن. گوشاری شەڕ و شەڕی ناوخۆ لە فەرەنسا بەشداربووانی والێکرد لە ترس و تۆقاندن وەک جۆرێکی توندوتیژ لە ئەندازیاریی کۆمەڵایەتی کەڵک وەربگرن.

مێژووی شـــۆڕش، لانیکەم لە ســـەدەی هەژدەیەمـــەوە، ڕاڕاییەکی لە نێـــوان ئامانجە بە زۆری کردەخوازانەکان و هەوڵە زیاتر خەیاڵی و گشـــتگرەکان پیشـــان داوە. بە گشتی، شۆڕشەکان مەیل بۆ هەر دوولایان پیشـــان داوە. ئەنجامی شۆڕشـــەکان بەند بووە بەوەی کام مەیل دەســـتی باڵاتری هەبووە. شۆڕشی بەریتانیا لە ناوەڕاستی سەدەدا نەیتوانی ڕێگەچارەیەکی مامناوەندی بدۆزێتەوە و بۆ سیستەمێکی دیکتاتوریی ســـەرکوتکار گۆڕا. بەڵام گرنگتر ئەوەیە کە میراتێکی بەجێهێشت کە ئەکرێ شۆڕشـــی ١٦٨٨ بۆ ئەو میراتە بگەڕێنینەوە و شۆڕشـــی ١٦٨٨ لە ئاکامەکانی ئەو میراتە بۆ خۆی کەڵک وەربگرێت. ئەو میراتە کە لە لایەن شۆڕشـــی ١٦٨٨ وە گۆڕانکاری بەســـەرداهات، دواتر بناخەی بۆ ماوەیەکی درێژ لە گەشەسەندنی شۆڕشگێڕانە دامەزراند.

## پەراوێزەکان:

1-Anglican
2-Puritan
3-babeas corpus
4-presbyterian

ئەندامی کڵێســەی پرێســبەتێری کە لقێکە لە کڵێســەی پرۆتستانتی مەســیحی. ئەم کڵێسەیە ئێستا کڵێسەی نیشتمانیی سکاتلەندە و یەکێکە لە گەورەترین کڵێسەکانی ئەمریکا. (وەرگێڕ)

5-short parliament
6-long parliament
7-a triennial Act
8-thomas wentworth, Earl of Strafford

ئرل سەر ناوێکی ئینگلیزییە وەک ئاغا لە کوردیدا (وەرگێڕ)

9-house of commons
10-revisionist
11-oliver Cromwell
12-solemn league and covenant
13-independents
14-sectaries

لێرەدا مەبەست ئەو پرۆتستانانەیە کە لە کڵێسەی کاسۆلیک هەڵگەڕاونەتەوە.(وەرگێڕ)

15-collective ownership of property
16-rump parliament
17-Dissenters
18-W.A. Speck
19-William of orange
20-duke
21-marlborough

## سەرچاوە:

Revolutions in world history
By Michael d. Richards
Published 2004 by routledge, new york &London

# پێشەکیی ئەلبێر کامۆ بۆ کتێبی مرۆڤی یاخی

لە ئینگلیزییەوە: ئازاد بەرزنجی

تاوان هەیە لە هەواو هەوەسەوە سەرچاوە دەگرێت و هەشە لە لۆجیکەوە. ئەو سنوورەی لە یەکتریان جیا دەکاتەوە ڕوون نییە. بەڵام یاساکانی سزادان بەسوودوەرگرتن لە چەمکی تەگبیری پێشوەخت، جیاوازی لە نێوانیاندا دەکات. ئێمە ئێستا لە سەردەمی تەگبیری پێشوەخت و تاوانی تەواوەتیدا دەژین. تاوانبارەکانمان چیدی ئەو منداڵە بێدەسەڵاتانە نین کە خۆشەویستییان دەکرد بە بیانوو. بە پێچەوانەوە، ئەوان باڵقن و بەهانەی تەواوی خۆیان هەیە: فەلسەفە، کە دەکرێ بۆ هەموو شتێک بەکاربهێنرێ، تەنانەت بۆ گۆڕینی بکوژەکان بە داوەر.

هێتکلیف لە ((بەرزاییەکانی وێزەرینگ))دا، بۆ ئەوەی بگات بە ((کاتی))، ئامادەیە چی بنیادەمی سەرزەوی هەیە بیانکوژێت. بەڵام ئەو هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە کە کوشتن بەشتێکی مەعقول بزانێت، یان وای دابنێت کە لە ڕووی تیۆرییەوە شایانی بەرگری لێکردنە. ئەو تاوان ئەنجام دەدات و تیۆرییەکەی لێرەدا کۆتایی دێت. ئەمەش پێویستیی بە خۆشەویستییەکی بەهێزو کەسێتییەکی بەهێزە. جا لەبەرئەوەی خۆشەویستیی بەهێز شتێکی دەگمەنە، ئەمجۆرە کوشتنانەش بەدەگمەن ڕوودەدەن. کاتێکیش ڕوودەدەن مۆرکێکی ملهوڕانە بەخۆیانەوە دەگرن. بەڵام هەرئەوەندە مرۆڤێک لە سۆنگەی نەبوونی کەسێتییەوە پەنا دەباتە بەر تیۆرییەک، لەوساتەوەی مۆرکێکی ئەقڵانی بە تاوانەکەی دەبەخشێت، ئیدی وەکو ئەقڵ خۆی لقوپۆپی لێ دەبێتەوەو هەموو شێوەکانی ئەنجامگیریی لۆجیکییانە لەخۆدەگرێت. وەکو ئەوەی لێ دێت هاوارێکی تاک و تەنیا بووبێت، بەڵام

ئێستا وەکو زانست بووە بەشتێکی گشتگیر. تا دوێنێ دادگایی دەکرا، کەچی ئێستا خۆی بووە بە یاسا.

ئەمە مایەی تووڕەبوونمان نییە لێرەدا، چونکە ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە قبوولکردنی (یان پەیبردن بە) باری ڕاستەقینەی ئەمڕۆیە، کە ئەویش تاوانی کوشتنی لۆجیکییانەیە، و وردبوونەوەیە لە بیانووەکانی. هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لەو سەردەمەی کە من تیا دەژیم. ڕەنگە کەسێک بڵێت سەردەمێک (لەماوەی پەنجا ساڵدا) حەفتا ملیۆن مرۆڤی دەربەدەر یان دیل کردبێت و یاخود کوشتبێت پێویستە بێ سێ و دوو مەحکوم بکرێ. بەڵام خۆ پێویستە لە گوناهەکەی بگەین. لە سەردەمە بەراییە سادەکاندا، کاتێ ستەمکارێک لە پێناوی بەدەستهێنانی شکۆمەندیی زیاتردا بۆخۆی، شارەکانی لەگەڵ زەویدا تەخت دەکرد، کاتێ کۆیلەی زنجیر لە ملی بەستراو بە عەرەبانەی فەرمانڕەوای سەرکەوتووەوە، بەناو ئەو شەقامانەدا ڕادەکێشرا کە ئاهەنگی سەرکەوتنیان تیا سازدەکرا، کاتێ بە بەرچاوی حەشاماتی خەڵکەوە دوژمنان فڕێدەدرانە بەردەمی گیانەوەرە دڕندەکان، لە ئاست تاوانی سادەی لەمجۆرەدا، دەشیا ویژدان نەجووڵێت و حوکمەکەش ڕوون و ئاشکرا بێت، بەڵام دروستکردنی ئۆردووگای کۆیلە لە ژێر ئاڵای ئازادیدا و پاساوهێنانەوە بۆ قەسابخانەی مرۆیی بەناوی خۆشەویستی بۆ مرۆڤەوە، یان بەناوی حەزەوە بۆ گەیشتن بە مۆرڤایەتییەکی باڵا، حوکمدان تووشی ئیفلیجی دەکات. لە ڕۆژگارێکدا کە تیایدا تاوان بەرگی بەرائەت دەپۆشێت، ئەمەش لەڕێی شێوازێکی پێچاوپێچی هەڵاوگێڕاوی تایبەت بەم چاخە، ئەوە بەرائەتە کە داوای لێ دەکرێ پاساو بۆخۆی بهێنێتەوە. ئامانجی ئەم نووسینەش قبوولکردن و لێکۆڵینەوەیە لەم ماجەرا سەیرە.

مەسەلەکە بریتیە لەوەی کە ئاخۆ کاتێک بەرائەت دەستبەکار دەبێت، لە توانایدا دەبێت خۆی لە تاوانی کوشتن بپارێزێت یان نا؟ ئێمە بە تەنها لە سەردەمی خۆماندا و لەناو ئەو خەڵکەدا کە دەوریان داوین، دەتوانین دەستبەکاربین. تا ئەوکاتەی نەشزانین ئایا مافی کوشتنی هاوڕەگەزەکانی خۆمان و پاساوهێنانەوە بۆ کوشتنیان هەیە یان نا، ناتوانین هیچ بکەین.

لەبەرئەوەی هەموو کردارێکیش لەم ڕۆژگارەماندا بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەبێتە مایەی کوشتن، بۆیە تا ناتوانین هیچ بکەین تا نەزانین مافی ئەنجامدانی تاوانی کوشتنمان هەیەو بۆچی ئەو مافەمان هەیە.

مەسەلەکە بریتی نییە لەوەی بگەڕێینەوە بۆ ئەسڵی شتەکان، بەڵکو ئەوەیە کە بەرەچاوکردنی ئەوەی کە دونیا ئەوەیە کە هەیە، ئێمە دەبێ چۆن چۆنی تیایدا بژین. لە سەردەمی ڕەتکردنەوەدا، لەوانەیە لێپێچانەوە لە مەسەلەی خۆکوشتن سوودێکی هەبووبێت. بەڵام لە سەردەمی ئایدیۆلۆجیاکاندا پێویستە سەبارەت بە تاوانی کوشتن بڕیاری خۆمان بدەین. ئەگەر کوشتنی مرۆڤ بنەمای ئەقڵانیی هەبێت، کەواتە چ سەردەمەکەمان و چ خۆشمان بایەخی خۆمان هەیە. خۆئەگەر بنەمای لەو جۆرەش لەگۆڕێ نەبێت، کەواتە ئێمە نوغرۆی نێو دەریای شێتین، هیچ دەروویەک شک نابەین جگە لەوەی کە دەبێ یان مانایەک بدۆزینەوەو یانیش دەسبەرداری هەموو شتێک بین. هەرچۆنێک بێت پێویستە

لەسەرمان وەڵامێکی ڕوونی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە ئەم سەردەمە جەنجاڵەمان دەیخاتە بەردەممان، لەبەرئەوەی ئێمە لەبەردەم لێپرســـینەوەداین. ســـی ساڵ لەمەوبەر، پێش بڕیاری ئەنجامدانی تاوانی کوشتن وا ڕاهاتبووین زۆر شت ڕەت بکەینەوە، تا دەگاتە ڕەتکردنەوەی خۆشمان لەڕێی خۆکوشتنەوە. خوا درۆیە، هەموو دونیا درۆیە (بە خۆشمەوە)، لەبەرئەوە من مردن هەڵدەبژێرم: ئەوکات خۆکوشتن کرۆکی مەسەلەکە بوو. بەڵام ئایدیۆلۆژیا، کە دیاردەیەکی هاوچەرخە، بە تەنها خەڵک ڕەت دەکاتەوە، لەبەرئەوەی ئەوان بە درۆ دەزانێت. ئیدی ئەنجامی ئەمەش کوشتنی مرۆڤەکانە. هەموو سەحەرێک، کۆمەڵێک بکوژی دەمامکدار دەخزێنە زیندانێکەوە. ئەمڕۆ کرۆکی مەسەلەکە کوشتنی مرۆڤە.

ئەم دوو بیرۆکەیە یەکانگیرن. یان چاکتر وایە بڵێین لەگەڵ ئێمەدا دەستەوئێخەن و بەڕادەیەک کە لە تواناماندا نەماوە کێشەکانی خۆمان هەڵبژێرین. ئەوان ئێمە هەڵدەبژێرن، یەک لە دوای یەک. کەواتە با لێگەڕێین هەڵبژێردرێین.

ئامانجـــی ئـــەم لێکۆڵینەوەیـــە بەدواداچوونـــی تاوانی کوشـــتن و یاخیبوونە، واتە ئەو شـــێوە بیرکردنەوەیەی کە بە خۆکوشتن و بیرۆکەی پووچی (ئەبسێرد) دەستی پێ کرد.

* * *

بەڵام ئەم شـــێوە بیرکردنەوەیە لە ئێســـتادا تەنهـــا یەک چەمکی لێ دەکەوێتـــەوە، کە ئەویش چەمکـــی پووچی (یـــان ئەبســـێرد)ە. چەمکـــی پووچییـــش، خۆی لە خۆیـــدا، بە تەنهـــا کاتێک ناودژێتی (Contradiction)ی لێ دەکەوێتەوە کە کێشـــەی کوشتن لە ئارادا بێت. کەسێک دەیەوێت یاســـایەک بۆ ڕەفتار لە هەستکردن بە پووچییەوە هەڵبهێنجێت، تاوانی کوشتن وەکو مەسەلەیەکی کەمبایەخ و ڕێپێدراو پیشـــان دەدات. ئەگەر باوەڕمان بە هیچ شـــتێک نەبێت، ئەگەر هیچ شـــتێک مانای نەبێت، ئەگەر هیچ شـــتێک لامان بەهای نەبوو، ئەوا هەموو شـــتێک ڕێپێدراو دەبێت و هیچ شـــتێک بایەخی نابێت. نە لەگەڵ شتێکدا دەبین و نەدژی دەبین. بکوژ نە لەسەر هەق دەبێت و نە ناهەق. مرۆڤ ئازاد دەبێت لەوەدا کە ئاگری کوورەی سووتاندنی مرۆڤ خۆش بکات یان ژیانی خۆی بـــۆ خزمەتکردنـــی گەڕو گولەکان تەرخان بکات. خراپەو چاکەش بـــە تەنها بریتی دەبن لە ڕێکەوت یـــان هەواو هـــەوەس. کەواتە لەو حاڵەتەدا دەتوانین بڕیار بدەین کـــە هیچ کارو کردەوەیەک ئەنجام نەدەین و ئەم بڕیارەش دەبێتە مایەی ئەوەی چاو لە کوشـــتنی خەڵک بپۆشـــین، یان حەســـرەت بۆ ناکامڵییەکانی مرۆڤ بخۆین. یان دەکرێ بە تەنیا چاودێرێکی بێلایەن و خەمگین بین و هیچ کارو کردەوەیەک ئەنجام نەدەین. لەم حاڵەتدا ژیانی مرۆڤ جگە لە کەرەسەیەک بۆ یاری هیچی دی نابێت. دواجار لەوانەشە بڕیار بدەین هەندێ کار ئەنجام بدەین کە هەروا هەڕەمەکی نەبن. لەم حاڵەتەشدا، مادامەکـــی بەهایەکی باڵا نییە تا کارو کردەوەکانمان ئاڕاســـتە بـــکات، ڕوو دەکەینە ئامانجێک کە کاریگەرییەکی خێرای هەبێت. مادامەکی هیچ شـــتێکیش نییە ڕاســـت بێت یان درۆ، چاک بێت یان خراپ، ئەوە دەبێتە پرنســـیپمان کە پیشـــانی بدەین ئێمە لە هەموو کەسێک کاریگەرترین، یان با

بڵێین بەهێزترین. ئیدی ئەودەمەش چیتر دونیا بۆ هەق و ناهەق دابەش ناکرێ، بەڵکو بۆ سەردارو کۆیلـــە. بەمجۆرە، ئێمە لە قووڵایی ئینکار(یان ڕەتکردنەوە)و نیهیلیزمدا هەر ڕێگایەک بگرینە بەر، تاوانی کوشتن پێگەیەکی نایابی خۆی دەبێت.

کەواتە ئەگەر هەڵوێســـتی نیهیلیستیانە بگرینەبەر، دەبێ ئامادە بین تاوانی کوشتنیش ئەنجام بدەین و بەمجۆرەش لۆجیک بەسەر ئەو دوودڵییانەماندا زاڵ بکەین کە بە شتێکی وەهمییان لە قەڵەم دەدەین. بێگومان هەندێ ســـازش هەن کە پێویستن. بەڵام تێکڕا، ئەگەر لە ڕووی ئەزموونەوە حوکم بدەین، ئەو پێویســـتبوونە لەوە کەمترە کە دەیهێنینە بەرچاوی خۆمان. پاشان هەروەکو ڕۆژانەش ئەوە ڕوودەدات، بەردەوام دەشێ ناچار بین بەو تاوانی کوشتنانەی ئەنجام دەدرێن قایل بین. بەمجۆرە هەموو شتێک لایەنی لۆجیکی بەخۆوە دەگرێت، ئەگەر لۆجیک بەڕاستی قەناعەتپێکەر بێت.

بەڵام لۆجیک قەناعەتپێکەر نابێت گەر ســـەرەتا تاوانی کوشـــتن بە ڕێپێدراو بزانێت و پاشان بە ڕێپێنەدراو. لەبەرئەوەی شیکردنەوەی ئەبسێردیستانە، دوای پیشاندانی ئەوەی کوشتن مەسەلەیەکی بێبایەخـــە، دواجـــار لە گرنگترین ئەنجامگیریی خۆیدا، کوشـــتن مەحکوم دەکات. لە ڕاســـتیدا دوا ئەنجامگیری پرۆســـەی ئەبسێردیســـتی بریتیە لە ڕەتکردنەوەی خۆکوشتن و بەردەوامبوون لەسەر ڕووبەڕووبوونـــەوەی نائومێدانەی نێوان پرســـیارکردنی مرۆڤ و بێدەنگیی دونیا. خۆکوشـــتن واتە کۆتاییهێنان بەم ڕووبەڕووبوونەوەیە. هەڵوێســـتی ئەبسێردیســـتانەش دەزانێت کە ناتوانێت بەبێ وێرانکردنی بنەماکانی خۆی جەخت لەسەر خۆکوشتن بکاتەوە. هەڵوێستی ئەبسێردیستانە ئەنجامێکی لەمجۆرە بە ڕاکردن یان قوتاربوون لە قەڵەم دەدات. بەڵام ئاشکرایە کە ئەنجامگیریی ئەبسێردیستانە بەگوێرەی هەمان ئەنجام، ژیانی مرۆیی بە تاقە چاکەی پێویست دەزانێت، لەبەرئەوەی ئەوە ژیانە کە ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیە دەسازێنێت، بەبێ ژیان گرەوی ئەبسێردیستانە توانای بەردەوامبوونی نییە. بۆ ئەوەی بشـــگوترێ ژیان ئەبســـێرد (پووچ)ە، مرۆڤ دەبێ زیندوو بێت. کەواتە چۆن دەکرێ بەبێ گوێدانە مەیلی مرۆڤ بۆ ئاسوودەیی، ســـوودە تایبەتیەکانی ئەم ئەنجامگیرییە بەدەست بهێنین؟ کاتێک ژیان بە چاکەی پێویســـت ناســـێنرا، ئەوە هەموو ئادەمیزاد دەگرێتەوە. بۆیە ئێمە کاتێک مۆرکی لۆجیکی لە خۆکوشتن دەسەنینەوە، ناتوانین ئەو مۆرکە بە کوشتن ببەخشین. ئەو هۆشەی کە پڕە لە هزری پووچی، بێگومان ئەو کوشتنە دەرک دەکات کە لە ئەنجامی قەزاو قەدەرەوە هاتووە، بەڵام ئەو کوشـــتنە قبووڵ ناکات کە لە ئەنجامگیرییەوە سەرچاوە دەگرێت. (واتە لە ئەنجامگیریی لۆجیکیانەوە- و. کوردی). لەبەرئەوەی لە ڕوانگەی ڕووبەڕووبوونەوەوە کوشـــتن و خۆکوشـــتن یەک شتن، یان دەبێ هەردووکیان قبووڵ بکەین و یاخود هەردووکیان ڕەت بکەینەوە.

هەربۆیە نیهیلیزمی ڕەها، کە دەیەوێت پاکانە بۆ خۆکوشتن بکات زۆر بە ئاسانی بەرەو کوشتنی لۆجیکـــی دەچێت. هەربۆیە، ئـــەم ڕۆژگارەی ئێمە کەوا بە خوێنســـاردییەوە ئەوەی پێ قبووڵە کە کوشـــتن پاکانەی خۆی هەیە، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بێباکییەی لەئارادایە ســـەبارەت بە ژیان، ئەمەش خۆی لە خۆیدا نیشـــانەیەکە لە نیشانەکانی نیهیلیزم. گومان لەوەدا نییە کە سەردەمانێک

هەبوون خۆشەویستیی ژیان بەڕادەیەک بەهێزبووە بووەتە هۆی زیادەڕەوی لە تاوانكاریدا. بەڵام ئەم زیادەڕەوییانە بەرەنجامی لەزەتێكی ترسـناک بوون، نەک بەرەنجامی سیستمێكی ڕۆژانەی یەكڕەوت كە لەسـەر بنەمای لۆجیكێكی ناچاری دامەزرابێت، كە هەموو شـتەكان بەیەكچاو سـەیر دەكات. ئەم لۆجیكە بەڕادەیەک بەهای خۆكوشـتنی بەرزكردەوە، تاگەیشـتە چڵەپۆپە، واتە ڕەوایەتیدان بە كوشـتن. هەروەک چۆن ئەمە لە خۆكوشـتنی دەستەجەمعیدا گەیشـتە ترۆپک. زەقترین گەواهیی ئەمەش ئەو قیامەتە بوو كە لە سـاڵی ١٩٤٥ دا لەسـەر دەسـتی هیتلەر هاتە ئاراوە. خۆوێرانكردن بەلای ئەو دێوانانەوە هیچ مانایەكی نەدەبەخشی كە لە پەناگەكانیاندا خۆیان بۆ مردن یان سەروەری ئامادە كردبوو. گرنگ ئەوە بوو بەتەنیا نەمرن و بەڵكو لە هەمانكاتدا دونیاش لەگەڵ خۆیاندا وێران بكەن.

ئەوكەسەی بە تەنیا خۆی دەكوژێت، هێشتا بە بەهایەكەوە پابەندە، لەبەرئەوەی بەڕواڵەت هیچ هەقێكی بەسـەر ژیانی خەڵكی ترەوە نییە. بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە كە ئەو هێزە ترسـناكەو ئەو ئازادییەی لە بڕیاری خۆكوشتنەكەیەوە دێت، بۆ زاڵبوون بەسەر خەڵكی تردا بەكاری ناهێنێت. هەر خۆوێرانكردن (خۆكوشـتن)ێک تەنیا ئەگەر لە ڕقەوە سـەرچاوەی نەگرتبێت، بەجۆرێک لە جۆرەكان یان جوامێرانەیەو یان بەسـووک سەیركردنە. (واتە بە سووک سەیركردنی ژیان — و. كوردی) ئەم بە سووک سەیركردنەش لە ئەنگێزەیەكەوە سەرهەڵدەدات. ئەگەر ئەم دونیایە بەلای كەسێكەوە كە خۆی دەكوژێت بێبایەخ بێت، لەبەرئەوەیە كە ئەو كەسە بیرۆكەیەكی هەیە سەبارەت بە شتێكی بایەخدار، یان دەشـێ بەلای ئەوەوە بایەخدار بێت. ئەو كەسـەی خۆی دەكوژێت، وادەزانێت بەو كارەی هەموو شـتێک وێران دەكات یان لەگەڵ خۆیـدا دەیبات. بەڵام هەر لەم مردنـەوە بەهایەک دێتە ئاراوە كە دەشێ پاساو بۆ بوون بهێنێتەوە. كەواتە ئینكاركردن (یان ڕەتكردنەوە)ی ڕەها شتێک نییە كە لەڕێی خۆكوشـتنەوە بێتە دی. بۆیە ڕەتكردنەوەی ڕەها بە خۆكوشتن كۆتایی نایەت، بەڵكو بە وێرانكردنی تەواوەتیـی خۆمان و خەڵكانی تـر كۆتایی دێت. یان لانی كەم دەكرێ بە ڕووكردنە ئەم سـنوورە دڵڕفێنە تاقی بكرێتەوە. بەمجۆرە، خۆكوشـتن و مرۆڤكوژی دوو دیوی یەک سیسـتمن. سیستمی هۆشێكی چارەڕەش، كە لەجیاتی ئەوەی بەرگەی ئازاری سنووردارێتی بگرێت، ئەو سەركەوتنە ڕەشە هەڵدەبژێرێت، كە زەوی و ئاسمان وێران دەكات.

ئەگەر نكووڵی لەوە بكەین كە خۆكوشـتن هۆكاری خۆی هەیە، ناتوانین هۆكارەكانی كوشتنیش دیاری بكەین. مرۆڤ ناتوانێت نیوە نیهیلیست بێت. ئەنجامگیریی ئەبسێردیستانە ناتوانێت بەرگری لـە ژیانی وتەبێژەكانی خۆی بكات و لە هەمانكاتیشـدا قوربانیبوونـی خەڵكانی تری پێ قبووڵ بێت. ئیدی لەو ساتەوەی كە دان بە ئەستەمبوونی ڕەتكردنەوە (ئینكاركردن)ی ڕەهادا دەنێین — كە بەجۆرێک لە جۆرەكان بەردەوامبوون لە ژیاندا خۆیشـی داننانێكە بەوەدا — یەكەمین شـتێک كە ناتوانیـن ڕەتی بكەینەوە مافی ژیانی ئەوانیترە. بەمجۆرە هەمان بیرۆكە كە وای لێ كردین وابزانین كوشتن مەسەلەیەكی بێبایەخە، ئێستا خۆی ئەو پاساوانە پووچەڵ دەكاتەوەو دەكەوینەوە نێو داوی

هەمان دۆخ کە هەوڵمان دا خۆمانی لێ دەرباز بکەین. لە ڕاســـتیدا ئەم ئەنجامگیرییە لە یەک کاتدا پێمان دەڵێت کە کوشتن هەم ڕێپێدراوەو هەم ڕێپێدراو نییە. ئێمە دەخاتە ناو دژایەتیەکەوە، بەبێ ئەوەی هۆکارەکانی قەدەغەکردنی کوشـــتن یان پاســـاو بۆهێنانەوەیمان بخاتە بەردەست و ئێمە لە دۆخێکدا جێدەهێڵێت کە هەم هەڕەشەکەرو هەم هەڕەشەلێکراوین و گرفتاری دونیایەکی سەرمەستین لە نیهیلیزم و کەچی هێشـــتا نوقمی تەنیایین، چەقۆمان بەدەســـتەوەیەو قوڵپی گریانیش گەرووی گرتووین. لە هەڵوێستی پووچگەرایانە (یان ئەبسێردیستیانە)دا شتێک نامێنێتەوە تا لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی سەردەمەکەماندا یارمەتیمان بدات. میتۆدی پووچگەرایانە، وەکو گومانی سیستماتیک لەوحەکـــە پاک دەکاتەوەو لە کوێرەڕێیەکدا جێماندەهێڵێت. بەڵام هەروەکو میتۆدی گومان، ئەمیش بـــە گەڕانەوە بۆخۆی، دەتوانێت بوارێکی توێژینەوەی نـــوێ بهێنێتە ئاراوە. ئەنجامگیریی ژیرانەش هەمان ڕەوتی گەڕانەوە دەگرێتە بەر. من ڕایدەگەیەنم کە باوەڕم بە هیچ شتێک نییەو هەموو شتێک پووچە. بەڵام من ناتوانم گومان لە ڕەوایەتیی ئەو ڕاگەیاندنەی خۆم بکەم و لانی کەم دەبێ باوەڕم بەو ناڕەزاییەی خۆم هەبێت و ناچارم باوەڕیشم پێی هەبێت. لەناو ئەزموونی پووچگەرایانەدا، یەکەمین و تاقە پێدراوێک کە شکی دەبەم یاخیبوونە. من کە لە هەموو مەعریفەیەک بێبەشم، لە دۆخێکدام کە یان دەبێ بکوژم و یان بە کوشتنی خەڵک قایل بم، تاقە شتێک کە شکی بەرم ئەو پێدراوەیە کە لەو دڕدۆنگییەوەی بەدەستیەوە گینگڵ دەدەم هێزو تین وەردەگرێت. یاخیبوون لە شتێکی نامەعقولەوە ســـەرچاوە دەگرێت کە هاوکاتە لەگەڵ دۆخێکی ناعادیلانەو پەی پێنەبراودا. بەڵام جۆش و خرۆشـــی کوێرانەی، لەناوجەرگەی بێ ســـەرەوبەرەییدا داوای ڕێکی دەکات، هەروەها لەناوجەرگەی فانیبووندا داوای یەکبوون دەکات. یاخیبوون هاواری ناڕەزایی بەرز دەکاتەوە، پێ لەســـەر داواکانی دادەگرێت. دەیەوێ کۆتایی بە بێدادی بێت و ئەوەی تائەمڕۆ لەســـەر ئاو نووســـرابۆوە، لەمەودوا لەسەر تاوێرە بەرد بنووســـرێتەوە. ئامانجی یاخیبوون گۆڕینە. بەڵام گۆڕینیش واتە کارو کردەوە، کاروکردەوەش لەم ڕۆژگارەدا واتە کوشـــتن، بەبێ ئەوەی تائێســـتاش بزانێت ئاخۆ کوشـــتن شتێکی ڕەوایە یان نا. هەربۆیە یاخیبوون چ ڕێگایەکی دیکەی لەبەردەمدا نییە جگە لەوەی پاســـاوەکانی خۆی لە خۆیەوە سەربگرێت، لەبەرئەوەی جگە لە خۆی هیچ شتێکی دیکە شک نابات. بۆ ئەوەی بشزانێت چۆن کارو کردەوە ئەنجام بدات، دەبێ لە خۆی بکۆڵێتەوە.

دوو سەدە لە یاخیبوونی میتافیزیکی و مێژووییمان لەبەردەستدایە تا لێیان بکۆڵینەوە. ڕەنگە بەتەنهـــا مێژوونووســـێک بتوانێت بەوردی ئەو تیۆری و بزوتنەوانەمان بـــۆ بخاتە ڕوو کە لەم دوو سەدەیەدا بەدوای یەکدا هاتوون، بەڵام لانی کەم دەبێ لەم ڕووەوە سەرەداوێکمان لە دەستدا بێت. لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا ئەوەی هەیە بەتەنها دیاریکردنی هەندێ ئەدگاری مێژوویی و خستنەڕووی گریمانەیەکـــە، کە تاقە گریمانەی شـــیاو نییە، و جگـــە لەمەش لێرەدا مەبەســـت ڕوونکردنەوەی هەموو شـــتێک نییە. بەڵام تاڕادەیەک ئاقارو دێوانەیی ئەم ڕۆژگارەمان ڕوون دەکاتەوە. ئەو مێژووە سەرسوڕهێنەی لێرەدا باسی لێ دەکرێ، مێژووی لەخۆباییبوونی ئەوروپایە.

بەهەرحاڵ، ئێمە ناتوانین لە یاخیبوون بگەین بەتەنها لەڕێی لێکۆڵینەوەی ئاقارەکانی و لافەکانی و سەرکەوتنەکانییەوە نەبێت. بەڵکو بتوانین ڕێسایەکی کرداری بدۆزینەوە کە پووچی (یان ئەبسێرد) نەیتوانی بماندات. یان لانی کەم نیشانەیەک بدۆزینەوە کە ماف یان ئەرکی ئێمە لە کوشتندا بخاتە ڕوو، یان ئومێدێک بۆ داهێنان بدۆزینەوە. مرۆڤ تاقە بوونەوەرێکە کە ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە خۆی چۆنە وابێت.. ئێمە دەمانەوێ بزانین ئاخۆ ئەم ڕەتکردنەوەیە بەناچاری مرۆڤ بەرەو وێرانکردنی خۆی و ئەوانیتر دەبات؟ ئاخۆ هەموو یاخیبوونێک دەبێ بە بەرگریکردن لە کۆمەڵکوژی بشکێتەوە، یان بە پێچەوانەوە، بەبێ ئەوەی لافی پاکیزەییەکی ئەســـتەم لێبدات، دەتوانێ پرنسیپ بۆ گوناهبارییەکی سنووردار دابمەزرێنێت.

سەرچاوە:

ALBERT CAMUS THE REBEL
Translated by Anthony Bower
PENGUIN BOOKS 2000
LONDON ENGLAND

# کاریگەری زاراوەی گۆران لەسەر زمانی کوردی ناوەندی

## -سابستراتم یا وەرگرتنی بەشکۆ؟[١]-

مایکێل لێزێنبێرگ*
لە ئینگلیزییەوە: مەنسوور سەلیمی

### پێشەکی:

ئەو زاراوە خۆماڵیانەی کوردەکان پێیان دەدوێن دەبنە دوو دەستە: ئەوانیش دووبارە دابەشدەبن بۆ دوو دەســـتە شێوەزمانی ســـەرەکی. زۆربەی هەرەزۆری کوردەکان بەجۆرە شێوەزمانێک دەدوێن بەناوی کرمانجی یا ســـۆرانی؛ کەمینەکانی تر بە گۆران یان زازا دەدوێن. هەر چەند دوو شێوەزمانی دواتر خزمی نزیکی دوانی پێشـــترن، بە تەئکید بەشـــێک نین لە لقێکی هاوشێوە لە زمانە هێندوو-ئێرانیەکان. هەرچەند، وێدەچێ بەگشـــتی هەر دوو دەســـتەکە بەشـــێک بن لە دەستەی باکووری ڕۆژئاوای زمانە ئێرانیەکان. ڕاســـتیەکی ســـەرنجڕاکێش ئەوەیە کە زاراوەی سۆرانی لەگەڵ گۆرانی لە چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراودا هاوشێوەن، ئەویش بەرهەمی پێوەندی دوو قۆڵییانە؛ بۆمان هەیە پرســـیار کەین چ جۆرە پێوەندییەک هاتۆتە ئاراوە. حەز دەکەم ئەم پرسیارە ئاراستەی بەکگراوندی چەند لێکۆڵینەوەیەکی بیردۆزانەی ســـەردەم کەم لەسەر پێوەندی زمان، تایبەتەن Thomason &. Kaufman (١٩٨٨). ئەم نووسەرانە باس دەکەن و دەڵێن لە هەمبەر ئاکامەکانی تێکهەڵچوونی زمان هیچ ســـنوورێکی زمانەوانی نییە. (لاپەری٣٥) جگە لەمە ئەوان دوو جۆرە تێکهەڵچوونی ســـەرەکی دەبینـــن: تێکهەڵچـــوون لەگەڵ گۆران( کە لە کۆنەوە ناســـراوە بـــە (substratum) وە وەرگرتن بە پاراستنی زمانەوە. لەسەر ئەم بابەتە دەدوێن و دەڵێن کە ئەم دوو ئاکامە لە زمانەوانی لێک جیاوازن. پێویســـت ناکا کاریگەری substratal تێکەڵاو بەوەرگرتنی وشـــەیی بەربڵاو بێت: وەک نیشانەیەکی تایبەت بەخۆی بە فۆنۆلۆجی و ڕستەســـازییەوە دەس پێدەکا و کەمتر بە وشەناســـی morphology

چەماوە (لاپـــەری ٣٩). بەپێچەوانە، لـــە وەرگرتندا لە ماوەی تێکهەڵچوونیانـــدا دەپارێزرێن. بەندە وشـــەیەکان، تایبەتن بەندەوشەکانی نابنچینەیی، هەمیشە یەکەمین ســـەرەتاکانی وەرگرتن بوون: رەنگە پێوەندی چڕ و پرتر وەرگرتنی بەشەکانی پێکهاتەیشی (واتە رستەسازی و فۆنۆلۆجی) بەدواوە بـــێ. : پێوەندییەکی درێژخایەنی نێوان زمانی ســـەرچاوە و زمانی مەبەســـت بـــۆ وەرگرتن نەک بۆ کاریگەری substratal پێویست دەکا. (لاپەڕەی ٤١)

حەز دەکەم لەم چوارچێوە بیردۆزییەدا تیشـــک بخەمە ســـەر چەند پرســـیارێکی تایبەت کە بە دیـــاردەی پێوەندی زمانەوە پێوەندیان هەیە و لە ســـەرەوە ئاماژەی پێکرا. مەک کێنزی (٨٦:ب١٩٦١) باس دەکا و دەڵێ نیشـــانەی تایبەتیەکانی رێزمانی کە ســـۆرانی لە کرمانجی جیاکردۆتەوە بە هۆی سابســـتراتمێکی گۆرانییە، واتە، بەهۆی پاشماوەکانی زمانێکە کە لە ناوچەکەدا بەر لە «هێرشێکی کوردی» گریمانیدا پێی دواون. مەبەســـتی ســـەرەکی من، هەر وەک لە بەشی سێهەمی ئەم وتارەدا ئامـــاژەم پێ کـــردوە ئەوەیە کە ئەم پێوەندییە نزیکانەی نێوان کوردی ناوەندی و گۆرانی نابێ وەک سابســـتراتم لێک بدرێتەوە (وێدەچێ بەر لە هێرشەکانی مۆغۆل بووبێت)،بەڵکوو پتر وەک وەرگرتنی بەشـــکۆ لە ســـەردەمێکی زۆر دواتردا، زۆر لەوانەیە بەر لە سەدەی حەڤدەهەمیش نەبووبێ. بەپێی تێگەیشتن لە کاریگەری سابستراتل ئەم رەوتە پێویستی بە هاتنەئارای هیچ گۆڕانێکی زمانی گرنگ لە نێوان دانیشـــتوانی گۆران نەدەکرد. بەهۆی نائاشنابوونی پێوەندیداری هەرێمەکە، دەست دەکەم بە چاوخشانێک بە سەر زاراوە کوردییەکان لە مەودایەکی بەرینتردا، کە بریتیە لە کورتە ئاماژەیەک بـــۆ دیارترین تایبەتمەندیەکانی زمانەوانی کۆمەڵایەتـــی و رێزمانیان. پێدەچێ دوو بۆچوونی جیاواز لە وشـــەی «زاراوەی کوردی» هەبێ:یەکیان زاراوەی لقی کوردی زمانەکانی هێند-و-ئێرانیی باکووری رۆژئاوایە؛ ئەویتر «زاراوەیەکە کەسانێک پێی دەدوێن کەخۆیان بەکورد دەزانن.»

تێنەگەیشـــتن لەم دوو بۆچوونە جیاوازە رەنگە زۆر هاسان ببێتە هۆی سەرلێشێواوی و ناکۆکی ناپێویســـت: پێشـــکەوتنەکانی نەتەوەیی نابێ لەگەڵ ســـەرلەنوێ بونیادنانەوەی زمانەوانی تێکەل کرێـــن. بەهۆی نەبوونـــی زانیاری زمانەوانـــی کۆمەلایەتی و زمانەوانی ئەوتۆ لەســـەر زۆر یەک لەو زاراوانـــەی باس دەکرێن زۆربەی زۆری ئەم وتارە لـــە رووی ناچارییەوە کاتی و بەرنامەیی، تەنانەت جاروباریش نامسۆگەرە (جێی بیرکردنەوەیە). جگە لەمە ئەم باسە پێویستی بەتێکەڵکردنی زانیاری تەواو زمانەوانی لەگەڵ لێکۆڵینەوەی مێژوویی زمانەوانی کۆمەڵایەتی، ئەگەر نەڵێین کۆمەڵایەتیەکان هەیە. باش دەزانم کە بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە بەرابەرە لەگەڵ پێشوازیکردن لە نەهامەتی و کارەســـات، زیاتر بەم بۆنەوەیە کە لە هیچیەک لەم بوارانەدا ناتوانم بڵێم کە زانیاری ئەوتۆم هەیە. هەرچەند، من پێم وایە لێکنزیکبوونەوەیەکی وەها کە چوارچێوەی نەخشـــەکەی لێرەدا دارێژراوە بۆ سەیرکردنی بابەتەکان لە روانگەی گونجاوی خۆیانەوە بەکەڵک بێت.

kurdish dialects and kurdish» dialects -1

## دیالێکتە کوردیەکان وە دیالێکتە «وەک کوردیەکان»

لەنێـــوان ئەو زاراوانەی کە کـــوردەکان پێیان دەدوێن، زاراوەگەلێک هـــەن کە مەک کێنزی ناوی نـــاون زاراوەکانی کوردی باکوور، کـــە زۆربەی کوردەکانی تورکیا، ســـووریاَ، دوورترین ناوچەکانی باکووری کوردســـتانی عێراق و چەند کۆمارێکی ســـۆڤیەتی پێشوو پێیان دەدوێن[٢]. ئەم زاراوانە بە کرمانجی ناســـراون، یان بەگوێرەی کوردەکانی ئێراق، بادینییان پێ دەڵێن. لقی boti وە cizre لە زاراوەکانی کرمانجی دەتوانێ گەلاڵەی گەورەترین پەیکەری ئەدەبی زمانی کوردی داڕێژێت، چیرۆکی ئازایەتی مەم و زینی ســـەدەی حەڤدەهەم. ئەم فەخرە ئەدەبیەی زاراوەی کرمانجی و ئەم راســـتییە کە گەورەترین رێبەرانی رۆشنبیر و سیاسی کوردەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا (وەکوو بەدرخان بەگ، دوایەمین میری دەســـەڵاتدارێتی بۆتان کە ناوەندی cizre بـــوو و نەوەکەی تاڕادەیەک خوێندەواری ئەورووپایـــی هەبـــوو) کرمانجی وێژ بوون، وایکـــرد کە ئەگەر کوردەکان بیانویســـتایە لە بنەڕەتدا زمانێکی ئەدەبییان هەبێ، ئەم زاراوەیە هەر لە بنچینەوە لێهاتوویی هەبوو؛ لەڕاســـتیدا هەوڵەکانی ئەمیر جەلادەت بەدرخان لە سووریا لە ١٩٣٠دا (کە لە ئاکامدا بەناوی بەدرخان و لاسکۆت ١٩٧٠ بڵاو بۆوە) بۆ درووستکردنی شێوەنووسینی کرمانجی لە ئەلفبای لاتیندا چەندە لێکۆڵینەوەیەکی وەسفی لە بن زاراوەی[٣] بۆتی بوو هەر ئەوەندەش هەوڵێکی ئاسایی بوو بۆ بەئیستاندارد کردن.

هەرچەند، هەلو مەرجی سیاســـی کۆمەڵایەتی، لە ســـەرووی هەمووانەوە یەکسەر قەدەغەکردنی هـــەم کـــوردی پەیڤین و هەم کوردی نووســـین لە کۆماری تـــازە دامەزراوی تورکیا لە بیســـتەکان بەملاوە، تا رادەیەکی یەکجار زۆر بەربەســـتێک بووە بۆ گەشـــەی زاراوەی کرمانجی بەرەو زمانێکی بەئیستانداردکراو بۆ پەروەردە و وتووێژی کۆمەڵان. تەنیا لە ئەرمەنستانی سۆڤییەتدا کرمانجی هێور هێور بەرەو زمانێکی نووســـراوە و بەئیســـتانداراکراو هەنگاوی هەڵێنا و گەشەی سەند؛ لە تورکیا، ســـەرەتای دەکانی ١٩٩٠ ســـەرهەڵدانێکی کوت و پڕی بڵاوکراوەکانی بەکرمانجی بەخۆوە بینیوە، کە لەســـەر بنەمای نووسراوەکانی بەدرخانەوە، تاڕادەیەک، لەســـەر بنەمای توێژینەوەیەکە کە لەلایەن کوردە ئاوارەکانی کوردستانی ئێراقەوە ئەنجام دراوە، چەند کتێبێک کە بە کرمانجی لەسەر رێنووسی عەرەبی نووســـراون بڵاو کراونەتەوە، بەڵام کرمانجی قەت نەیتوانی بە ئاستێکی هاوچەشنی سۆرانی وەک زمانی فەرمی بگات.

زاراوەکانـــی کرمانجـــی بۆ نـــاوەکان و رانـــاوەکان شـــێوەگۆڕینێکی ناویـــان (case inflection) هەیـــە؛ کـــردار (verb) رەگێکی دەمکاتـــی رابردوو و ئێســـتای هەیە؛ هیـــچ گەردانبوونێکی کرداری کارلێنەکـــراو (passive conjugation) بەدیناکرێـــت، بـــەڵام کارلێکراوێکی شـــیکەرەوە (analytic passive) لەکـــرداری یاریـــدەدەری «هاتـــن» درووســـت دەبـــێ. گرنگترین نیشـــانەکانی دەنگی «phonetic characteristics» لـــەم تابلۆیەی ژێرەوە ریزکراون. لەڕووی رستەســـازییەوە گرنگترین تایبەتمەنـــدی کرمانجی داڕشـــتنی ئێرگاتیڤە (ergative construction) لە شـــێوەکانی دەمکاتی

رابردووی کردارەتێپەڕەکان، کە پێچەوانەی داڕشـــتنێکی بـــاری بکەرە-باری کارلێکەر- لە دەمکاتی ئێستادا. لێرەدا کردار لەگەڵ کارلێکراوی ژێبێژیدا کۆکە، هەرچەند لە شوێنی کارلێکراودایە، لەباری تەواوکەریدا (absolutive case) دەمێنێتەوە:

ئەز وی دبینم I see him

ئەز(abs)-و (obl)-دبینم (یەکەم تاکی دەمکاتی ئێستا)

من ئەو دیت «I saw him»

من- (obl) ئەو (abs) دیت (سێهەم تاکی دەمکاتی ئێستا)

لەو داڕشـــتنانەی کە راناوی خۆگەڕاوەی خوە دەگرنەخۆ، کە بۆ ناو یان کەس هیچ نیشـــانەیەک ناگرن، ئەمە لە دەمکاتی رابردوودا بە شـــێوەکرداری تاکەکەســـی ســـێهەم داڕشـــتنی «ناتایبەت بەکەس» دەبەخشێ.

ئەز خوە دبینم

ئەز- (abs) خوە دبینم- (تاک.دەمکات.ئێستا)

من- (obl) خوە دیت

هەرچەنـــد لـــە هەندێ لەو بنزاراوە کرمانجیانـــەی کە هاتوونە پەیڤین، ئەم داڕشـــتنە ergative ئاشـــکرا بەرەو داخوڕین و داڕزین دەچێ و بەرەو کارلێکراوێکی دووبەرابەر((double accusative یا تەنانەت بەرەو داڕشتنێکی بکەر-کارلێکراو گەشەدەکا[٤].

دووهەمیـــن، دوا دیالێکتی ســـولەیمانییە دیالێکتە کوردییەکانی ناوەندییـــە کە بە کوردی یان زۆرجار بە سۆرانی ناسراون. ئەوان هەروەتر لە ناو زاراوەکانیتردا، دیالێکتی موکریش دەگرنەوە، کە لە کوردســـتانی ئێران لە دەوروبەری شاری مەهاباد دێتە پەیڤین. ئەم زاراوانە لە کوردستانی ئێراق لە باشووری چۆمی لوتفی زاب دێنە قسەکردن.

دیالێکتی ســـۆرانی زمانی بارەگای بابان لە سولەیمانییە بوو، ئەو شوێنەی کە دواتر کۆنسوولی بەریتانی Claudius James Rich ماوەیەکی لێ رابوارد (ch.Rich١٨٣٦).

ئەم میرنشـــینە لە وەرچەرخانی ســـەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا ســـەریهەڵدا و بەتێپەڕبوونی زەمەن باڵی کێشـــا بەســـەر بارەگای ئەردەڵان لە نزیک خۆیدا، کە لە سنە هەڵکەوتووە و تا ئێستا لە هەرێمی باشـــوور مەزنترین میرنشـــینی کوردی بووە[٥]. لە ١٩١٩دا، نووسەرانی سەر بە دەسەڵاتی بەریتانـــی لـــە عێراق بڕیاریان دا تا رادەی زمانێک پەرەبدەن بەم زاراوە بۆ کاری فەرمی و پەروەردە، هەرچەند بەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دەق و بابەتی ئەدەبی بەم زمانە نەنووسرابوو.

(cf. Hassanpour ١٩٨٩:٦٦-٧) دوا بـــەدوای ئەوە، هاوکات کە کرمانجی لە رووی ملهۆڕییەوە لە تورکیا ســـەرکوت دەکرا، زاراوەی سۆرانی لەلایەن بەرپرسانی دەسەڵاتی بەریتانییەوە لە عێراق وەک زمانێکی فەرمی کوردەکان دەناسرا و هەر لەو دەمەوە وەها ماوەتەوە.

هەرچەند ژمارەی کرمانجی وێژان زیاترە، ســـۆرانی دەرفەتی باشتری بۆ رەخساوە تا خۆی لەگەڵ پێویســـتیەکانی چاپەمەنی ســـەردەمدا رێک خا. هەرچەند دەبێ بڵێین ئەم پەرەسەندنەش کێشەی تایبەت بەخۆی هەبووە: کاتێک ســـۆرانی وەک زمانی فەرمی فێرکردن لە کوردســـتانی عێراق ناسرا، بادینی وێژان (واتە کرمانجی وێژان) لە ئامەد لە ســـەرەتاوە حەزیان کرد منداڵەکانیان بنێرن بۆ ئەو قوتابخانانەی کە عەرەبی زمانی فێربوون بوو[٦]. جگە لەمە، لەوە دەچێ لە دەکانی ١٩٨٠ دا، لە ئاکامی هەوڵەکانی بەعەرەب کردن لە لایەن حکوومەتی بەعسەوە دەرفەتی خوێندن بە کوردی روو لە کزبوون بووبێت. گرنگترین تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی سۆرانی نەبوونی سیستەمی شێوەی ناو، جێناو، ئاوەڵناو، مۆرفیمێکی کارلێکراو- r -/-- ra وێ بەکار هێنانی شێوەکانی پاشگریکراویsuffixed forms جێناوە تاکەکەســـیەکانیpersonal pronouns، کە لە کردارە تێپەڕەکاندا دەخرێنە نێوان پێشـــگری کرداریverbal prefix وێ ریشـــەوە stem، لەدەمکاتی رابردوودا، شێوەی گۆڕینی وشە بەسراوەتەوە بـــەوەی کە ئایـــا بکەر و کارلێکراوی مانایی لە ناوێکدا، جێناوێکی ســـەربەخۆدا، یا کلیتیک clitik دەردەکەوێت[٧]:

ئە—تان بن-یم

دەمکات.ئێستا. تۆ (گشت.) بینین- ١ تاکەکەس (دەمکات.ئێستا)

نارد- یم ت

ناردن- (دەمکات.ڕابردوو)١تاکەکەس ٢تاکەکەس

وە- م د ت

تۆ (گشت)١تاکەکەس دیتن- (دەمکات. رابردوو)

گورگەکان- یم د ت- ین

گورگ-ناسراو-گشت ١تاکەکەس- (دەمکات. ڕابردوو ٣ گشت)

بەپێچەوانەی کرمانجی، سۆرانی پێویستی هەیە کە راناوی بۆ خۆگەڕاوەی خۆ راناوێکی پاشگریکراو وەرگرێت:

خۆ-ت ئە- شۆ-ی

خۆ- (٢تاک)شتن- (دەمکات.ئێستا)٢تاک

دەستەزاراوەیەکی سێهەمی بچووک، کە پێوەندییان بە دوانی ئاماژەپێکراو هەیە. بریتین لە «زاراوە کوردییەکانی باکوور»، کە لە بەشی باکووری رۆژهەڵاتی کوردستان، بەتایبەت دەوروبەری کرماشان پێییان دەدوێن. بەبۆچوونی مەک کێنزی (n.d)،ئەوان زاراوە لۆڕیەکانیش دەگرنەوە . ئەو زاراوە پەتیەی کە کوردە فەیلییەکانی شیعە پێی دەدوێن، ئەو کەسانەی کە لە ناوەندەکانی باژێری باکووری عێراقدا دەژیان بەر لەوەی لە دوو هەڵمەتی یەک بەدوای یەکی١٩٧١ و ٩٨٠١ دا ئاوارە بکرێن، ئاشکرایە کە بەشێکە لەم دەستەزاراوەیە، هەرچەند، وەک لەکی پێگەی درووستی نادیارە. چەند شارەزایەک پێیان وتم کە لە کوردستانی عێراق، لە دەوروبەری خانەقین و مەندەلی ئێستاش کەسانێک هەن کە بە لۆڕی قسەدەکەن: هەروەتر پێیان راگەیاندم کە باکووری هەولێر و نزیک کەرکووک کانگای لەکی بووە. لێکۆڵینەوەی کەم لەسەر ئەم زاراوانە ئەنجام دراون و لە ئەدەبیاتی نووسراو بێبەشن، هەرچەند، پێدەچێ هەندێکیان تا رادەی زمانێکی بەشکۆی ئەدەبیی کۆن گەشەیان سەندبێ.(بۆ وێنەیەک لە زاراوەکانی لۆڕی و فەیلی بڕوانە mann ١٩١٠). چەند زاراوەیەکی جیایتر تایبەت بە گۆرانی لە هەورامان لە کوردستانی ئێران و باشووری دوور، درووست بە پانایی سنووری عێراق لەسەر زارن. ئەو زاراوانە لەلایەن دانیشتوانی ناوخۆوە زۆرتر بە «هەورامی» یان «هەورامانی» ناسراون[٨]. بەسەر ئەمەشدا، لە کوردستانی عێراق، چەند کانگایەکی جیاجیای گرووپی نەتەوەیی جۆراوجۆر هەن کە بەزاراوەگەلێک دەدوێن زۆرتر نزیکن لە گۆرانی (بڕوانە نەخشەی زاراوە). بۆ وێنە، «باژەلان»

هەندێکیان لە نزیک خانەقین و هەندێ لە باکووری مووسڵ، لە دۆڵی خۆسارد دەژین. ئەوانیتریش وەک شەبەک لە نزیک مووسڵ دەژین. پێوەندییەکانی دیاری نەتەوەیی و زمانەوانی نێوان شەبەک و باژەلان روون و بەرچاو نین؛ نووسەرانی پێشتر وەک مینوورسکی ( ١٩٤٣:٧٦) وە مەک کێنزی((١٩٥٦ ٤١٨-٤٢٠ دوو وشەی «شەبەک» وە «باژەلان»[٩] وەک یەک هاومانا بەکار دێنن لە حاڵێکدا باشتر وایە جیابکرێنەوە. وەک رەگەز دڵنیاین کە ئەو دوانە وەک یەک نین، باژەلان رێکخراوەیەکی خێڵەکی و زۆر لەوە دەچێ سوننی لادەر بن، شەباک شیعەی لادەری ناخێڵەکین[١٠]. بەپێی ئەو نووسراوانەی لە لایەن مەک کێنزییەوە کۆکراونەتەوە و چەند نموونەیەک لە شەبەک کە من بە یارمەتی گوندنشینێکی گوندی qahrawa کۆم کردۆتەوە چەند جیاوازییەک بەدیدەکرێت[١١]. بۆ وێنە:

شاب.ئاو، ،چاو، لە بەرابەر باژ.ئام

شاب.زیمان، زمان، لە بەرابەر باژ. زیوان

شاب.شیمێ، ئێوشان، تۆ، ئەوان، لە بەرابەر باژ. شما، شان.

چەند وردەجیاوازیەکی تریش وەک لە دەستەواژەی ژمارە و وشەسازی کرداری، بەڵام بەسەر ئەمانەشدا ئەم دوو زاراوەیە وێدەچێ پێوەندی نزیکیان بووبێت:

شاب. ئەمین زیلام مێت، زەلامەکە دەبینم، ئەمین زیلامێم تت، زەلامەکەم دی،

باژ. سارا ی نات مات، «سبەینێ ماڵەکەت دەبینم»، و ئەمین زیلامێم تت، من زەلامەکەم دی[١٢].

گرووپێکی ئەتنیکی مەزنتر کە بە زاراوەی هەورامی دەدوێن کاکەیین، کە ئەلحەق، عەلی

وەللاهی، یان لە ئێران یارسان یان پێدەڵێن، ئاینێکی جیاواز و ئەدەبیاتێکی ئایینی جیاوازیان هەیە، بەشێکی بە فارسی تازە دەنووسرێت، بەشێکی تری بە کۆنە هەورامی. هەموو کاکەییەکان هەورامی زمانی دایکیان نییە: کاکەیی تۆرکومان و کاکەیی سـۆرانی زمانیشـمان هەیە، تەنانەت هەندێکیان لـە مەندەلـی، بەعقووبە و خانەقین بە عەرەبی دەدوێن، هەڵبـەت ژمارەیەکی بەرچاو لەمانە چەند زمانەن. چەند نموونەیەکی ماچۆ(کە لە دەستەواژەی من دەڵێم گیراوە و زۆرجار بە زاراوەی کاکەیی دەوترێ) لە تۆپزاوا نزیک تاوق taw q بەسـە بۆ ئەوەی نیشـان بدا کە ملکی زاراوەکانی گۆرانییە: مین بیرینج مۆر، «من برنج دەخۆم»، مین بیرینجم وارد، «من برنجم خوارد»؛ ئەم، «چاو» ئەمیم، «چاوم». پاشـگرەکانی کەسی دەمکاتی رابردوو لە پرەکتیکدا لە هی فارسی نوێ دەچن، هەر وەک لـە نموونەیەکـی گەردانکردنی کردار دەردەکەوێت. تاک: ١. میـن پیاوێم د ٢. تۆ پیاوێت د:٣. ئەو پیاوێش د: کۆ: ١. پیاوێمان د، ٢. پییاوێتان د ٣. پییاوێشان د.

ڕاناوی بۆ خۆگەڕاوەی یۆ- پاشگرێک دەگرێ: من یۆم مەون، «من خۆم دەبینم»

بە بۆچوونی ئیدمۆندس(١٩٥٧:١٩٥) و بە تێگەیشتنی مووسا(١٩٨٨:١٦٨) سارل کە لە نزیک Eski kalak دەژین لە راسـتیدا کاکەیین: لەڕاسـتیدا ئەوان حەز بە وشەی «سارل» ناکەن وە ئەمە دراوسـێکانیانن ئەم ووشـەیان بۆ بەکار دێنن. ئەو کەسـانەی کە من لە نزیک گوندی سڤیە، نزیک Eski kalak چـاوم پێیان کـەوت کاکەیی لە بنەماڵەی ئیبراهیمی بوون: زاراوەکەیان مام ناوەندێکە نێوان شەبەک و ماچۆ. لە کۆتاییدا، زەنگەنە، یەکیەتیەکی خێڵەکین کە هەر لە کۆنەوە لە باکووری رۆژئـاوای کەرکووک نزیک بە خانەقین ژیاون. بە زاراوەیەکی خۆماڵی رەسـەن پێوەند بە هەورامی دەدوێن، بۆ وێنە «نان مۆر» ،نان دەخۆم،: «من نانیم وارد»، من نانم خوارد،؛

«ئـا پیاو مێـون، من زەلامەکە دەبینم، ئـە پیاویما د، زەلامەکەم دی: ئـام «چاو» ئێمی من «چاوی من»؛ «من مائا» «من دەڵێم» «من واتم» «من وتم». ئێدمۆندس(١٩٥٧:١٩٥) ناوی ناون «قزلباشـی کوردی»: بەڵام شـارەزایانی ناوچەکە ئەیانوت ئەوان سونین. جێی سەرنجە شارەزایەک رایگەیاند کە لە راستیدا سەرجەم ناوچەی گەرمیان تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم زەنگەنە زمان بوون؛ لەوە دەچێ زۆر لەمێژ نەبێ کە زەنگەنە زمانەکان بەتێکڕایی لەگەڵ سۆرانی وێژەکان تێکەڵ بووبن. لە راسـتیدا لەوانەیە ئێسـتاش لەم ناوچەدا زاراوەگەلی شێوە- هەورامی هەبن: شارەزایەک ئاماژەی کرد بە زاراوەی رۆشـکاکایی کە لە نزیک خانەقین پێـی دەدوێن. هەرچەند زانیاری تەواومان نییە، بەڵام ئەوەی کە هەیە ئاشـکرای دەکات کە هەموو ئەو زاراوانەی ئاماژەیان پێکرا بەشـێکن لە لقی زمانەکانی ئێرانی و زۆر بەربلاوتر لەوە دیارن کە ئاسـایی باس دەکرێن. ژمارەی ئێسـتای سەرجەم گۆرانی پەیڤان دەها هەزار کەس دەگرێتەوە(مەک کێنزی؛ گۆران؛ هەورامان لە E [١٢]).

بـەڵام روونە ژمارەکە ئـەو گرووپانە ناگرنەوە کە تاوتوێ کـران. دوور لەو هەورامیانەی کە لە زنجیرە کێوەکانی رۆژهەڵاتی سلێمانی و هەڵەبجە دەژین، زۆربەی سەرچاوەکانی دیالێکتی گۆران لە ناوچە شاخاویەکانی سەر سـنووری نێوان ناوچە کوردنشینەکان و عەرەب نشینەکانی کوردستانی عێـراق هەڵکەوتووە، ئەو شـوێنەی کە ژمارەیەکـی بەرچاو لە تورکمانەکانیـش دەژین. دوورترین

گرووپـــە زاراوەكانی باكوور، شـــەبەك و باژەڵان، لە رووی جوگرافیـــەوە ئەوەندە دوور نەخراونەتەوە لە دوورترین زازاوێژەكانی باشـــوور كە دانیشتووی دەشـــتەكانی دەوروبەری دیاربەكرن، بەڵكە لە رووی زمانەوانیەوە زۆرتر نزیكن لە دوورترین هەورامیەكانی رۆژهەڵات. بە گشتی، تا ئەم دواییانەش لەســـەر سنووری ئەو ناوچانەی كە بە دیالێكتەكانی كوردی رەسەن دەدوێن كەم تا زۆر ئەڵقەیەكی نەپساوە لە جەماوەری گۆران-پەیڤی جیاجیا بووە. دروستە ئەم دیالێكتانە وەك «هەندێ دوورگەی شـــاخاوی لە دەریایەكی كوردی- وێـــژ» دێنە بەرچاو، (مەك كێنـــزی ١٩٨٨:٥٤١) هەر دوورگەكانی گۆران لە موســـڵەوە تا دەگاتـــە خانەقین و ئەولاتر دەریایەكی تەواو لە دوورگە پێكدێنن. بەســـەر ئەمەشـــدا، سەرهەڵدانە سیاسیەكانی پێشـــوو، بەتایبەت گواســـتنەوەی بەكۆمەڵ وەك بەشێك لە هەڵمەتەكانـــی بەدناوی ئەنفاڵ لە ١٩٨٨ دا (دوایەمین چارەی حكوومەتی بەعس بۆ كێشـــەی كورد لـــە ئێراق) قەیرانی ئاوارەیی ١٩٩١، تا رادەیەكی زۆر ئەم ســـنوورە جوگرافیەی شـــێواندوە. زۆریەك لە زەنگەنەكان، هەورامیەكان، شـــەبەكەكان و كەسانیتر ســـەرلەنوێ نیشتەجێ كرانەوە، ناردران بۆ موجەمەعات (ئـــۆردوگای زۆرەملـــێ)، یان گوێزرانەوە بۆ پەناگای پەنابەران زۆر دوورتر لە شـــوێنە سەرەتاكەی خۆیان. بەڵام هەوڵەكانی حكوومەت لە پێناو بە زۆر تێكەڵكردنی ئەم گرووپانە لەگەڵ عەرەبی زۆرینە تەنیا هەستی ناسنامەیەكی هاوبەشی لە نێوان ئەواندا جووڵاندووە: ئەوانیش ئازاری ئێعدامی هاوشێوە و توندوتیژی هاوچەشـــنی كوردەكانی تریان چەشتوە. وەك شارەزایەكی شەبەك دەڵێ: «حكوومەت پێی وتین ئێوە عەرەبن، نەك كورد؛ بەڵام گەر راســـت دەكەن، بۆچی ئێمەیان لە زێدەكانی خۆمان دوور خستۆتەوە؟».

ناونانی ئەم گرووپ یان گرووپانە لە زاراوەكان تارادەیەك ســـەر لێشێوێنەرە، هەروەك پێوەندیە دیارەكانی نێوان ئەو گرووپە نەتەوەییانەی كە بەم زاراوانە ئەدوێن. نووســـەرانی رۆژئاوا «گۆران»، وەك وشـــەیەكی رەچەڵەكی بۆ ســـەرجەمی ئـــەم زاراوانە بەكاردێنن، بەڵام تا ئێســـتا هیچ یەك لە شارەزاكانی من (ئەو كەســـانەی لێدەرچێ كە ئاشنان بە نووسراوەكانی ئەورووپی لەسەر بابەتەكە) بەو شـــێوە بەكاریان نەهێناوە: لەباتی ئەمە، ووشەی «هەورامی» یا «هەورامانی» وەك وشەیەكی گشـــتی لەلایەن كوردە ئێراقیەكانەوە (لەلایەن حەسەن پووریشـــەوە) بۆ ئەو زاراوانە بەكار هاتوە كە نزیك سنووری ئێران قسەیان پێدەكەن.[13]

لەراســـتیدا بەشێك لەو كێشەیە لەوەوە ســـەرچاوە دەگرێ كە دانیشتوانی ناوچەكە لە وشەگەلی وەكوو «گۆرانی» «هەورامی» وەك نیشانەی جوگرافی، ئەتنیكی، زمانەوانی، یان تەنانەت كۆمەڵایەتی بە بێ جیاوازی بەكاردێنن. (cf.van Brun essen ١٩٨٩:١٣٩-٥١ ). ئاشـــكرایە كە بۆ دەستەكردنێكی تەواو و رێكی ئەم گرووپانە لەگەڵ زاراوەكانیان توێژینەوەیەكی ورد و سەرڕاســـتی پێویستە؛ لێرەدا من (هەرچەند نابەدڵیشـــە) لە «گۆرانی» وەك نیشـــانەیەكی گشتی پارێزگاری دەكەم، لەحاڵێكدا نابێ ئەوەمان لەبیرچێ كە دانیشـــتوانێكی یەكجار كەم بەم شێوەیە بەكاریدێنن و ئەوەی كە لەمەڕ پێوەندی ئەتنیكی هیچ ئەنجامێكی لێوەرناگیرێت. هەنووكە وێژەرانی زاراوەی گۆرانی خۆیان بە كورد دەزانن، هەرچەند ئاگاداری ئەم راستیەش هەن كە ناكرێ دوو قۆڵی زاراوەكانی ئەوان لەگەڵ سۆرانی

یان کرمانجی لێکتێبگەن، تازە لە هەندێ بواریشـــدا، خاوەن نەریتی کولتووری و ئایینی جیاوازن. (cf. Edmonds ١٩٥٧:١٠).

ئـــەو گومانەی کە ئایا لە راســـتیدا گۆرانی لەگەڵ کوردەکان جیاوازن رەنگە ســـەرچاوەکەی ئەو لێڵییەی سەرەوە بێ کە ئاماژەمان پێکرد.

خاڵێکی ســـەرنجڕاکێش ئەمەیە کە زۆریەک (نەک هەمووی) لە وێژەرانی گۆرانی تایبەتن ئەوانەی ئێـــراق ، لەوە دەچێ پێوەندییان هەبێ بە یەکێک لە تاقمە لادەرەکانی (ghul t) جۆراوجۆرەوە کە لە دەســـتوورەکانی سۆفی ســـەریانهەڵدا، یان لە پێوەندی لەگەڵ شەڕی نێوان ئیمپراتووری عوسمانی ســـوننی و فارسی شیعەی ســـەفەوی لە سەدەکانی پازدە و شـــازدەدا. هەردوو شارەزای شەبەک و زەنگەنەی هاوڕێی من، پێیان راگەیاندم کە ســـەرجەم ئەندامانـــی رێزداری گرووپە ئەتنیکیەکەیان ســـوننی ئۆرتۆدۆکس بوون؛ هەرچەند شەبەک نەیدەتوانی-یان حەزی نەدەکرد — بڵێ مەزهەبەکەی چییە، بەرەنگار دەبۆوە « ئێمە بە هەرشێوەیەک بێ هەموومان موسڵمانین»؛ هەرچەند لە راستیدا بە بۆچوونی ئێدمۆندس(١٩٥٧:١٩٥) شـــەبەک و زەنگەنە لە راستیدا قزڵباشی کوردین، واتە وەچەی خێڵەکانی شیعەی لادەری(تا رادەیەک تورکمانن) کە لە رۆژهەڵاتی ئیمپڕاتۆریای عوسمانیەوە و لە فارسی سەفەویەوە، تا سەدەی حەڤدەهەم کۆچیان کردووە.[١٤]

بەم پێیە، کاکەییەکانیش رێڕەوانی ئاینی هیترۆداکسن کە لەوەدەچێ لە دەستووری سۆفی کۆن بـــاوەوە لەگـــەڵ رێز و حورمەتی یەکجار زۆر بۆ عەلی، نەوەی پێغەمبەر پەرەیان ســـەندبێت.[١٥] وەک باســـمان کرد، زۆربەی، نەک هەمووی، هەورامی وێژەکان ئەلحەقن. لێرە دەگەڕێینەوە بۆ گرنگایەتی ئەم باسە.[١٦]

ئـــەم گرووپـــە دیالێکتە، وەک ئەوانیتر، لە باری رێزمانەوە لەگەڵ ئەوانەی تا ئێســـتا ئاماژەمان پێکـــردوون تەواو جیـــاوازن و دوو قۆلی لەگەڵ ئەوانیتر لەیەک تێناگەن. لـــە هەندێ تایبەتمەندی وشەسازییەوە لەگەڵ زاراوەکانی ناوەندی و باکوور هاوبەشە، بەڵام وەک لە بەشی سێهەمدا دەیبینین، ئەم تایبەتمەندیە هاوبەشانە وەرگیراون: دوور لەم باسە، گۆرانی لە دراوسێکانی تەواو جیاوازە.

دیالێکتی هەورامی لە میرنشـــینی کوردی ئەردەڵان زمانی بارەگا بووە، کە لە سەدەی حەڤدەهەم بەتایبەت ســـەدەی هەژدەهەم پەرەیسەندوە.[١٧] وەک وترا، koine گۆرانی، وەکوو ناوەندێکی نووسینی چیرۆکـــی ئازایەتـــی و هۆنراوەی بەســـۆز لە بارەگادا، بـــۆ بابەتە ئاینییەکانـــی ئەهلی حەق کە لە ناوچەکـــەدا دەژیـــان و بۆ ئەو ئاوازانەی کە لەناو بارەگا و دەرەوەی بارەگا دەخوێنران، بەکار دەهێنرا. (بڕوانە Soane١٩٢١; Minorsky١٩٢٠ , ١٩٤٣).[١٨] لە کۆتایی ســـەدەی هەژدەهەمدا، بارەگای ئەردەڵان لەلایەن بارەگای بابانی دراوسێوە بە ناوەندێتی سلێمانی پەردەی رەشی تاریکی بەسەردا کێشرا، کە تا ئەو سەردەمە هەڵبەستەکانی زۆرتر بەو زاراوە گۆرانیە بەناوبانگە دەنووسران، بەڵام لە سەرەتای ســـەدەی هەژدەهەم بەملاوە بە سۆرانی دەیاننووســـی کە دواتر پلەیەکی بەرز و بەرچاوی بەدەست هێنا. ئەوڕۆکە گۆرانی تەنیا ســـێبەرێکە لە رابردووی خۆی: زیاتر جووتیارانی هەژار و دوورەپەرێز پێـــی دەدوێـــن و لە پراکتیکـــدا وەک دیالێکتێکی ئەدەبی نەماوە؛چون ئەوەنـــدەی من بزانم، تەنیا

یەک هەڵبەستوان، سەیید تاهیری هاشمی، لە چەند ساڵی رابردوودا بە گۆرانی هۆنراوەی داناوە؛ دیوانەکەی لە مەهاباد (ئێران) ماوەیەکی کورت دوا مەرگی لە١٩٩١دا بڵاو بۆوە. لەگەڵ ئەوەشدا، حکوومەتی پەهلەوی ئێران هاندەرێک بوو بۆ بەکارهێنانی گۆرانی لە ناوەندەکانی راگەیاندن و لە کۆتایی شەستەکاندا دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی بەرنامەی رادیۆیی بەم زاراوەیە، بە ئاشکرا لە هەوڵێکدا بۆ چاندنی تۆوی ناکۆکی لە نێوان هاوڵاتیاندا. (بڕوانە Hassanpour١٩٨٩:٢٥٨)؛ حکوومەتی ئێراقیش لەو پێناوەدا دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی گۆرانی لە ١٩٧٥ (ibid.,p ٢٧١.)[١٩]

لە کۆتاییدا، چەند جۆرێک لە دیالیکتی زازایش هەن کە بە هەندێکیان dumili یاdimili یش دەڵێن. ئەمانە لە دوورترین ناوچەکانی باکووری کوردستان، لە سێ گۆشەیەکی نێوان سیڤاس، بتلیس، و دیاربەکر، دێنە ئاخافتن. جێی سەرنجە و لە هەمانکاتیشدا —ئاڵۆزکەر— کە زازایی وێژانی دەرسیم (تورنجاڵی ئێستا) بە دیالێکتی زکماکی خۆیان کرمانجی یا کرمانکی دەڵێن: و بەزاراوەی کرمانجی ناوخۆ هەرەوەرە (فەرمانی کرمانجی وەرە-برۆ) دەڵێن؛ زازای دەرسیمی لە لایەن کرمانجی وێژانی ناوخۆوە سو-بSo-bیشی پێ ئەوترێ.

Mann و کەسانیتر لێکیان داوەتەوە کە «dimili» جێگۆرکێی «Dailami»یە کە بە بۆچوونی ئەوان، سەرچاوەی زازاکان ناوچەی دەیلەمە لە نزیک دەریای خەزەرە؛ هەرچەند من لە هیچ زازایەکی دەرسیم یان رۆژهەڵاتی دوور نەم بیستوە کە بە زمانی خۆماڵی خۆی بڵێ «Dumili» یان «Dumilki a» ١٩٨٩ cf. van Bruinessen (٤٥٥٨١٦).

زازا لەم بوارانەدا لەگەڵ دیالێکتە کرمانجیەکانی دراوسێ جیاوازی هەیە: لە هەندێ جیاوازی دەنگی دا (بڕوانە ئەو تابلۆیەی ژێرەوە) و تایبەتمەندیەکانی وشەسازی وەکو مۆرفیمێکی کارلێکراو—ye، پاشگرێکی دەمکاتی ئێستا –an-/-n-، کە پێشگرەکانی ناتەواوی دیالێکتەکانی کرمانجی، سۆرانی، و گۆرانی ناچێت (-di-,:e-,-ma-ya –mi )، و لەوانەیە لە وەرگرتنێکی وشەسازیدا لە زمانی ئەرمەنی (cf. Mann/Hadank١٩٣٣:٣٢-٥)[٢٠].

لە زاراوەی siverek ئەو «کیشێنۆ» o kisheno (ئەو دەکوژێ) هەیە و کارلێکراو «o kishyeno» (ئەو کوژرا) هەیە، بەپێچەوانەی کرمانجی «ew dikuje».

(ئەو دەکووژێ) ، وە «ew t kashtin» (ئەو دەکوژرێت)، (وشە بە وشە. ئەو دێ بەرەو کوشتن). وەرگرتنێکی تری وشەسازی لە ئەرمەنیەوە «پێشگری نێگەتیڤی» negative prefixی «i-» کە شکڵی نێگەتیڤی کاپیولای n/nyo بەهێزتر دەکا، کەوابوو دەبێ بەinyo.. لەوە دەچێ زازا کاریگەریەکی بەنسبەت بەهێزی لە ئەرمەنییەوە گرتبێت، کە لە دوورترین بەشەکانی باکووری ناوچەکەدا قسەی پێکراوە کە لە سەرەتای سەدەی بیست بەملاوە دانیشتووی کوردی تێڕژاوە.[٢١]

دیالێکتەکانی زازا کۆیەکی یەکپارچە نین: لە نێویاندا جیاوازی گرنگی دیالێکتی دەردەکەوێ، نەک تەنیا لەڕووی دەنگناسیەوە (وەکووsی دەرسیمی کە پێچەوانەی shیە لە هەموو جۆرەکانیتردا)، بەڵکوو لە وشەسازیشدا؛ بۆ وێنە، سیستەمەکانی راناوی تاکەکەسی بەشێوەیەکی بەرچاو لەیەک جیادەبنەوە. هەروەها پێویستە بوترێ ناوچەکانی زازاوێژ بە هیچ شێوەیەک تاکە زمان نین. بۆ

وێنە، کە١٢٧ هۆزی ناوچەی دەرسـیم کە لە لایەن Dersimi ریز کراون(١٩٥٢)، ٩٠یان زازان¬ و ٣٧ یان کرمانجی وێژن. نووسـەرانی پێشوو کە لە سەر زازا بابەتیان نووسیوە، وەکAlfred von lecog و خاچپەرەسـتی ئەرمەنی Antranig، لەسـەر ئەم بڕوایە بوون کە زۆربەی زازاوێژان کرمانجیشیان زانیوە و ئەوەی کە لە ڕاستیدا، لە نێوان کوردەکانی ئەم ناوچەیە، کرمانجی بۆ کار و باری بازرگانی وپێوەندیەکانی تری Lingua Francaبەکار هاتووە (گێڕاوە لە زمانی٢٠:١٩٣٢Hadack/Mann).[٢٢]

ئەوڕۆکـە کاتێ وێژەرانـی هەردوولا یەک دەکەون، لەوانەیە بۆ وتووێژکـردن زمانی تورکی بەکار بێنن.

هەنـدێ وەبیرهێنانەوەی کۆمەڵایەتی زمانەوانی کۆتایی: زازا تەنیـا وەک تایبەت لەلایەن کوردە خێڵەکیەکانـەوە قسـەی پێناکرێ، وەک لە وتەکانی دەرسـیمی دەردەکەوێ پتـر لە٩٠ خێڵی زازا وێژ هەیە.[٢٣] هیچ ڕوونکردنەوەیەک نیە لەسـەر ئەوەی کە ئەم خێڵانە دەنگ زازایانەی دەرسـیم بە ڕەچەڵەک گوندنشینی نائێڵەکی بووبێتن(هەروەها ڕوون نیە کە ئەوان ماوەیەکی زیاتر لە خێڵەکانی کرمانجی وێژ لەناوچەکەدا بووبێتن). بەکورتی، ئەوەندەی ئێمە تێیگەیشـتبێتین زازایی هەمیشـە لەلایەن(نیـوە) کۆچەرانی خێڵەکی و هەروەها جووتیارانی ناخێڵەکی قسـەی پێکراوە. وەک گۆرانی پێوەندیەکی گرنگ هەیە لە نێوان دیالێکتەکانی زازا و ئیسـلامی هێترۆداکس: ژمارەیەکی بەرچاو لە زازاوێژان ، بەتایبەت لە دەڤەری توونجەلی، عەلەوین، واتە شیعەی هێترۆداکسن؛ بەڵام زازاوێژان لە دەڤەرەکانیتر(واتە سیوێرێک، دیاربەکر، بینگوڵ) زۆربەیان سوننی ئۆرتۆدۆکسن.[٢٤]

ئەوەنـدەی پێوەنـدی نێوان زازا و ئایینی هێتێرۆداکس جێی سـەرنجە، ئەوەندەش لەیەکچوونی نێوان ئایینی عەلەوی و ئەلحەق.(cf.van Bruin essen ١٩٨٩a:١٣٩–٥١).

لە پراکتیکدا زازا هیچ نەریتێکی ئەدەبی نووسراوی نییە: سەرەتاییترین بەڵگەکانی نووسراوەی زازایـی دوو دانەmawludsن کە بە ئەلف بێی عەرەبی نووسـراون، لە سـەرەتای سـەدەی ٢٠ بڵاو بوونەوە، یەکیان لە١٩٣٠ لە دیمەشق؛ هەموو لێکۆڵینەوە ڕێزمانیەکانی پێشوو لەسەر وێژەیە.

یەکەمیـن هەوڵە جدیـەکان بۆ پێکهێنانی جۆرەزازایەک کە بۆ مەبەسـتەکانی پێوەندی مەدیا شـیاو بێ لە پێداچوونەوەیەکی Tir j لە کۆتایی حەفتاکاندا سەریهەڵدا. هەرچەند، دوای سێهەمین بڵاوکراوەی لە١٩٨٠ بەر بەست کرا. لەو کاتەوە، ژمارەیەکی بچووک لە نووسەران هۆنراوە، کورتەچیرۆک و وتـار لە گۆڤارەکانی هەندەران وەکووH v وەBerbang بڵاوکردۆتەوە کە بە کرمانجی و سـۆرانیش چەند بابەتێکیان لەخۆگرتووە و ئەوەندە نابێ کە گۆڤارگەلێک سەراسـەر زازایی بڵاوبوونەوە، وەک piya وRashti کە هەسـتێکی نیشـتمان پەروەری تایبەت بە زازا(داوای زازایستانێکی سەربەخۆ) دەجوڵێنێ؛ بەڵام لەوە دەچێ تەنیا بەدەست ژمارەیەکی کەم لە خوێنەران بگات. گەورەترین نووسەری زازای سـەردەم مالمیسـانیجە، کە ئێستا لە سـوید دەژی و بەردەوام هۆنراوە و بابەت دەنێرێ بۆ گۆڤارە جۆراوجۆرەکان؛ لـە١٩٨٧ فەرهەنگێکی تورکی- زازایی بڵاوکردەوە. لە ئەنجامدا، ڕەنگە جێی مەترسـی نەبێ ئەگەر بڵێین لەوە ناچێ زازایی ببێ بە ناوەندێکی بەربڵاو لە نووسـین و فێربوون، هەرچەند بەرزبوونەوەی ئاسـتی زانیاری وێژەرانی زازا، زۆربوونی ژمارەی نەواری کاسێتی مووزیک

بـــە زازایی (لەلایـــەن گۆرانی بێژانـــی  وەک ئەڵماز، ئلیک، کادری کاراگز، و جاروبار شـــڤان) رەنگە یارمەتیدەر بن بۆ زیندووڕاگرتنی زازا وەک زمانێکی وێژەیی لە پێوەندیەکانی مێدیادا.

## 2.پێوەنـــدی رەچەڵەکیانـــە و پێوەندیەکانـــی دیکـــەی نێـــوان زاراوە کوردیەکان.

ئێمـــە پیاچوونەوەیەکی کورتمان کرد بە ســـەر گرنگتریـــن لایەنەکانی زمانەوانـــی و زمانەوانی کۆمەڵایەتی ســـەرجەم زاراوە کوردیەکان. دیالێکتەکان یان ئەو گرووپە دیالێکتانەی کە باسمان کرد پێوەندییان بە یەکەوە یان بە زمانە هێند-و- ئێرانیەکانەوە چۆنە؟ بۆ ئەوەی تێبینیەکم هەبێ لەسەر پێوەندیەکانـــی رەچەڵەکی نێوانیان، من گرنگترین تایبەتمەندیەکانـــی phonetic دەنگی ئەوانم لە تابلۆی ژێرەوە ریز کردوە، کە لە بنەڕەتدا کورتکراوەی Blau ١٩٨٩ a,b..

**تابلۆی١- هەندێ لە isoglosses زمانەکانی ئێرانی رۆژئاوا**

| زازا | گۆرانی | سۆرانی | کرمانجی | فارسی نوێ | ئێرانی کۆن |
|---|---|---|---|---|---|
| و- | و- | خۆ | خو-/خۆ | خ | هو* |
| وەرد | وارد | خوارد/خۆ- | خوار- | خۆرد | |
| ج | ژ | ژ | ژ | ز | ژ* |
| جەن | ژێن | ژن | ژن | زەن | |
| ز | ز | ز | ز | د | ز* |
| زان- | زان- | زان- | زان- | د ن | |
| -م | -م | -و | و-/ڤ- | -م | - سم* ڤم،* |
| نام | ن م | ناو | ناڤ | ن م | -خم* |

تابلۆکـــە پێمان دەڵێ کە کرمانجی و ســـۆرانی دیارە بەشـــێکن لە گرووپـــی باکووری رۆژئاوای زمانەکانی ئێرانی، چون ئەوان لە هەندێ لە بەرچاوترین تایبەتمەندیەکان کە زمانەکانی باشـــووری رۆژئاوا لە قۆناخی فارسی کۆندا جیا دەکاتەوە هاوبەش نین، بەتایبەت olr.z گۆڕاوەبە-d، و گۆڕانی تازەی olr.j بە Npz- (شێوەیەکی پێوەندیداری dz- لە هەندێ بنزاراوەکانی زازای دەرسیم روو ئەدات، بەڵام دیارە کە ئەمە نموونەیەکە لە رەوتێکی تازە، تایبەت بە ئەم زاراوانە، لە لێک ســـاوەکانی مەڵا شووکراو palatalized fricatives و ئەفریکێتaffricates کە مەڵاشوویان نیە).

بەگشـــتی، هەرچەنـــد زمانی کوردی رەســـەن هەندێ لـــە تایبەتمەندیەکانی باشـــووری رۆژئاوا

لەخۆدەگرێ(مــەک کێنز١٩٦١ب:٧٩٨٦)، لەگەڵ زمانەکانی باشــووری رۆژئاوا وەکوو فارســی نوێ جیــاوازی هەیــە(cf.blau١٩٨٩b:٣٢٩). تابلۆکە هەروەها پێمان دەڵێ کــە زازا و گۆرانی، هەرچەند دیــارە کە هەردوو وەک یەک بەشــێکن لە گرووپــی باکووری رۆژئاوا، لــە دوو زاراوەکەی تر تەواو جیاوازن و زۆر لەیەک دەچن. لەڕووی دەنگناســیەوە، گرنگترین تایبەتمەندیەکانی جیاواز و دیاری ئــەم دیالێکتانــە گۆڕانێکە لە هێندوو ئێرانییەوە -هو* بــەرەو —و وەب* بەرەو ڤ-/و-؛ لەڕووی وشەســازییەوە لەگەڵ کوردی رەســەن وەهەروەها فارســی نوێ جیاوازن، بۆ وێنە، بە بەکارهێنانی ریشەکانی وا- (گۆرانی) یا ڤا (زازا)، لە باتی کرمانجی بژ-/گۆت-، سۆرانی گوت-/ڵ- یان فارسی نوێ گۆفت- ، بۆ کرداری «وتن». ئەمە ئەو راستیە دەسەلمێنێ کە زۆرجار لە وتووێژەکاندا دەبینرێ کە وێژەرانی زازا و گۆران زۆر ئاسانتر لە وێژەرانی زازا و کرمانجی یان گۆرانی و سۆرانی لەیەک تێدەگەن. هەرچەند جیاوازیەکانی نێوان زازا و گۆرانی نابێ بخرێنە پشتگوێ.(cf.Mann&Hadank١٩٣٠:٦٥—٦;١٩٣٢:٢٤-٦): بۆ وێنە، زۆربەی دیالێکتەکانی گۆرانی پێشــگری دەمکاتی ئێســتای ما/می- یان هەیە، لەحاڵێکدا ئێمە دیمان کە زازا پاشگری- ئان-/-ن- هەیە.

بێجگــە لە مەک کێنزی(١٩٦١ب)، تەنیا لەisoglosses دەنگناســی کەڵکم وەرگرتوە، چون دیارە زۆر یەک لە تایبەتمەندیەکانی وشەسازی لە رێگای جۆراوجۆرەوە وەرگیراون. هەرچەند، زانیاریەکانی دەنگ ناســیش روون نین. ســەلمێنەری ئەم راســتیە لە راناوی خۆگەڕاوەدایە، لە نێوان جۆرەکانی گۆرانیــدا، کــە بە دەگمەن لەوە دەچــێ پاڵێوراوێکیcandidate بەجێ بێ بــۆ وەرگرتنێکی تازە. لە شــەبەک ە، لە ماچۆ یو، لە بیارە[٢٥] و لە تەوێڵە هەورامی، وێ، هەر شــوێنێک لەگەڵ راناوێکی تاکەکەسی پاشگرە(وەک بەراوردێک: خۆگەڕاوە لە سۆرانی و کرمانجی خۆ یان خوێ یە، لە زازا خۆ و لە فارسی نوێ خود؛ تەنیا لە سۆرانی و فارسی نوێیە کە پاشگرێکی تاکەکەسی دەگرێت). لێرەدا لەوانەیە هۆکارەکانی وشەسازی تێکەڵ بە گۆڕانکاریەکانی دەنگناسی بووبێ. دیارە کە دیالێکتەکانی گۆرانی لەگەڵ فارسی نوێ جیاوازیان هەیە، بەڵام لە پاشگرێکی دەرخەری دەمکاتی ئێستا می/ مێ لە فارسی نوێ دەچن، هەروەها لە راناوەکانی تاکەکەسی enclitic ، کە لە داڕشتنەکانی خاوەنداریێتی possessive constructions و لە verbal inflection بەکاردەبرێن.(بۆ وێنە لە دەمکاتی رابردووی کرداره تێپەڕەکاندا لە ماچۆ). ئێســتاش بۆ ئێمە روون نییە کە چۆن ئەم تایبەتمەندیە هاوبەشانە هاتوونە ئاراوە.

Mann (xxIIIn:١٩٠٩) یەکــەم کــەس بوو کە پێی راگەیاندین جیاوازیەکانی نێوان زازا و گۆران لەلایەک و کرمانجی و سۆرانی لەلایەکیتر، هێند گەورەن کە ناتوانین بە جوانی دیالێکتە جیاجیاکانی زمانێک تاوتوێ بکەین. چەند ســاڵ دواتر (١٩٢١) Swoan ســەربەخۆ بە هەمان ئەنجام گەییشــت. نووسەرانی پیشــتر، وەک Lerch (١٨٥٧ وە Muller)(١٨٦٤)، سەیری زازایان تەنیا وەک تاکێک لە ناو دیالێکتە کوردیەکان دەکرد، هەڵبەت تاکێکە بۆ وێژەرانی دیالیکتەکانیتر تێگەیشتنی بەڕاستی سەخت بوو؛ Rich (١٨٣٦) لە باری ئەتنیکیەوە گۆرانی دەخستە ناو بازنەی کوردەکانەوە، هەرچەند جار و بار تووشــی گومان دەبوو، جوان ئاگاداری جیاوازیەکانی زمانەوانی و کۆمەڵایەتی بوو لەگەڵ

پیاوانی كوردی وێژی خێڵی جاف لە دەوروپشـــت. Mann لای وابوو زازا و گۆران دیالێكتی كوردی نیـــن بەڵكە لقێكی جیاواز لـــە زمانە ئێرانیەكان پێك دێنن. هەڵبەت مەبەســـتی ئەو لەم جیاوازیە رەچەڵەكیـــە تەنیا بواری زمانەوانی بـــوو، نەک بواری ئەتنیكی- هەرچەنـــد ئاماژە دەكا بە هەندێ تایبەتمەنـــدی جیـــاوازی كولتـــووری لە نێوان گـــۆران دا. ئەگەر زازا و گۆران لەلایەن دانیشـــتوانی ناوچەكەوە تا ســـەردەمی Mann (و ماوەیەكی دوور و درێژ بەملاوە) وەک دیالێكتی كوردی ســـەیر دەكـــران، بەم بۆنەوە بووە، كە بە گشـــتی، وێژەرانی زازا و گۆران لـــە رووی ئەتنیكیەوە وەک كورد ســـەیر كراون. بە واتایەكی تر، زمان خۆی لەخۆیـــدا پێوەرێكی ئەتنیكی جیاكەرەوەی گرنگ نەبوە، هەرچەنـــد دەیتوانی ببێ ئەگەر لەگەڵ هۆكارەكانی تر وەک ئایین، پێوەندی خێڵەكی، هتد، هاوكات رێكبكەوتایە.

ئەگەر بڕوانینە ئەو تێبینیانەی كە لێكۆڵەرانی دەرەوە پێشتر لەسەر ئەم بابەتە بوویانە بابەتەكە روونتر دەبێتەوە. نووســـەری گەشتیاری ســـەدەی حەڤدەهەم ئەولیا چەڵەبی لە سەیاحەتنامەكەی خۆیـــدا لە بەرگی چوارەمدا زازا دەخاتە ناو ریزی شازدە (شـــوێنی تر پـــازدە) دیالێكتی كوردیەوە؛ جێی ســـەرنجە، كە ئەو زمانی ناو كۆشـــكی پاشا كە لە بتلیس قســـەی پێدەكرا و، رۆژێكیان پێ ئەوت، دەخســـتە ناو دیالێكتە كوردیەكانەوە، هەرچەند بەڵگەكانی ئەو ئەم راستیە دەسەلمێنن كە ئـــەم زاراوەیە لەگەڵ چەند وەرگیراو لە ئەرمەنیەوە ئاشـــكرا دیارە كە توركییە (cf.Dankof ١٩٩٠). بـــۆ پێكهێنانـــی بەرەیەكی ئەتنیكی جگە لە پێوەری زمانەوانی دیارە كە لای ئەولیا پێوەری تریش بڕیاردەر بوون.

هاوشێوەی ئەمە، توێژەری پێشڕەوی دانیماركیCarsten Niebuhr (١٧٦٨)، كە لە نیوەی سەدەی حەڤدەهەمـــدا بە ناوچەكەدا دەگەڕا، لەســـەر رێگەی لـــە دیاربەكرەوە بەرەو ماردین راســـتەوخۆ لە ناوچەی زازاوێژەوە تێپەڕی، بەڵام تەنانەت بۆ ســـاتێک ســـەرنجی نەدا كە ئەم ناوچەیە گرووپێكی ئەتنیكـــی جیـــاوازی هەیە. چون خۆی توركی یان كوردی نەدەزانی، ئەو شـــارەزایانەی كە لەگەڵی بوون (دەبێ لەو پوختەتر و شـــارەزاتر بووبێتن) لێرە باســـی هیچ جیاوازیەكی ئەتنیكی دیالێكتی بۆ ناكەن. بەواتایەكی تر، لەو ســـەردەمەدا لەوە ناچێ كە زازاوێژانی لەم چەشـــنە لەگەڵ كوردەكانی تر جیاوازیەكی ئەوتۆیان بووبێت. لەو كاتە، ئایین پتر لە زمان ســـنوورێكی ئەتنیكی گرنگ بووە، بەڵام تەنانەت ئەم ســـنوورەش تـــەواو نەبووە: نیبووهی Niebuhy (لاپەڕ٣٧٠) بە ئاشـــكرا باژەڵان، لەک و ســـارلی دەخاتە ناو ریزی كوردەكانەوە. لەڕووی ئەتنیكەوە، بەم پێیە زازا و گۆرانی بۆ هەر مەبەســـتێكی پراكتیک یەكســـەر دیالێكتی كوردی بوون. پێچەوانەی ئەم دۆخەشـــمان هەیە (واتە دیالێكتێكە لەڕووی زمانەوانیەوە كوردی قســـەدەكەن، بەڵام وێژەرەكانی وەک كورد ســـەیری خۆیان ناكەن و وەک كوردیش نەناسراون). نیبووهی Niebuhyلەباری تەواو ئایینیەوە، سەیری یەزیدیەكانی دەكـــرد، كە وەک گرووپێكی ئەتنیكی جیاواز، بە كرمانجـــی دەدوێن بەڵام زۆرجار لەلایەن وێژەرانی كرمانجی سونیەوە وەک كورد سەیرناكرێن(cf.Van Bruinessen).

هەرچەند، لە چەند ساڵی رابردوودا سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی سكۆلاری كوردی، كە رادەگەیەنێ

کوردەکان بە رەچەڵەک زارۆئاستری Zaroastrian بوون، باوەشێکی ئاوەڵاتری بۆ یەزیدیەکان کردۆتەوە، کە ئێستا زۆرجار وەک پارێزەری بیروباوەڕی رەسەن و بە مانایەکی تر وەک «ڕەسەنترینی کوردەکان» سەیر دەکرێن. کەوابوو، کوردەکانی سوریە ساز و ئامادە لە بەرابەر جەماوەردا رادەگەیەنن کە ئەوان یەزیدین، وەک خۆیان پێی دەڵێن، «باوەڕت بێ بە زاراداشت».

لانیکەم تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، هیچ بەڵگەیەک نییە لە سەر زانیاری ناسنامەی زازا سکۆلاری جیاواز. لەوە دەچێ کە هۆکاری خێڵەکی، جوگرافی و بەتایبەت ئایینی لە هەموو کاتەکاندا گرنگتر بووبێت.[٢٦] تا ئەم نزیکانەش زازا بە هاسانی وەک دیالێکتێکی کوردی سەیر دەکرا، چون زازاکان وەک کورد ناسرابوون.[٢٧] هەر ئەمەش لەمەڕ وێژەرانی گۆرانەوە دەکرێ بوترێ. بەشێک بوون لە خێڵێکی تایبەت، یان گرنگتر لەمە، لە گرووپێکی ئایینی جیاواز، نەک لە جەماوەرێکی زمانەوانی، لەوە دەچێ تایبەتمەندییەکی ئەتنیکی گرنگتری بووبێت، لەم بوارەدا، ئەوان لەگەڵ کوردە کرمانجی وێژەکان هیچ جیاوازیەکیان نیە.

سەرهەڵدانی هەستێکی شوناسی کوردی هاوبەش لە نێوان گشت کوردەکان، بە لەبەرچاو نەگرتنی چینی کۆمەڵایەتی، پێوەندی خێڵەکی یان ئایینی، رووداوێکی بە بەراورد تازەیە (cf.Van Bruiessen١٩٨٩b)؛ سەرهەڵدانی هاوچەشن لەوە پێش، نەگۆڕ و هەتاهەتایی نەبووە: لە پێوەندی لەگەڵ رووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی دنیای دەوروبەر هاتۆتەئاراوە. جیاوازیەکانی ئایینی و خێڵەکی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ پێداگریان کرد. بۆ وێنە، هۆکارگەلی بڕیاردەر لە بەشداریکردنی شۆڕشە مەزنەکانی کوردی لە کۆماری تورکیە (شێخ سەعید، دەرسیم) ئایینی یا ئەندامێتی لە هۆزێک یان هاوپەیمانی هۆزێک بووە، نەک هۆکارگەلی زمانەوانی. لە شۆڕشی شێخ سەعید، بە رێبەرایەتی کوردە سونیەکانی زازاوێژ، هاوپەیمانێتی میلی کرمانجی وێژ و هۆزەکانی جبران و هاسانان، هۆزەکانی عەلەوی کرمانجی وێژ چالاکانە دژ بەو شۆڕشە وەستان: سنوورەکانی ئایینی، خێڵەکی، نەک زمانەوانی لەم بوارانەدا چارەنووس ساز بوون (cf Olson ١٩٨٩:٩٥). لە شۆڕشی دەرسیم لە١٩٣٧-١٩٣٨ تەنیا هۆزەکانی عەلەوی بەشداریان کرد. لە چەند ساڵی رابردوودا، لەگەڵ سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمێکی سکۆلاری کوردی و لە ژێر کاریگەری سیاسەتی توندی حکوومەت، کەمتر بایەخ بەم سنوورانە دراوە. لە کۆماری تورکیە، زازاوێژ و کرمانجی وێژ ، کوردەکانی عەلەوی و سوننی وێڕای یەک لە ژێر زوڵم و هەوڵی بەزۆر سڕینەوەدا چەوساونەتەوە، بە بێ لەبەرچاوگرتنی هاوپەیمانێتی ئایینی و هیتر وێژەرانی کرمانجی، سۆرانی و گۆرانی وەک یەک، چ مسوڵمانی ئۆرتۆدۆکس یا هیترۆدۆکس، لە سێدارە دراون. هاوچەشن، وەک لە بەشی ١ دیمان، سیاسەتەکانی حکوومەتی ئێراقی بوون بە هەوێنێک بۆ درووستکردنی هەستێکی ناسنامەی کوردی هاوبەش لە نێوان گرووپی ئەتنیکی جیاواز، بەڵام وێڕای یەک زوڵم لێکراو.

ئەمە تەنیا بەڵگەیەکە لە مەبەستی سەرەکی کە نەک هۆکاری «دیار» وەکوو زمان (لە مانای رەچەڵەکی و زمانەوانیدا)، بەڵکوو هۆکاری «نادیار»یش، وەک بڕوا و بایەخ دان بەخۆی گرێدراو بەم «ڕاستیانەوە» (وەک دیمان،بۆ تاو و توێکردن ئاوەڵان) لە ناساندنی ناسنامەی ئەتنیکیدا رۆڵی

گرنگ دەگێڕن (pace Isajive ١٩٧٤).

خۆی لەخۆیدا، پەیڤین بە کرمانجی- سۆرانی- گۆرانی یان زازا ( یان هیچ یەک لەمانە، وەک زۆر یەک لە کوردەکانی تورکیا) لە دامەزراندنی ناسنامەیەکی ئەتنیکی سەرەکی کەسێک ناتوانین بڵێین بەڵگەی تەواوە؛ بەڵکوو هەست بە گرنگیەکە کە زمانی سەر زار دەیقۆزێتەوە بۆ وێژەرانی خۆی. (cf Fishman ١٩٧٧). ناسنامەی گرووپێکی ئەتنیکی لە ڕێگای دانووستان لەگەڵ گرووپەکانی تر دەردەکەوێ و گەشەدەستێنێ. (cf. Barth ١٩٦٩)؛ سنووری ئەتنیکی نەگۆڕ و هەتاهەتایی نین، بەڵکوو دەکرێ درووست بن، لە ناو بچن، یان لە هەر کاتێکدا لە قەڵەم کەون، جا چ بە ویست و خواستی خۆ لە ڕێگای ووتووێژ و دانوستانی نێوان گرووپە هاوبەشەکانی دەسەڵات و پلەی کۆمەڵایەتی بێ، یان بە زۆر لە ڕێگای ڕووداوی گەورەی سیاسی کۆمەڵایەتی یان هەوڵەکانی بە ئانقەستی حکوومەت.

خاڵێکی پێوەندیدار بە باسەکە ئەمەیە کە بۆچوونی درووست بوونی (گرووپەکانی) ئەتنیکی کوردی، بەگشتی، بەکەڵکترە لە بۆچوونی سەرەتاکەی ( یان). زۆرجار، کێشەی سەرەتاکان ئەوەندەی کە لە ڕاستیدا بە هەڵە دادەنرێت ئەوەندە هەڵەی تێدا نیە. لە باتی ئەوەی کە بەفیڕۆ بگەڕێین بە دوا سەرەتاکانی زازا و ئەهلی حەق یان یەزیدیەکاندا، باشتر وایە بڕوانین کە چۆن ئەمانە بوون بە گرووپی ئەتنیکی جیاواز. ئەو ڕەوتانەی دێنە گۆڕێ لە باری بنچینەی ئەتنیکیەوە باشتر دەبینرێن تا سەرەتا: لەراستیدا ، ئەدەبیات پڕە لە وێنەی جۆراوجۆر لە کەسان یان گرووپگەلێک لەو کەسانەی کە بە تێپەڕاندنی سنووری ئەتنیکی جۆراوجۆر بوون بە کورد. وێنەیەک لە گرووپێکی خێڵەکی کە بەم زووانە بوون بە کورد هۆزی ئیلی کاراکێ یا کاراگێ یە (لەVan Bruiessen ١٩٨٩bیش باسی لێ کراوە): ئەمە هۆزێکی تورکمانی بوو لە ئانتالیای ڕۆژئاواوە، بەڵام سوڵتان سەلیمی ١ (١٥١٤ ١٥٢٠) شوێنی بەشێک لەو هۆزەی لە ناوچەی کاراجاداگی نزیک دیاربەکر دووبارە دۆزیەوە؛ ئەم بەشە بەرەبەرە لە ڕێگای زیواجەوە لەگەڵ کوردەکانی دراوسێ بوون بە کورد و دوای ئەوەی کە لە سەدەی نۆزدەهەم سەرلەنوێ بەرەو باشووری ئانکارا ڕەوانە کرانەوە، هەر کورد مانەوە.[٢٨] وەک دیارە، ئەم گرووپە ڕاگوێزراوە بە گشتی گۆڕانێکی قورسی زمان و ناسنامەی ئەتنیکی بەسەردا سەپاوە. بەڵگەیەکیتر ژمارەیەکی زۆر لە ئەرمەنیەکانە، بەتایبەت ئەوانەی کە لە ناوچەی دەرسیم دەژین، کە لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا هاتنە سەر دینی ئیسلامی (هێترۆدۆکس) و لە ئاکامدا لە بڕوایەکی بە بەراورد تازەدا بوون بەکورد (cf. Molyneux ١٩١٤).

کەوابوو باشتر وایە لە مانایەکی ئەتنیکی بەربلاوتردا، نەک لە مانایەکی زمانەوانی بەرتەسکتردا، زازا و گۆران وەک «دیالێکتەکانی کوردی» دابنێین. هەنووکە، وێژەرانی ئەم دیالێکتانە بەگشتی خۆیان وەک کورد دەناسن.

## 3. کاریگەریەکانی گۆرانی لەسەر زمانی کوردی ناوەندی(سۆرانی)

وەک لە پاراگرافی پێشوودا دیمان، لە مانایەکی بەربلاوتردا لە نێوان دیالێکتە کوردیەکان، کرمانجی و سۆرانی لەلایەک، زازا و گۆرانی لە لایەکیتر، جیاوازی رێزمانی دیار بەدیدەکرێ. هەرچەند، مەک کێنزی یەکەمین کەسە ئاماژەی پێکرد (١٩٦١ب:٨١ف ف)، سۆرانی لەگەڵ کرمانجی لە چەندین خاڵدا پێکەوە جیاوازیان هەیە. ئەم تایبەتمەندیە جیاکەرەوانە لە دیالێکتی ناوەندی و باشووریدا رەنگە بە هۆی کاریگەری گۆرانیەوە بێ.

مەک کێنزی چوار بوار ریز دەکا کە «لەواندا دیالێکتی ناوەندی و باشووری وا دیارە ڕاستەوخۆ لە گۆرانی وەریان گرتبێ»:

١.گەردانکردنی کرداری کارلێکراو: مۆرفیمی کارلێکراوی سۆرانی —ر-/را بەرابەرە لەگەڵ —ی-/یا- لە گۆرانی و زازا، لە حاڵێکدا کرمانجی کرداری یاریدەدەری هاتن بەکار دێنێت.

٢. پاشگرێکی تایبەتی —ئێکێ، کە لە زازاشدا بەکار دێت؛

٣. پاشگرێکی تیژ —ئێوێ، بەرابەرە لەگەڵ پێشکرداری ڤێ- کرمانجی؛

٤.داڕشتنێکی «ووشەی لێکدراوی کراوە» (open compound) لەگەڵ پاشگرێکی —ئێ بۆ دەستەواژەی ناویی تایبەت ((definite noun phrases لەگەڵ ناتۆرەیەک (epithet) (کی ئێ جوانێکێ، «کیژەجوانەکە»). پتر لە وەرگرتنی راستەوخۆ، مەک کێنزی کاریگەری ناراستەوخۆ دەبینێ .

٥. پاراستنی راناوە تاکەکەسیەکانی enclitic، کە لە کرمانجی و زازادا فەوتاون؛

٦.سیستەمێکی ئیزافەی ئاسان کراوە: لە دیالێکتەکانی کوردی ناوەندی کە سیستەمێکی case دەپارێزن، ئیزافە لەگەڵ مۆرفیمی caseی ناڕاستەوخۆ بوون بە یەک؛ لەو دیالێکتانەی کەcase یان نیە، بوو بە تاقەشکڵی —ئی. مەک کێنزی ئەم پێکهاتەیە دەگەڕێنێتەوە بۆ «بەرەنگاربوونەوەی نێوان دوو سیستەم»ی کوردی ناوەندی و گۆرانی (١٩٦٢ب:٨٢).

ئەم تایبەتمەندیە هاوبەشانە «مەک کێنزی دێنێتە ئەم ئەنجامەی کە substratumێکی گۆرانی باڵی کێشاوە بەسەر دیالێکتەکانی ناوەندی و باشووری زمانی کوردی، لەحاڵێکدا دیالێکتەکانی باکوور تا رادەیەکی بەرچاو رەسەنایەتی خۆیان پاراستوە». (١٩٦١ب:٨٦). لەڕاستیدا ئەمە تەنیا ئەنجامێک نیە لێرەدا دەتوانین پێی بگەین. بۆ شیکردنەوەی ئەم یەکگرتنەوەconvergence لە رێگای جۆراوجۆرەوە دەتوانین هەوڵ بدەین؛ وەکوو داهێنانەکانی بەرابەر لە سرووشتێکی شێوەی Sprachbund، وەک وەرگرتنەکانی شکۆدار prestige borrowings،یان وەک داهێنانگەلیinnovations کە تایبەتن بە کرمانجی. لانیکەم دوو دانە لەو بوارانەی کە ریزکران دەتوانین بڵێین لە باپیرەگەورەیەکی هێندو-ئێرانی هاوبەشەوە بە میرات ماون: ئاوێستا و فارسی کۆن مۆڕفیمی کارلێکراویان هەیە بە شێوەی گۆرانی (-ییا-، -یا، وە—ی-/-یا بەڕیز)، راناوەکانی enclictic لە فارسی کۆن و نوێ لە پراکتیکدا وەکوو راناوەکانی enclicticی هەندێ لە جۆرەکانی گۆرانیە.

ئاشـــکرایەکە، بەرژەوەندوازی خۆی لە خۆیدا بۆ کاری شـــیکاری هاندەر نیە، لێرە مەبەســـت بۆ سابستراتمێکە و لەم بوارانەدا ئەرکی قورسی شیکاری لەوە دەچێ زیاتر بکەوێتە ئەستۆی داهێنانەکانی تایبەت بە کرمانجی (لەدەستدانی گەردانکردنی کرداری کارلێکراو و ڕاناوەکانی enclictic)[٢٩] .

هاوچەشـــن، بۆ بیرۆکەی ئاســـانکردنی ئیزافە بە هۆی سابســـتراتمێک، هیچ جۆرە بەڵگەیەکی تایبەتمان لەبەردەســـتدا نیە: ڕەنگە ئەمەش بە هـــۆی گۆڕانە ناوخۆییەکانی کوردی ناوەندی بێ بە بەراورد لەگەڵ نەبوونی سیستەمی case (لای مەک کێنزی هیچ هۆکارێکی دەرەکی نیە).

ئەمە ناوبەندەکانی —ئێوێ، ئێکێ، و دارشـــتنی «وشەی لێکدراوی کراوە» (open compound) بۆ ما دێڵێتەوە،– لەڕاستیدا بنەمایەکی لاوازتر بۆ تاوتوێکردنی سابستراتمێک. لەوە دەچێ زاراوەی گۆرانی کاریگەریەکی ئەوتۆی لەئاســـتی دەنگناسی و ڕستەسازی بە سەر دیالێکتی سۆرانی نەبێت؛ هەرچەند کاریگەریەکی بەرچاوی لە ئاســـتی وشـــەدا هەیە. فەرهەنگی سۆرانی وەهبی و ئێدمۆندس چەنـــد وەرگرتنێکی گۆرانی ناو دەبا، بەڵام لیســـتەکەیان تەواو نیە. مـــەک کێنزی (١٩٦٦) چەندین بەڵگەی وشەیی دێنێتەوە کە هەم لە سۆرانی و هەم لە گۆرانی، نەک لەکرمانجیدا، دەبینرێن؛ ئەمانە بریتین لە بابەتی تایبەت بە کولتوور وەکوو جل و بەرگ و کەرەســـە، هەروەها وشـــە ســـەرەکیەکان وەک دەســـتەواژەی تایبەت بە ئەندامەکانی لەش و ناوی ڕەنگە ســـەرەکیەکان. هەڵبەت جێی وەبیر هێنانەوەیە زۆر یەک لەم بابەتانە لە فارســـی نوێدا دەبینرێن (ک م.کەســـک سۆر. سەوز؛ گۆر. ساوز ف ن. ســـەبز) و وێژەرانی ســـۆرانی هەم وشـــەی کوردی و هەم گۆرانی بەکار دێنن (واتە ڕەش یان ســـیا، گۆر. سیاو)¬ پیشـــاندەرێک لە وەرگرتن نەک گۆڕان. ژمارەکان هەندێ جیاوازی زەق لە نێوان ســـۆرانی و گۆرانی دەردەخەن، واتە ســـۆر. سێ گۆر. یەر .بە کورتی، بەڵگەی وشەیی وەک تایبەت بیرۆکەیەکی سابستراتم ناگەیەنێ.

بەشـــیکاریەکەی مەک کێنزی کێشە گشـــتیەکانی قووڵتر کرد. یەکیان ناڕێکی دیار و بەرچاوی ڕادەی کاریگەری سابستراتمە لە سەر زازا و گۆرانی. ئەوەندەی کە کوردی ناوەندی تایبەتمەندیەکانی گۆرانـــی لەخۆگرتوە، کوردی باکوور ئەوەندەی لە زازا نەگرتوە، هەرچەند بە بۆچوونی مەک کێنزی، دیالێکتەکوردیەکان، کە ســـەرەتایان زیاتر وەک یەک دەچێ، بە شـــێوازێکی هاوچەشـــن دیالێکتی سەرەکیان داپۆشیوە. کەوابوو بۆچی بە بەراورد لەگەڵ تایبەتمەندیەکانی گۆرانی لە کوردی ناوەندیدا، زازا هیچ پاشـــماوەیەکی تەنانەت ورد و دووریشـــی بە ســـەر کرمانجیدا بەجێ نەهێشت؟ یان ئەگەر خۆمان بە کوردســـتانی ئێراق ببەستینەوە، بۆ چی جگە لە باشووریترین دیالێکتەکانی هاوشێوەی گۆرانی هیچیتر پاشـــماوەی بەسەر جۆرەکانی دراوسێی کوردی ڕەسەن جێنەهێشتوە؟ دیمان کە لە سەرێ بەرەو ناوچەکانی کرمانجی وێژ لە باکووری مووسڵ، دوورگەی دیالێکتی هاوچەشن دەبینرێن. بـــە نەبوونی هیچ بەڵگەیەکی مێژوویـــی و غەیرە زمانەوانیتر، هیچ هۆیەک نیە بۆ ئەم بیرۆکەیە کە خێڵە کوردیەکانی هێرشـــبەر کە بەشـــێکیان چینی زازا/گۆرانی یان خســـتەژێر رکێفی خۆیان وە بەشێکیان بەرەنگاری بوونەوە، لە دوورترین ناوچەکانی باکوور و باشووری دەسەڵاتی نوێی خۆیان، ڕووبەڕووی هەل و مەرجی لە بنەڕەت جیاواز بووبێتنەوە.[٣٠]

کێشەیەکی تر ئەم راستیەیە کە بە نەبوونی بەڵگەی مێژوویی کۆمەڵایەتی سەلماندنی کاریگەری سـاباتراتل، قـورس و دژوارە (cf. Thomason & Kaufman ١٩٨٨: ١١١)، ئەمـە تەواو جیاواز لەو راستیەیە کە مەک کێنزی لە بەکارهێنانی وشەی «سابستراتە» وردەکاری ئەوتۆی نیە.[٣١] لە بابەتێک کـە لە ژێر لێکۆڵینەوەدایە، زانیاریەکی ئەوتۆمان جگە لـە پێکەوەنانەوەکان reconstructions، لە هەمبەر داڕشـتنی چ سابسـتراتل و چ زمانی مەبەست لە سەردەمی بەناو پێش مەغوولی کاریگەری گۆرانی لەبەردەسـتدا نیـە. ئەگەر بمانەوێ بە وردی لێکیدەینەوە کە کاریگەری سابسـترات چیە، کێشەیەکی تەنانەت ئاڵۆزتر سەرهەڵدەدا. لەڕاستیدا، Substrata تەنیا جۆرێکی تایبەتن لە گۆڕانی زمان لە رێگای فێربوونی ناتەواوی زمانی مەبەسـت.(ibid.p. ٣٨f .) لە بابەت گۆرانی — سـۆرانی، ئەمە بریتیە لە گرووپێک لە وێژەرانی گۆرانی کە ناتەواو فێری «سۆرانی سەرەتایی» بوون و دواتر ئەم زمانە ناتەواوە لە نێوان تەنانەت ئەو کەسانەشدا کە سۆرانی زمانی زگماکیان بووە بە ئیستاندارد ناسـراوە. بەگشـتی بەڵگەی مێژوویی بۆ رووداوێکی لەو چەشنە لەبەردەستدا نیە، جگە لە هەندێ نیشـانە کە لە١٠٠ سـاڵی رابردوو یان پێشتر ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە ویژەرانی گۆرانی تواندبیتنەوە – بـەڵام ئەمە سـەردەمێکی زۆر تازەترە لـەوەی کە مەک کینزی ئاماژەی پێـدەکا. چون بەڵگەی میژوویی بۆ رووداني سابسـتراتمێک لەبەردەسـتدا نیە، مەک کینزی بـەرەو بیرۆکەیەکی یەکجار بەهیزتر راکیشـا کە جەماوەری زازا، وەک گۆران «کە سەرەتاکەیان دەگەرێتەوە بۆ گویی باشووری دەریای خەزەر»، واتە بۆ دەیلەم، لە لایەن «بەدەنەی سەرەکی کوردەکان» کە دواتر گەیشتن بەرەو رۆژاوا پاڵنران (١٩٦١ب:٨٦) دواتر دەستدرێژیەکی تری کوردەکان بەرەو باکوور «بوو بە هۆی دەست بەسەردا گرتنیان و بەرەبەرە راکێشانی هەموویان جگە لە گۆرانی پاشماوە نەبێ»[٣٢]. ئەم بۆچوونە، لەمەڕ گۆران/زازا وەک «دانیشـتوانی بەر لە-کوردی» ناوچە کە لەلایەن شـەپۆلەکانی هێرشبەری کۆچەرانی کوردەوە پاڵنرابیتن و دەست بە سەریاندا گیرابێت، پڕ بەپێست ئیستانداردە.

ئێدمۆنـدس (١٩٥٧:١٢) جۆرێکی تایبەتیتر بۆ هەمان بۆچوون دەچێ: بە بۆچوونی ئەو گۆرانی وێژانی نا-خێڵەکی دانیشـتوانی «ڕەسـەنی» ناوچەکە بوون کە لەلایەن شەپۆلەکانی «کۆچەرانی کوردی-وێژی رەشۆکیەوە» دەست بەسەریاندا گیرا.

هەرچەند جیاواز لەم راسـتیە کە زانیاری زمانەوانی لەوە ناچێ سابسـتراتمێکی گۆرانی بە رەوا بزانێ، لێکدانەوەی لەم چەشـنەی ئێمە دەبێ لە رووی ووریاییەوە بێ. پێکەوەنانەوەکانی زمانەوانی وەکوو زمانە سـەرەتایەکان چەمکێکی تەواو بیردۆزانەیە و، لەڕاستیدا ناکرێ بە هیچ جۆرێک لەگەڵ سـەرهەڵدانە مێژوو ئەتنیکیەکان بەرابەری بکرێت، کە هیچ نەبێ لـە بوارە پێوەندیدارەکانی وەک مێژوو، شوێنەوارناسی، مرۆڤ ناسی بەڵگەی چەسپاوی هەیە. بەڵگەکانی زمانەوانی تەنیا زمانەوانین. تەنانـەت ئەگـەر روونکردنەوەیەک لە بابەت کاریگەری گۆرانی بەسـەر کـوردی ناوەندی لە بواری سابسـترایمێکی زمانەوانیەوە درووست بێ، بوونی سابسـتراتیمێکی گۆرانی نادیاری دانیشتوانی کوردی ناوەندی و باکوور ناگەیەنێ. هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نیە ئەگەر وایدانێین کە لە کاتێکی دیاریکراودا گۆران یان وێژەرانی کوردی ناوەندی ئێستا گرووپێکی هاورەگەز و یەکگرتوو

لە ئاست زمانەوانی، کۆمەڵایەتی، یا ئەتنیکی دامەزراندبێت.

لەڕاستیدا، بەڵگەی مێژوویی و هیتریش هەن کە ئاماژە بە هەل و مەرجێکی ئاڵۆزتر لەوە دەکا کە پێکەوەنانەوەکانی زمانەوانی بۆمانی باس دەکا. Van Bruinessen (١٩٨٩a:ch٢) وتوویەتی کە بۆچوونی دەست بەسەرداگرتن و هێنانە ژێر رکێفی دانیشتوانێکی گۆرانی-پەیڤی رەسەن کە خۆی لە دەیلەمەوە سەریهەڵدابێ (وەک ئێدمۆندس١٩٥٧:١٠ دەڵێ تەواو نا-خێڵەکی) لەلایەن هۆزەکانی کوردی وێژەوە یەکجار ساویلکانەیە. هیچ گرووپێکی ئەتنیکیش گشتێکی یەکپارچە نەبووە و سەرچاوەگەلی مێژوویی هەن کە رەوتگەلێکیتر دەردەخەن. بۆ وێنە، مینوورسکی (١٩٤٣:٧٨) دەڵێ کە «گۆران وەک هۆزێکی شەڕکەری تازەی سەدەی دەهەم ئاماژەی پێدەکرێ» و (لاپەڕی ٨٤) ئاماژەدەکا بە توێژێنەری میسری سەدەی چاردەهەم شەهابەدین ئەلئوماری، کە نووسیویەتی دوا هێرشەکانی سەدەی سێزدە و چاردەی مۆغۆل، کوردەکانی شارەزوور بەرەو سووریە و میسر ئاوارەبوون و وڵاتەکەیان لەلایەن نەتەوەیەکیتر هاسانە/هاسانوو داگیر کرا کە ئەندامەکانی کوردی رەسەن نین. بە بڕوای مینوورسکی وشەی «هاسانە» ئاماژە بەو هۆزانەی گۆرانی دەکا کە جێگری دانیشتوانی کوردی پێشتر بوون لە ناوچەکە؛ بەواتایەکیتر، ئەگەر ناسنامەکە ڕاست بێ، ئەم سەرچاوەیە هەڵوێستێکی دژ بە بۆچوونەکانی ئێدمۆندس و مەک کێنزی دەگرێ.[٣٣] شەهابەدین زۆرتر لەمە باس دەکا و دەڵێ کە گۆران بریتی بوون لە شەڕکەرەکان و رەشۆکیەکان، کە درووست بە پێچەوانەی بۆچوونی گۆرانە وەک جەماوەرێکی وەرزێری رەبەق ناخێڵەکی.

بەڵگەی مێژوویی تر هەن کە ئەو رەوتانەی دێنە ئاراوە ئاڵۆزترن لەوەی ئێدمۆندس و مەک کێنزی بۆی دەچن:

١) Rich (٢٠١، I) ئاماژە دەکا بە شازادەکانی گۆران لەگەڵ هۆزە کوردیەکانی ژێر دەسەڵاتیان. بە واتایەکیتر، گۆران بە هیچ شێوەیەک تەنیا رەشۆکی نا-هۆزی دەست بە سەردا گیراوی ناوچەکە نەبوون. گۆران هەر خۆیان لە رووی هۆزیەوە دەیانتوانی خۆیان رێکبخستایە و تەنانەت باڵادەستی هۆزەکانی نا-گۆرانی بوونایە. (١٩٨٩a cf. Van Bruinessen)

٢)بەپێی شەرەفنامە ((٨٢:II,tomeI، حاکمانی ئەردەڵان لە ئەندامێکی بەرەی مەرواریدی دیاربەکرەوە سەرهەڵئەدەن ((١٩٣٠:٢٠ cf.Mann/Hadank.

٣) ئێدمۆندس (١٩٥٧: ١٩٠٤) دەڵێ کاکەیی (گۆرانی وێژ) و ئاینەکەیان دیارە سەرەتاکەی لە لۆڕستانەوەیە.

بەپێی ئەم لێکدانەوە هیچ پێویست ناکا وایدابنێین کە گۆران یەک جێ لە دەیلەمەوە هاتبێتن، یان بە کۆمەڵ لە باشووری ناوچەی دەریای خەزەرەوە سەریانهەڵدابێت.

هەرچەند، کێشەیەکی گشتی لەمەڕ سەرچاوە مێژوویەکانەوە ئەوەیە کە ئێمە دەبێ ئاگاداری نادیاربوونی ووشەی «گ ران/گۆران» (وە، هەر بەو شێوە، وشەی «کورد») بین: وەک مینورسکی ١٩٤٣ وە٢.١٩٨٩ch Van Bruinessen) ئاشکرایان کرد، «گۆران» دەکرێ وەک ئاماژە بۆ بەرەیەک ،

هۆزێک، یان بەرەیەکی خێڵەکی، یان تەنانەت چینێکی کۆمەڵایەتی بەکار بێت. [٣٤]

لــە کۆتاییــدا، دەبێ هۆشــمان بێ وشــەیەکیان بەجێــی ئەویتر بــەکار نەهێنین. بــۆ وێنە، Butyka (١٨٩٢:٢٠٩)ئاماژە بە هەبوونی گۆران دەکا لە ناوچەی دەرســیم، کە لە ناوچەی ســەرەکی گۆران یەکجار دوورە؛ بەڵام ئەو بە ئاشکرا وشەکە وەک ئاماژە بە چینێکی کۆمەڵایەتی نەک گرووپێکی ئەتنیکــی بــەکار دێنێ. زۆر لەوە دەچێ کە وشــەی گۆران لە ماوەی گۆڕانی سیاســی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆردا، گۆڕانێکی مانایی بەسەردا هاتبێ، واتە لەباری ئەتنیکیەوە تا باری کۆمەڵایەتی –ئەگەر هەر لە بنەڕەتدا تاکە مانایەکی ئاشکرا و جیاوازی بووبێت.

بە واتایەکی تر، دیمەنی سابستراتمێکی گۆرانی بە پێی بەڵگەی زمانەوانی، هەروەها کۆمەڵناسی و مێژوویی نەشــیاو و ناپەســەندە. لەباتی ئەمە، حەز دەکەم ئاماژە بەوە بکەم کە کاریگەریەکانی گۆرانی بەســەر کوردی ناوەندی و باشــوور دەکرێ لە ئاکامی وەرگرتنی بەشــکۆوە بێ لە کاتێکی بــە بەراورد تــازەدا. مادام گۆڕانێکی زمانەوانی ســەرەکی لە نێوان «گــۆران» دا روویدابێت (کە بێ شــەرم ناوێکی هەڵەیە بۆ گرووپی ئەتنیکی وەک گشــتێک)، توێژینــەوە، ئەنجام دراو لەلایەن شارەزایانی جۆراوجۆری ناوچەوە، لەسەر رووداني گۆڕانێکی لەو چەشنە لە ١٥٠ساڵی رابردوودا، جێی ســەرنج و بیرکردنەوەیە. بەڵگەی مێژوویی بەر دەست ئەوە دەسەلمێنێ کە لانیکەم بۆ وەرگرتن cf. Thomason & Kaufman) ١٩٨٨: ١١٣) یەکێک لە پێشــمەرجەکان جێبەجێ کراوە، واتە پاراستنی درێژخایەنی هەردوو زمانی سەرچاوە و مەبەست لە هەل و مەرجی پێوەندیداردا: وەک دیمان، هەردوو زمان ئێستاش قسەی پێ دەکرێ.

هەروەها، وەک شتێکی سەلمێنراو، باکگراوندێکی کۆمەڵایەتی کولتووری خۆی لەخۆیدا رێخۆشکەرە بۆ وەرگرتنێکی بەشــکۆ: لە سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەم، بارەگای ئەردەڵان، کە گۆرانی وەک زمانــی بارەگای خۆی هەڵگرتبوو، لەوپەڕی کاریگەری کولتووری و سیاســی خۆیدا بوو. کاریگەری زمانەوانی ئەم بارەگایە چەندە لەسەر وتووێژ بوو، ئەوەندەش لەسەر ئەدەبیات بوو: وەک باسمان کرد، هەڵبەستوانانی میرنشینی بابان لە سلێمانی لە سەرەتادا بە زاراوەی گۆرانی دەیاننووسی؛ کاریگەری لەســەر جۆرەکانی سۆرانی وێژەدەکرێ بەهۆی شکۆداری سیاسی و کۆمەڵایەتی دیالێکتی بارەگا بێ لە پێوەندیی تجاری و نافەرمی تردا، یان بە هۆی ناوداریێتی گۆران وەک ناوەندی ئەدەبیاتێکی بەرز، جاروبار وەک زمانی ســتران بەگوێی جەماوەر گەیشــتوو، [٣٥] کە رەنگە ماوەیەکی درێژ دوای کزبوونی کاریگەری سیاســی بارەگای ئەردەڵان بە جوانی خۆی پاراستبێت: تەنانەت ئێستاش هەورامیەکان لە نێوان دانیشــتوانی سلێمانیدا بە زیرەکی و کارامەیی زیاتر ناسراون. هەڵبەت، ئێمە دەبێ وریا بیــن کە هەل و مەرجــی کۆمەڵایەتی مێژوویی تایبەت وەک لەڕاســتیدا بەڵگە بۆ ئاکامی پێوەندی زمان نەبینین. cf. Thomason & Kaufman (١٩٨٨: ٤٦-٤٧)، بەڵام لانیکەم ئەم زانیاریە مێژوویە بەگراوندێکی پەسەندکراو لەمەڕ پێوەندی زمان کە دڵنیاین روویداوە، دەخاتە بەر دەستی ئێمە.

دیارە کە ئەمە کێشەی زۆر دەخاتە بەردەمی ئێمە: بۆ وێنە، دوورگەکانی گۆرانی یان دیالێکتەکانی پێوەند بە گۆرانی لە ئێراق چۆن ســەریانهەڵدا؟ چۆن بەڵگە بێنینەوە لە سەر پێوەندیەکانی نێوان

ئایینـــی هێترۆداکس و هەگبەکانی هێترۆلینگوال لە ئێـــراق و تورکیا؟ لێرە دەرفەتی لێکۆڵینەوەی ورد و پوخت لەسەر بابەتەکەمان نیە، بەڵام دوو خاڵی سەلمێنراو دەکەونە بەرچاو: یەکەم، ئایینی «تایبـــەت بە گۆران» ی ئەهلـــی حەق لەگەڵ بیروباوەڕی عەلەوی لە دەرســـیمی زازاوێژ و لەگەڵ هەگبەکانی شـــیعەی هیترۆداکس کـــە جاروبار لە باکووری ئێراق بـــە زمانەکانی تایبەت بەگۆرانی دەدوێن، پێوەندی و تایبەتمەندی هاوشێوەیان بوو.

دووهەم، ئەم پێوەندیانە ناکرێ بە تەواوی لە بواری ســـەرەتاکانی هاوچەشـــنەوە بزانرێن، وەک مووســـا (١٩٨٨:٤٤٧) و، ( cf. Van Bruinessen١٩٨٩a١٤٧-٩)[36] هەوڵی بۆ ئەدەن؛ چون زۆربەی ئەم ئایینانە لەوە دەچێ لە دەســـتوورەکانی سۆفی (و رەنگە لە هۆزەکانی تورکمان) ەوە سەریانهەڵدابێ کە لە ناوچەکە بەرەبەرە بەکردەوە هاتنە ســـەر ئایینی هێتێرۆداکس (لادەر) و لانیکەم تا ســـەدەی چواردەهەم پەرەیان بە بیروباوەڕێکی تەواو درووســـتکراو نەدا، یان تەنانەت گرووپگەلی ئایینی یان ئەتنیکی جیاوازیان نەناســـاند.[37] کەوابوو هەرچەند پرسیارگەلێکی زۆر، کراوە و بێ وڵام دەمێننەوە، تەواوتر و ئاســـانتر دەکرێ لە سەر بنچینەی رەگەزی و پێوەندیەکانی بە بەراورد تازەکاری شیکاری ئەنجام درێ تا چوون بەدوای سەرەتاکاندا.

## 4. ئەنجامەکان

پوختەی مەبەستی سەرەکی ئەم وتارە بریتیە لە: دەکرێ بەڵگە لەسەر هەبوونی وشەی هاوشێوەی گۆرانـــی لـــە کوردی ناوەنـــدی بێنینەوە بێ گەڕانەوە بـــۆ هەر رووداوێکی خەیاڵـــی وەک گۆڕانێکی زمانی بەکۆمەڵ لە نێوان ســـەرجەم وێژەرانی گۆرانی دا. بەڵگەی مێژوویی بەردەســـت و جۆری ئەو وەرگرتنانەی دێنەئاراوە (بەتایبەتی وشـــەیی و وشەسازی)، بەڵگەی چەسپاون لە هەمبەر وەرگرتنی بەشکۆ بەدرێژایی سەردەمێکی دوور و درێژ.

دەبـــێ وریا بین کە نابـــێ پێکەوەنانی زمانەوانی تێکەڵ بە رووداوی مێژوویی ئەتنیکی بکەین. هیچ بەڵگەیەکی مێژووییمان لەبەردەســـتدا نیە لە هەمبەر دەست بەسەردا گرتنی چینێکی گۆرانی یەکگرتوو لە رێگای هێرشـــێکی ناسراو و دیاری کوردە رەسەنەکانەوە، بەڵگەی مێژووییش شتێکی وا ناســـەلمێنێت. هەرچەند، کۆچی (هەندێکیان ســـەلمێنراوە) کەسان، هۆزان و رێبەرانی رۆحانی و جیهانی لە سەراسەری سەدەکانی پێشوودا سەلمێنراوە و بێگومان بابەتی جۆراوجۆری گۆڕانی زمان روویداوە. دیمەنەکە روون نیە، بەڵام ئەوە دەسەلمێنێت کە دیاردەی پێوەندی زمان لەمەڕ دیالێکتە کوردیەکان شیاوی سەرنجی زیاتر لەوەیە کە تا ئێستا پێی دراوە.

ســـێهەم، رەنگە لێککردنەوەی مانای ئەتنیکی وشـــەی «دیالێکتی کوردی» لە مانای خەستی زمانەوانـــی گرنگ بێ. دیالێکتێکی کوردی لە مانای پێشـــوودا بابەتێکـــە لەمەڕ بەرەی ئەتنیکی کە رەنگە بەتێپەڕبوونی زەمـــەن بگۆڕێت؛ دیالێکتێکی کوردی لە مانای دووهەمدا، بابەتێکە لەمەڕ پۆلپۆلکردنـــی زمانەوانـــی و پێکەوەنان. کەوابوو، زازا و گۆران (ئێســـتا) لە مانای پێشـــوودا نەک

دواتـــر دیالێکتـــی کوردین. پەیوەندی ئەتنیکـــی دیاری دانەدانە ئەندامانـــی هەریەک لەم گرووپە دیالێکتانە، یان تەنانەت ناســـنامەی ئەتنیکی بەشـــێک یان ســـەرجەمی ئەو گرووپانەی لە ڕێگای کارکردنە ســـەریەکی دایەلێکتیک لەگەڵ ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان خۆیان پەرەدەستێنن و بـــەم پێیە خۆی لەخۆیدا بگۆڕە. ئێمە چەند بابەتێکمان دی(هـــۆزی ئیلی کاراکە، ئەرمەنیەکان لە دێرســـیمی سەدەی نۆزدەهەمدا) شوێنێکە تێپەڕاندنی سنوورەکانی ئەتنیکی بە بەڵگەوە ڕوویداوە و لـــە هەندێکیتر (گرووپە گۆرانبێژەکان کە بەرەبەرە هێترۆداکســـیان لێدەرهات) زۆر لەوە دەچێ ڕوویدابێت.

پرســـیارێکی تر ئەمەیـــە کە ئایا و چۆن ئەم ڕووداوانە لەو زمانانـــەدا ڕەنگدەدەنەوە کە لەلایەن گرووپگەلی ئەتنیکی لە ژێر لێکۆڵینەوەدا قســـەی پێدەکرێن، بەڵام ئاشکرایە کە ئەم هەویرە ئاوی زۆری دەوێ و لێرە مەجالی نیە. بەسەر ئەمەشدا، هیوادارم من سەلماندبێتم کە ئەم بوارە پێویستی بە تێکۆشانی مەزنتر هەیە.

## پەراوێزەکان:

*مایکێل لێزێنبێرگ: ILLC-بەشی فەلسەفە، زانکۆی ئامستردام.

١. سوپاســـم بـــۆ Martyn van Bruinessen,Margreet Dorlejn, D. N. Mackenzie, Ishmael murdochi و peter muysken بۆ ئەو پێشنیارانەی لەسەر ڕەشنووسێکی سەرەتای ئەم وتارە کردیان. هیچ کامیان لە بەرابەر ئەو بۆچوونانەی لێرەدا هەن بەرپرس نین.

٢. بـــۆ وردترین لێکدانەوەی زاراوە کوردیەکانـــی باکوور و ناوەندی Mackenzie ١٩٦١a; چاو لە Blau١٩٧٥یش کە. لەوانەیە پێداچوونەوەیەکی کورت لە Blau١٩٨٩a دا بدۆزیتەوە.

٣بۆ نووســـراوەکان، مـــن تارادەیەکی زۆر کەڵک لە ئەلـــف بێی بەدرخان وەردەگرم، کـــە جیاواز لە هەندێ کەموکورتی، کەم تا زۆر لە ناو نووسەرانی کورد ئیستاندارد کراوە.

٤- بۆ ووردبینی زیاتر بڕوانە Dorleijin (١٩٩٢) و هەینۆن (١٩٧٥)

٥. ئاکامەکانی زمانەوانی لەم ڕووداوانەی ژێرەوە دەبینین؛ لێرە شیاوی باسە بڵێین کە یەکەمجار شاعیرانی بارەگای بابان بە گۆرانی شـــێعریان دەهۆنیەوە، بەڵام لە ســـەرەتای ســـەدەی نۆزدەهەمدا ئاوڕیان دایەوە سەر سۆرانی وەک زمانی ڕاگەیاندن.

٦- Blau (١٩٧٥:١٠)؛ بۆ وردەکاریەکی زیاتر لە سەر سەرهەڵدانی سۆرانی وەک زمانی ئیستانداردی کوردستانی ئێراق، بڕوانە حەسەنپوور ١٩٨٩:٩٦-١١٧

٧- بۆ توێژینەوەی زیاتر لە ســـەر داڕشتنەکانی کرداری- کارلێکراو لە کرمانجی و سۆرانی بڕوانە: Bynon ١٩٧٩: Blau (١٩٨٠: ٦٩-٧٤).

٨- بـــۆ توێژینـــەوەی زیاتر لە ســـەر دیالێکتـــە جۆراوجۆرەکانی گۆرانـــی لـــە Mann/Hadank١٩٣٠ و

Makenzie١٩٦٦ دا دەتوانی بۆی بگەڕێی.

٩- Makenzie١٩٥٦: ٤١٩-٤٢٠: «گشت شەبەکەکان خۆیان بەخۆیان دەڵێن باژلان یا بەژوان».

١٠- شـــارەزای هاوڕێی شـــەباکی من ئەیوت ســـێ جۆر تائیفەی شـــەبەک هەن: باژەلان، زەنگەنە، شەبەکی رەسەن.

١١- بەهـــۆی نەبوونی دەرفەت تەنیا ژمارەیەکی بچـــووک نموونە لەو دیالێکتانەی دێنە ئاراوە باس دەکەم، زۆربەیان هێشتا لێکنەدراونەتەوە؛ بۆ وردەکاریی زیاتر پێویست بە دەرفەتێکی ترە.

١٢- بۆ زانیاری زیاتر لە سەر شەبەک، بڕوانە ئێدمۆندس١٩٥٧: ١٩٠فف، ڤینۆگرادۆڤ١٩٧٤، مووسا١٩٨٨: ١٠ ch بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر دیالێکتەکانی باژەلان، بڕوانە١٩٣٠:٣٩٥ esp. Mann/Hadank-٤٢٤ وە Makenzie١٩٥٦

١٣- Mann/Hadank١٩٣٠ و Makenzie١٩٦٦ «هەورامی» پتر لەم مانا بەسراوەدا بەکار دێنن.

١٤- ئەوەی شارەزاکانی من ئەیان وت رەنگە نموونەی تەقیە بێ، دووڕوویی لە بیروباوەڕی راستەقینەی خۆ کە لە نێوان شیعەکان و تاقمەکانی تر رێگەی پێ دەدرێت.

١٥-بۆ زانیاری لەسەر ئاینی کاکەیی، بڕوانە ئێدمۆندس١٩٥٧:١٩٠ف ف؛ ١٩٦٩؛ مینۆرسکی١٩٢٠

١٦- بڕوانـــە ســـۆهرەوەدی ١٩٦٥ و مازائۆیـــی، بـــۆ وردبینی زیاتر لە ســـەر ئـــەو رووداوە مێژووییانەی کە دەســـتوورەکانی سۆفی ئیسلامی دەگرێتەوە و گرووپەکانی قزڵباش و هێترۆداکسی تر کە لەوانەوە سەریهەڵدا؛ cf.Moosa١٩٨٨؛ بۆ زانیاری، با ئاساییش، وردتر لە سەر تاقمە جۆراوجۆرەکانی .ghulat

١٧- بۆ زانیاری مێژوویی وردتر لە سەر بارەگای ئەردەڵان، بڕوانە نیکیتین ١٩٢٢ .

١٨- تەنانەت ئەوڕۆش، گۆرانی وشەی هەورامی و سۆرانیە بۆ «گۆرانی»، لە حاڵێکدا کرمانجی ستران بەکار دێنێ.

١٩- بە بڕوای حەســـەنپوور، بیرۆکەکانی رۆژئاوا کە دەڵێن گۆرانی دیالێکتی کوردی نیە و وێژەرانی گۆرانی کورد نین، بوو بە سەرچاوەیەکی سەرەکی هاندان بۆ سیاسەتی حکوومەتی ئێرانی.

٢٠- موولێر ١٨٦٤ یەکەم هەوڵێک بوو بۆ لێکۆڵینەوەیەک لەسەر «دیالێکتی زازا لە زمانی کوردی»؛ بڕوانە Mann/Hadank١٩٣٢ بۆ لێکۆڵینەوەیەک لە ســـەر دیالێکتەکانی سیڤەرەک وk٦r (نزیک بینگۆڵی ئەورۆکە)، وەTodd١٩٨٥ بۆ لێکۆڵینەوەیەک لە سەر بنەمای تاقەوێژەرێک لە سیڤەرەک.

٢١- ئاســـاتریان و گەڤۆرگیـــان ١٩٨٨؛ ئـــەم جـــۆرە پێوەنـــدی زمانـــە ئێســـتاش بـــە تەســـەلی لە ژێر لێکۆڵینەوەدایە.

٢٢- من بەردەوام چاوم کەوتووە بە جۆرێکی ئێســـتای ئەم دووزمانە لە نێوان کوردە ئاوارەکانی ئەورووپا: ئـــەوان پەرەیـــان داوە بە زازاوێژی، بەڵام دوا فێربوونیان بە تورکـــی، بە کردەوە خووی دوان بە زمانی زگماکیان لەبیرچووبۆوە. رایەک لە ئەورووپا، ئەوان کرمانجی فێرببوون، کە وەک لینگوا فرانکا ی کوردی سەیریان دەکرد، بـــۆ وتووێژ لەگەڵ کوردە هاوولاتیەکانی خۆیـــان. رەنگدانەوەیەکی تری ئەم جیاوازیە لەکۆمەڵدا رەنگە ئەم وتە زۆر بیسراوە بێ کە زازاوێژان کرمانجی ئاسانتر فێردەبن تا پێچەوانەی ئەمە.

٢٣- Martyn van Bruinessen , (وتووێـــژی تاکەکەســـی) منی ئـــاگادار کردەوە کە هۆزەکانی زازاوێژ وەک هۆزەکانـــی کرمانجی وێژی وەک ئالیکان یا میلی کۆجی دوور-مەودایان نیە. ترانشـــوومانچ لەناو ئەواندا ئێستاندارده.

٢٤- بوومکە١٩٨٩ و ڤان بروونێســـێن ١٩٨٩ب:٦١٤ دەڵێن کە عەلەویە کوردەکان لە باری ئەتنیکیەوە خۆیان لەگەڵ عەلەویەکانی تورکووفۆن نەک کوردە سونیەکانی زازا و کرمانجی بە یەک دەزانن.

٢٥-وێنەکانی گۆرانی لە یاداشـــتەکانی تاکەکەســـیەوە گیراون (دیالێکتی بیارە)، ئەوانیتر ل لە ســـەرچاوە بڵاوکراوەکانـــی ئاشـــنا وەک مەکێنزی١٩٦١ئا و تاد١٩٨٥ گیـــراون. بۆ وردبینی زیاتر، بروانە تێدێســـکۆ ١٩٢١، مەکێنزی ١٩٦١ب، بلۆ١٩٨٩ا،بۆرانسکیژ ١٩٧٧.

٢٦- لـــە باری زمانەوانیەوەچاوم کەوتووە بە زەوجـــەی تێکەڵ لە توونجەلی، واتە پیاوێکی زازاوێژ لە هۆزی کورەیشـــان لەگـــەڵ ژنێکی کرمانجـــی وێژی هۆزی میلی لە پولومور ژیانی هاوبەشـــیان پێـــک هێنا؛ هەڵبەت هەردووکیـــان عەلەوی بوون. ئەندۆگامی لە نێوان ئەندامانی یەک خێڵـــدا (و یەک دیالێکت) ئەورۆ کەمتر باوی ماوە هەرچەند لە نێوان تاقمە ئایینیەکاندا هەر ماوە.

٢٧- لەڕاستیدا، ئاشنایەتی رۆژ بەرۆژ لەگەڵ کاری نووسەرانی رۆژئاوا وێدەچێ لەسەرهەڵدانی ناسیونالیزم بەتایبەت زازایی لە نێوان خوێندەوارەکانی هەندەران لە چەند سالّی رابردوودا کاریگەر بووبێ.

٢٨- ســـیکەس (١٩٠٨: ٤٧٢) وەک هۆزی زازاوێژ ریزیان دەکات، بەڵام لەوە دەچێ ئەمە هەڵە بێ: Martyn p.c (van Bruinessen) بیســـتبووی کە دیالێکتەکە لە لایەن دانیشـــتوانی ناوچەوە وەک «کوردی سووک»، نەک وەک زازا، سەیر دەکرا.

٢٩- دۆخی لەدەستدانی راناوەکانی enclitic تەنانەت خراپتریشە: ئەمانە هەم لە کرمانجی و هەم لە زازادا نەماون و فەوتاون، کەوابوو شیکاریەکی پتر ، نەک لە بواری سابستراتم، بۆ ئەم گۆڕانە پێویستە. (ئەگەر بەم چەشنە بێت)

٣٠- مەکێنزی (لاپەڕی٨٦) لە ســـەر ئەم بڕوایە کە کوردەکان یەکەمجار زازاکانیان وەدەر نا و تەنیا ماوەیەک لەمەو پێش بوو کە دەستیان گرت بەسەر گۆران دا، بەڵام ئەم زنجیرە مێژوویەی رووداوەکان جێی بیرکردنەوەیە و نەک رەنگدانەوەیەک لە هەر دەسکەوتێکی زمانەوانی.

٣١- رەنگە مەکێنزی بایەخی تەواوی بە مانای «سابســـتراتم» نەدابێ، یان لە بەکارهێنانی مەبەســـتێکی تری بووبێت، بەواتایەکی تر، «وەرگرتن» (لاپەڕی٨٥)، «سابســـتراتم» (لاپەڕی٨٦)، و «ئاسانکاری بەهۆی تێکهەڵچوونی نێوان سیستمەکان» (لاپەڕی٨٢)، لە پەنای یەکدا بە بێ جیاوازی بەکاردێنێ. هەرچەند، روون نیە ئەم بەڵگەهێنانەوە تا چەندە دەگرێتەوە، ئایا بە تاقی تەنیا ئەو بیرۆکەیە مێژووییە دووردەســـتانەی کە ئەو لێی وەردەگرێ بە رەوای دەزانێ؟

٣٢- لە وتارێکی تازەیدا مەکێنزی ١٩٨٩، بە بێ هیچ گۆڕانێکی بنەڕەتی بیرۆکەکەی دووپات دەکاتەوە.

٣٣- هەرچەند، ســـەرچاوەکە روونی ناکاتەوە کە ئەم «هاســـانە» کێن، یا نالّێ بۆ ئەمانە «کوردی رەسەن» نین.

٣٤- شـــارەزایەک لـــە هەولێر منی ئاگادار کردەوە لە مانایەکیتر کە لـــەم پەندە کۆنەدا دەردەکەوێ «ئەز نە کوردم، نە گۆرانم».

٣٥- ســـۆانە١٩٢١ هەندێ وەرگێڕاوە لە هۆنراوەیەکی ســـەدەی هەژدەهەم لە بابەت شـــێعری گۆرانی دەخاتە بەردەست.

٣٦-N.B ئەم بەشە لە چاپی ئینگلیسی١٩٩٢ دا نەهاتووە.

٣٧- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانەM likoff ١٩٧٥ , ١٩٨٢; Sohrweide١٩٦٥ . هەردوو جەخت دەکەنەوە لە سەر سرووشتی نیوە- شیعەی هێترۆداکسی ئایینی عەلەوی.

# ترس لە عەلمانییەت:
# جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت

نەصر حامد ئەبو زێد
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

فەیلەسوفەکانی فیکری ئیسلامی پێمان دەڵێن: ئەوروپا بەهۆی کڵێساوە، پێویستی بە ڕیفۆرمی ئاینی بوو، کڵێسا ئەو پەتایەیە کە لە شارستانیەتی ئێمەدا نییە. هەڵەکە دروست ئالێرەدایە، ئەگەر مانای کڵێسا بوونی دەسەڵات یان دەسەڵاتەکان بێت کە مانای ئاین قۆرغبکاتو تەکفیری هەموو ئەوانە بکات ناکۆکن لەگەڵ ئەو مانایەدا، ئەوا ئێمە نەک کڵێسایەک، بگرە چەندین کڵێسامان هەیە. ئێمە ژمارەیەکی زۆری ئەو دەسەڵاتانەمان هەیە کە لەپاڵ قۆرغکردنی مانای ئاینی، مانای کۆمەڵایەتیو مانای ڕۆشنبیریو مانای سیاسیشیان قۆرغکردووە، ئەمە جگە لە مانای ئەخلاقیو ڕۆحی. هەر هەموو ئەو مانایانە، لەناو ئەو مانا ئاینیەدا قۆرغکراون کە ئەو دەسەڵاتانە بەرهەمیاندەهێنن.

کێشەی گوتاری ئاینی ئەوەیە لەسەر ژێی (تایبەتمەندی) کاردەکات، وەک ئەوەی ئێمە لەنێو مرۆڤەکاندا شتێکی تازەبین، ئەوەی بۆ ئەوان دەستدەداتو باشە بۆ ئێمە دەستنادادتو ناگونجێت. ئەمە بەبێ ئەوەی ئەوانەی بە چەمکی (تایبەتمەندی)، کە لە گوتاری ئایندا خراوەتەڕوو، فریودراون، بەوە بزانن ئەوە تایبەتمەندییەکی زۆر هەژارو داخراوە. چونکە شوناسی مرۆڤ تەنها لە یەک ڕەهەند لە ڕەهەندە زۆرەکانیدا کورتدەکاتەوە، ئەویش ڕەهەندی ئاینە. کێشەکە تەنها ئەوە نییە چەندین گروپی ئیسلامی هەیە ئیسلامیان بۆ خۆیان قۆرغکردووەو تەنها خۆیان بە ئیسلامی ڕاستەقینە دەزانن، ئەمە تەنها یەکێکە لە دەرکەوتەکانی کێشەکەو هەموو کێشەکە نییە. ئەگەر تەنها کێشەکە بریتی بوایە لە پەیوەندیکردن بە گروپێکەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکات (ئیسلامیە)، ئەوا مەسەلەکە

ئاسان بوو. بەتایبەتی ئەگەر کۆمەڵگا، لە دەرەوەی ئەو گروپە، کۆمەڵگایەکی هۆشیاربێتو بزانێت ئەوانە تەنها گروپێکن.

سەرەتای کێشەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٨ لەمیسر، لەو ساڵەدا (ئیخوان موسلمین) دروستبوون، (کۆمەڵەی ئەنصاری سونەی محەمەدی) پەیدابوون، لەگەڵ چەندین گروپو تاقمی دیکەی جیاواز جیاواز کە هەریەکەی ناوێکی هەبوو. ئەوکات دەوڵەت بیروڕاو بۆچونی هیچ یەکێک لەو گروپانەی تەبەنی نەکرد. ئەوە دەرهاویشتەی (کۆمەڵگای مەدەنی) بوو لە میسری نیمچە لیبرالیدا. دەوڵەت مافی خەڵکی دەپاراست لەوەی کۆڕو کۆبونەوەو ڕێخستنی کۆبونەوەکانیان بەشێوەیەکی یاسایی ئەنجامبدەن، چ لە شێوەی یانە یان سەندیکا یاخود حیزب یان گردبونەوەیەکی خێرخوازی یان ئاینی: ئیسلامی یان مەسیحی یاخود جوولەکە.

کارەساتەکە لە ئێستادا ئەوەیە دەوڵەت، بە سیستمە سیاسییە دیکتاتۆرو سەرکوتکەرەکەی، هەمان نەهج پەیڕەو دەکاتو ڕایدەگەیەنێت دەوڵەتێکی ئیسلامییەو لە داڕشتنی یاساکانیدا، سورە لەسەر ئەوەی ڕەزامەندی دەزگا ئاینییەکان وەربگرێت. بگرە لە سیستمی ئابوریدا، چەمکی (ئابوری ئیسلامی) پیادەدەکات کە لەناو هەموو بانکەکاندا گۆشەیەکی تایبەتی داگیرکردووە. جگە لەوە جلوبەرگی ئیسلامی، دروشمی ئیسلامی، بەرنامەی ئیسلامی لە ڕادیۆو تەلەفیزیۆنەکاندا هاتونەتەئاراوە، هەندێ خەڵک نازناوی (بیرمەندی ئیسلامی) یان هەڵگرتووە. مەترسییەکە ئالەم بەئیسلامیکردنەدایە، لە پشت ئەم بەئیسلامیکردنەشەوە هیچ ئامانجێک نییە، تەنها ئەوەنەبێت دەوڵەت دەیەوێت بەرەی قۆرغکردنی ئیسلام، لەژێر پێی ئۆپۆزسیۆندا بۆ خۆی ڕاکێشێت.

بەکورتییەکەی دەکرێ بوترێت، سیستمی سیاسی خۆی لەناو سەنگەری ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامیدا بەندکردووەو پێیوایە بەوە دژایەتیان دەکات. ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی ئەگەرچی نەگەشتونەتە دەسەلات، بەڵام لە بەئیسلامیکردنی کۆمەڵگاو خودی دەوڵەتدا سەرکەوتوبوون. ئەمەش ئەو حاڵەتی هاتوچونە پیشاندەدات کە ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا پەیڕەوی دەکەنو (دروشمی ئیسلام چارەسەرە)یان بەرزکردۆتەوەو تەنها ئەو دروشمەیان بەسە، مادام سیستمی سیاسی ئەو دروشمە دەگۆڕێت بۆ سیاسەتو کارییێدەکات. لەم بارودۆخەدا، کێشەکە، تەنها کێشەی ئەو موسڵمانانە نییە کە نایەوێت ئینتیما بۆ ئەم بەزۆر بەئیسلامیکردنە بکات. بگرە کێشە زۆر ئاڵۆزەکە، کێشەی خەڵکانی ناموسڵمانە کە لەڕێگەی هێزی یاسایی بەئیسلامیکردنی کۆمەڵگاوە، لە ترسو تۆقیندا دەژینو هیچ بایەخێکیان پێنادرێتو هیچ بەهایەک بۆ ئاینەکەیان دانانرێت، تەنها بە سەری زمانو بە قسەی لوس نەبێت. بارودۆخی ئافرەتیش تابڵێ خراپو خراپترە، بارودۆخی فیکرو بیرمەندو داهێنانو داهێنەران، پێویستی بە ڕونکردنەوەی زیاتر نییە.

ئەوە عەلمانییەتە، نێوانی دەوڵەتو سیستمە سیاسییەکەی، لەگەڵ ئایندا لێکجیادەکاتەوە. تەنها عەلمانییەتە دەتوانێت ئاسۆکانی ئازادیو عەقڵانییەتو فرەیی مانا، بکاتەوە. ئاین کاری ئایندارانە، ئەرکی دەوڵەتیش مسۆگەرکردنی ئازادییە بۆ هەموانو پاراستنی هەندێ کەسە، لەوەی بەناوی ئاین یاخود بەناوی ئەم مانا یان ئەو مانای ئاینی، دەستدرێژی نەکرێتەسەر. بەڵام عەلمانییەت

بەبێ ڕیفۆرمی ئاینی دانامەزرێت، ڕیفۆرمێک تاکو ئێستا لای ئێمە ڕوینەداوە، بەڵکو لە ئەوروپای سەدەی شازدەهەمدا ڕویداوە. لای ئێمە شۆڕشێکی فەلسەفی وەک ئەوەی فەیلەسوفەکانی ڕۆژئاوا پێیهەستان، ڕوینەداوە. ئەو شۆڕشەی لەسەر بنەماکانی، شۆڕشی کۆمەڵایەتیو سیاسی بەدیهاتنو چەمکی (هاوڵاتیبوون)ی جێگیرکردو شوێنی چەمکی (ڕەعیەت)ی گرتەوە. ئەگەرچی لە دەستوری کۆمەڵگاکانی ئێمەدا، جەخت لەسەر چەمکی (هاوڵاتیبوون) کراوەتەوە، بەڵام کار بە چەمکی (ڕەعیەت) دەکرێتو ئەو باڵادەستە. لێرەوە لە ڕۆژئاوا بەهۆی ڕیفۆرمی ئاینیو شۆڕشی فیکری فەلسەفیو عەلمانی، مرۆڤ لە ئاگری ستەمی سیاسیو ئاگری تێڕوانینی کلێسا بۆ جیهان، ڕزگاری بوو. ئیدی دوای ئەوە شۆڕشی زانستی بەدیهات.

وەلێ لە کۆمەڵگاکانی ئێمەدا، هەموو شتێ بە جیاواز لەدایکبوو، ئەویش بەهۆی ئەوەی هاتنی (مۆدێرنە)، لە هۆشیاری تازەکردنەوەدا، ناڵێم لە هۆشیاری مۆدێرنەدا، پارچە پارچە کرا. هاتنی ئامێرەکان پەسەندکرا، بەڵام بنەما زانستییەکانی ئەو ئامێرانە، بە هەموو پێکهاتە عەقڵانیو عەلمانییەکانییەوە پەسەندنەکراو وەرنەگیرا. دیموکراسی بەبێ بنەما سەرەکییەکەی کە ئازادی تاکە، قبووڵکرا. ئابوری ئازاد، بەبێ بنەما سەرەکییەکەی کە ئازادی فیکرە، قبووڵکرا. جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکتر ڕوینەداو نەشدەکرا ڕوبدات، چونکە چەمکی دەسەڵات وابەستەی کۆمەڵێ چەمکی سەدەکانی ناوەڕاست بوو، لەنمونەی (شوان)، (پارێزەر)، (ڕابەری بەخشندە)، (سەرۆکی ئیمانداران)، (ئەمیری ئیمانداران). هەنووکە گرنگییەکی زۆر هەیە بۆ جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت. ئەگەر لە جیهانی عەرەبیماندا، تەماشایەکی دەوروبەری خۆت بکەیت، کارەساتی ئەو جیانەکردنەوەیەی نێوان دەوڵەتو ئاین دەبینیت. ئاین تەنها گروپە ڕادیکاڵەکان یاخود گروپە ئیسلامییەکان بەکاریناهێنن، بەڵکو دەوڵەتیش بەکاریدەهێنێت. مێژوی ئەم مەسەلەیە، لە تەواوی جیهانی عەرەبیو تەواوی جیهانی ئیسلامدا، دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم.

جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت، جیاکردنەوەی ئاین نییە لە کۆمەڵگا. هیچ کەسێک ناتوانێت ئاین لە کۆمەڵگا جیابکاتەوە، ئاین لە ڕووی مێژوییەوە پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتییەو تەنها پێکهاتەیەکی کەسی یان تاکی نییە. ڕەنگە ئاین بەوشێوەیە دەستپێبکات، واتە وەک ئەزمونێکی تاکە کەسی دەستپێبکاتو لە هەندێ ئەزمونیشدا هەر بە ئەزمونێکی تاکە کەسی بمێنێتەوە. وەلێ هەندێ ئەزمونی ئاینی تاکە کەسی، دەگۆڕدرێت بۆ ئەزمونێکی دەستەجەمی هاوبەشو گروپێک دروستدەکات، پاشان دەبێتە کۆمەڵگایەکو دواتر گەشەدەکاتو دەبێتە (ئومەیەک)، لەم حاڵەتەی دواییاندا، ئاین دەبێتە هێزو شتێک کە ناکرێت لە کۆمەڵگای داماڵیت.

دەوڵەت کۆمەڵگا نییە، بەڵکو ئەو یەکە ئیداریو سیاسیو یاساییەیە کە ژیان لەناو کۆمەڵگادا ڕێکدەخات. خۆ ئەگەر ئاین هێزێکی کۆمەڵایەتیش بێت، ئەوا ئاینیش کۆمەڵگا نییە، چونکە کۆمەڵگا گروپو دەستەو تاقمو ئاینی جیاواز جیاوازە. ئەو گروپو دەستەوتاقمانە، مافی ئەوەیان هەیە دەوڵەت بیانپارێزێو لێنەگەڕێ لەلایەن گروپو دەستەو تاقمی دیکەوە مافیان پێشێلبکرێت. لێرەوە لە کۆمەڵگایەکدا کە بە سروشتی خۆی فرە ئاینە، تێدا ڕۆڵی دەوڵەت بۆ بەڕێوەبردنی ژیان

لەو کۆمەڵگایەدا، وەک یەکەیەکی ڕێکخستن وایە. دەوڵەت لەو بەڕێوەبردنەدا پێویستە بێلایەن بێت، پێویستە دەوڵەت ئاینێکی نەبێت تەبەنی بکاتو بەرگریو پارێزگاری لێبکات. ڕۆڵی دەوڵەت پارێزگاریکردنی خەڵکە نەک عەقیدەکان.

لە تەواوی مێژودا-بەدەر لە هەموو بانگەشەو وەهمەکان-جیاکردنەوەیەکی لەو شێوەیە لەنێوان ئاینو کۆمەڵگاکاندا ڕوینەداوە. دەوڵەت ئاینی نییەو نابێت ئاینی هەبێت. گوزارشتی (ئاینی دەوڵەت ئیسلامە) گوزارشتێکی ڕاست نییە، چونکە دەوڵەت ناڕوات بۆ مزگەوتو نوێژ ناکات، دەوڵەت ناڕوات بۆ حەج، ڕۆژوناگرێت، زەکات نادات. دەوڵەت لە سیستمی سیاسیدا خۆیدەنوێنێتو بەرپرسیارە لەبەرامبەر کۆمەڵگا بە هەموو ڕەنگەکانییەوە، لەوانەش ئاینەکان. هەندێ لە دەوڵەتە عەرەبیو ئیسلامییەکان، لەڕووی ئاینییەوە مۆزایکێکی ئاینین. ئەمەش مانای وایە ئەو دەوڵەتەی ئاینی هەبێت، مافی ئەو هاوڵاتیانە ڕەتدەکاتەوە کە ئینتیمایان بۆ ئاینەکەی دەوڵەت نییە. بگرە لەوەش خراپتر ئەوەیە، دەوڵەت ڕۆڵەکانی هەمان ئاین دەچەوسێنێتەوە کە بە شێوەیەک لە ئاین گەشتوون، جیاوازە لە تێگەشتنی دەزگا فەرمییەکانی دەوڵەت بۆ ئاین. بەم شێوەیە چەمکی وەک (هاوڵاتیبوون)، (یەکسانی)، (یاسا)، دەبنە کۆمەڵە چەمکێکی بێ مانا.

پێویستی دووەم دەستورە، کارێکی ناڕاستە لە دەستوردا بڵێی (هاوڵاتیبوون) بنەمای سەرەکی یاسادانانە، کەچی لە هەمان دەستوردا بڵێیت شەریعەت یان پرنسیپەکانی شەریعەت، سەرچاوەی سەرەکی یاسادانانە. ئەمە ناکۆکییەکی تەواو دژ بەیەکە لەنێوان دوو مادەی دەستورداو یەکێکیان ئەوی دیکەیان ڕەتدەکاتەوە. ناکۆکییەکە زیاتر دەبینرێت کاتێ لە هەمان دەستوردا، بە ماددەیەک دروستبونی حیزب لەسەر بنەمای ئاینی قەدەغەدەکرێت. حیزبە ئاینییەکان هەمان قسەی (دەستوریی) دەکەنو دەڵێن: (ئیسلام ئاینی دەوڵەتەو شەریعەت سەرچاوەی یاسا دانانە). حیزبی نیشتیمانی دەسەڵاتدار لە میسر، چۆن دروستبونی حیزبێکی ئاینی قەدەغە دەکات کە هەمان ئەو بەها دەستوریانە پیادەدەکات کە ئەو پیادەی کردووەو بەرگرییەکی توندیان لێدەکات. ئەمە مانای وایە یا ئەوەتا (دەستور یاری منداڵانە)، یا مانای وایە حیزبی نیشتیمانی حیزبێکی ناشەرعییە، وەک گروپە ناشەرعییەکانی دیکە.

مانای چی دەوڵەت ئاینی هەبێت؟ مانای چی حیزبی نیشتیمانو گروپە ڕکابەرەکەی کە ناشەرعییە، ململانێ لەسەر ئەوە بکەن کامیان حەقی خۆیەتی لەسەر بنەمای مەرجەعیەتی (شەرعییەت) حوکم بکەن؟ ئەمە بەوپەڕی سادەییەوە مانای ئەوەیە خەڵکانی ناموسڵمان لە کۆمەڵگادا پەراوێز بخرێن. تەماشای دەوروبەری خۆت بکەو بڕوانە بارودۆخی قبتییەکانو بەهائییەکان لە میسر، بزانە چی بەسەر زۆرینەی قبتییەکاندا هات بەو پێودانگەی کڵێسا نیشتیمانیانە.

جگە لەوە بەناوی شەریعەتەوە، ڕۆڵی ئافرەت لە دەزگاکانی سیاسەتو خوێندنو ڕاگەیاندندا پەراوێزخراوە. کەس هەڵنەشاخێت بەڕومداو بڵێ ئەوە ڕاست نییە. چونکە من دەزانم لە جیهاندا، بەهۆی فشاری ڕێکخراوە جیهانییەکانی مافی مرۆڤو مافی ئافرەت، لەسەر ڕژێمو حیزبە سیاسییەکان، هەندێ دیکۆر بۆ جوانکردنو ئارایشتکردن کراوە. لەوەش خراپترو تاڵتر ئەوەیە، ئەو هاوڵاتییە

موسڵمانەی لێكدانەوەی بۆ ئاین، لەگەڵ لێكدانەوەی دەوڵەتو لێكدانەوەی دەزگا ئاینییەكانی دەوڵەتدا ناگونجێت، گیرۆدەبووە. چونكە بەردەوام بە كۆمەڵێ تۆمەتی ئامادەكراوی وەک هەڵگەڕاوەو لادەر لە شتە جێگیرەكان، تۆمەتبار دەكرێتو لەلایەن پۆلیسەوە ڕاودەنرێتو دەستگیردەكرێت. بگرە مەسەلەكە گەشتووە بە ئاستێک هەندێ كەس خۆیان ناوناوە (قورئانییەكان) یان (ئەهلی قورئان)و ماڵومناڵو كەسوكاری خۆیان دەچەوسێننەوە. لێرەوە هەر هەموو ئەمە، ئەوە ڕەتدەكاتەوە كە لە (ئیسلامدا كڵێسا نییە)، ئەوە دەربڕینێكی زمانەوانییەو هیچ مانایەكی نییە. كڵێساش لە سەدەكانی ناوەڕاستدا لەوە زیاتری نەكردووە.

لەم دەیەی ئێستادا، دەیەی یەكەمی سەدەی بیستو یەک كە خەریكە كۆتاییپێدێت، دەوڵەت تابێت ڕادیكاڵانەتر ئاینی خۆی دەستنیشان دەكاتو زیاتر تەنگ بە نەیارەكانی هەڵدەچنێت، ئەگەرچی ئەوە لە دەستورەكاندا یان لە یاساكاندا نەهاتووە. مەسەلەكە وایلێهاتووە دەوڵەتێكی زۆرینەی سونە، شیعەكان دەچەوسێنێتەوەو پێچەوانەكەشی ڕاستە. جگە لەوە بەهۆی ئەو گوتارە نابەرپرسیارانەی ڕاگەیاندنەكان، تابێت تەنگپێهەڵچنین زیاترو زیاتر دەبێت. وایلێهاتووە مرۆڤەكان لەناو یەک ئایندا، بۆ چەندین گروپو دەستەو تاقم دابەشبوونو یەک ئەوی دیكە بەكافر دادەنێت.

عێراق بە حوكمی مێژووە دووردرێژەكەی لە پێكەوە ژیانو هاوسەرگیریو بەشداری تەواو لە نیشتیماندا، كەچی حاڵەتی ئێستای عێراق حاڵەتێكی خەفەتبارە. لوبنان كە (هاید پاركی عەرەب) بوو، كەچی ئێستا كێشەی تایفەگەری بە ئاشكرا لە ڕووكارە سیاسییەكەیدا دیارە. هەموو ئەمانە یەک چارەسەریان هەیە، ئەویش ئەوەیە دەوڵەت واز لەوە بێنێت ئاینی هەبێت. دەوڵەت ئاینی نییە.

لە ساڵی ١٩٢٣ لە میسر، ئەندامانی لیژنەی ئامادەكردنی دەستور، دوودڵبوون لە مەسەلەی ئەو مادەیەی كە دەڵێت (ئاینی دەوڵەت ئیسلامە)، ئایا ئەم مادەیە پێویستە یان دەكرێ دەستبەرداری ببین. ئەوەی لەم چیرۆكەدا سەیرە، ئەوەیە ئەندامە قیبتییەكانی لیژنەكە، بە ئاشكرا بیروڕای خۆیان دەربڕیوە بەوەی (زەرەری نییە) مادەیەكی وا لە دەستوردا هەبێت. وەلێ دواتر «تەها حسێن» لەسەر ئەو مادەیە دەڵێ: (بینیمان زەرەرێكی زۆری هەیە). ئەمە مانای وایە تاقیكردنەوە دەریخست مادەیەكی لەو جۆرە زەرەری هەیە. من پێموایە ئەندامە قبتییەكانی لیژنەكە، لەناو كەشوهەوای دروشمەكانی شۆڕشی ١٩١٩دا نوقمبووبوون، دروشمی (ئاین بۆ خوداو نیشتیمان بۆ هەموان)، ئەوان دەیانویست خۆشحاڵی خۆیان بۆ برا موسڵمانەكانیان پیشانبدەن كە متمانەیان پێیان هەیەو شانازییە بۆیان سەر بە پانتایی ڕۆشنبیری عەرەبی ئیسلامین. وەلێ كاتێ زەرەرەكە دەركەوت، پێویستە لەسەر موسڵمانەكان چاكەی قبتیەكان بدەنەوەو متمانەی برا قبتیەكانیان بەدەستبێننەوە، بەوەی ئەم مادەیە لە دەستوردا لاببرێت، ئاخۆ ئەمە دەكەن؟

## سەرچاوە:

ماڵپەڕی الاوان، ٢٧ نیسانی ٢٠١٠-٤-٢٩

# چەمك و مۆدیلەكانی ئەنارشیزم[1]

د. مەلیك سەلاّح یەحیایی
لە فارسییەوە: كارزان محەمەد

## پێشەكی:

ئەنارشیزم لە زاراوەی یۆنانی (ئەنارخیا)[2] ەوە وەرگیراوە كە بەمانای نەبوونی حكومەت دێت. لەزمانو تیۆری سیاسیدا مەبەست لە ئەنارشیزم، فەلسەفەیەكە كە هێزی سیاسی بە هەرفۆرمێك بێت، هەر بە ناپەسەندی دەژمێرێتو لەڕاستیدا توندڕەوترین لقی تاكگەراییە[3].

ناواخنی سەرەكیو چەقی ئەنارشیزم، دوژمنایەتیە لەگەڵ دەوڵەتدا، بەڵام لە هەمانكاتدا هەرجۆرە هێزێكی ئۆرگانیزەكراوی كۆمەڵایەتیو ئاینیش مەحكوم دەكات. ئەنارشیزم یاساكانی دەوڵەت بە سەرچاوەی دەستدرێژیو چاوگەی شەڕی كۆمەڵایەتی ناودەباتو لەبەر ئەم هۆیەیە خوازیاری لەناوچوونی سەرجەم دەوڵەتانە بەمانای ئەمڕۆیان، لەبری ئەوە لایەنگری هاریكاریكردنی خۆبەخشانەیە. دەبێ سەرنج لەوە بدرێت كە ئەنارشیزم بەپێچەوانەی ئەوەی كە باوە، شێواویو بێسەروبەرەیی نییەو ئاواتی كۆمەڵگایەكی بێ سیستەم نییە، بەڵكو بیر لە سیستەمێك دەكاتەوە كە بەرهەمی هاریكاریی ئازادانەی تاكەكان بێت كە باشترین شێوازیشی دروستبوونی گروپە سەربەخۆكانە، چونكە ئەنارشیستەكان لەو بڕوایەدان كە مرۆڤ لە ناواخندا كۆمەڵایەتییە.

فەلسەفەی ئەنارشیزم لەنێوان ساڵانی (١٩٣٠ تا ١٩٦٠) بەتایبەتی لەلایەن خوێندكارانی زانكۆوە لە شۆڕشەكانی دواداوی دەیەی (٦٠) لە وڵاتانی سەرمایەداریدا سەرلەنوێ بوژێندرایەوەو تا رادەیەك ببووە دیاردەیەكی رۆژانەو ئەم فەلسەفەیە وەك ئایدۆلۆژییەكی سیاسی- كۆمەڵایەتی بەرجەستە كرا.

ئەنارشیستەکانیش وەک کۆمۆنیستەکان دانیان بە بایەخی چینی پرۆلیتار لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا ناوە. لە ئەنارشیستە سەرەتاییەکاندا دەتوانرێ ناوی (پرۆودۆن)[٤] بهێنین. بەتێڕوانینی ئەو ئەنارشیستەکان دەبێ بۆ لەناوبردنی فیزیکیانەی کۆمەڵگای ئەمڕۆو گەیشتن بەکۆمەڵگایەکی دڵخواز، پەنا بۆ زۆرەملێو ئاژاوەگێڕیی ببەن. هەروەها ئەنارشیستەکان وەک چەپە نوێیەکان، پراگماتیست بوونو بە توندوتیژە بێ ئامانجەکان ناوزەدکراون. بەمانایەکی تر پێویستە بڵێین ئەگەرچی فەلسەفەی ئەنارشیزم لەبنەڕەتدا ئاشتیخوازانەیە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەنارشیستە پراگماتیستەکان پتر پەنا دەبەنە بەر توندوتیژی، چونکە لەو بڕوایەدان کە پرەنسیپی گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی سەرتاپا ئاسایشو ئارامی ئەنارشیستیانە، لەمڕۆدا لەڕێگەی زەبرو شۆڕشەوە دێتەدی.

ئەنارشیستەکان بەسەرپێچیکردن لە یاساکان، دژ بە دەوڵەتان تێدەکۆشنو هەوڵ دەدەن یاساکان بێنرخ بکەن. لەو ڕووەوە کە ئەنارشیستەکان بەتوندی دژ بەدەوڵەتن، لەئەنجامدا دەبنە لایەنگری شۆڕش بۆ لەناوبردنی دەوڵەتان و لەو بڕوایەدان ئەگەر بەسەر ئازادی تاکەکەس و کۆمەڵگاو دەوڵەتدا زاڵ نەبن، ئەوا دەبێتەمایەی پەیدابوونی مرۆڤگەلێکی فرەڕەهەند و پێداویستییەکانی کۆمەڵگا لەڕێگەی ئەو هاوڵاتیانەوە دابین دەکرێت کە بەشێوەیەکی خۆبەخشانە سەرقاڵی کارە دڵخوازەکەی خۆیانن، بەمشێوەیە لەبنەڕەتدا کارەکە بەجۆرە کاتبەسەربردنێکیش ناودەبرێت[٥].

ناکۆکی سەرەکی ئەنارشیستەکان لەگەڵ مارکسیستەکاندا لەسەر پێداویستی رێکخراو و دامەزراوە رەسمییەکانە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی کۆمەڵگا، هەروەها ئەنارشیستەکان لەبری پەلاماردانی ژێرخان واتا پێکهاتی ئابوری، تەنها پەلاماری سەرخان واتا دەوڵەت دەدەن. ئەنارشیستەکان لەو بڕوایەدان فاکتەری سەرەکی ناکۆکی لە کۆمەڵگادا پەیوەندی ئابوری نییە، بەڵکو زۆرو فشاری دەوڵەتە لەسەر تاکەکەس و سەرەنجام دروستبوونی ناکۆکییە لە کۆمەڵگادا.

ئەنارشیستەکان لەو بڕوایەدان مرۆڤ لەبنەڕەتدا بوونەوەرێکی ئاکاربباش بووە، ئەم ئاکارە بەهۆی کاریگەریی جەورو ستەمی دەوڵەتانەوە لەنێوچووەو دوای نەمانی جەورو ستەم، ئەوانیش سەرلەنوێ مرۆڤبوونەکەی خۆیان دەستەبەر دەکەنەوە.

لەبنەڕەتدا چەمکی ئەنارشیزم هەر لەسەرەتای لەدایکبوونییەوە، جۆرە ناپوختی و دووفاقییەکی لەگەڵدا بووە. هەڵبەتە ئەم دووفاقییە بەهۆی لاوازیی لە زمان یاخود چەمکەوە نییە، بەڵکو زادەی ویستراو و نەویستراو، ڕەوت و دژە ڕەوتە کۆمەڵایەتییەکان بووە کە لەکۆمەڵگایەکدا دێنەئارا، ئەم دوو فاکتەرە دژبەیەکە واتا هاوکات لەگەڵ پڕوپاگەندەکردن و کارکردن لەبری قسەکردن و ئازادکردنی مرۆڤ لە ئەفسانەی سیاسەت، جۆرە تێکەڵاوبوونێکی هێناوەتەئاراوە. دەبێ سەرنج لەوە بدەین ئەنارشیستەکان هەم بیردۆزن و هەم تیرۆریست، هەم ئەخلاقین و هەم هەڵخەڵەتێنەر، لە هەمووی گرنگتر سیاسین و دژە سیاسیشن. هەربۆیەشە دەبێ چەمکی ئەنارشیست لەدوو ڕووی یەک دراوەوە هەڵیهێنجین، چونکە ڕوویەکی پۆزەتیڤەو ڕووەکەی تری بە نیگەتیڤ خۆی دەنوێنێت، لەمڕووەوە ئەم چەمکە کۆمەڵایەتییە هەمیشە ڕووبەڕووی ئاڵۆزی بۆتەوە.

ئەنارشیزم دژ بە هەرجۆرە حکومەت و دامەزراوەیەکەو هیچ جۆرە چاودێرییەکی دامەزراوەیی قبوڵ ناکات. بەگشتی کۆمەڵناسان لە ڕەهەندی نیگەتیڤی ئەنارشیزم دەدوێن، چونکە کۆمەڵگایەک وێنا دەکەن کە تیایدا هیچ جۆرە ستراکتورێکی کۆمەڵایەتی و هیچ جۆرە نۆرمێکی (Norm) تیادا نییە، ئەمەش هەمان ئەو ماناو چەمکەیە کە لە ئەدەبیاتی گشتی و تەنانەت لە ئەدەبیاتی زانستیدا جێگەی گرتووە، بەڵام ئەگەر لە دیدگایەکی ترەوە بڕوانینە ئەنارشیزم، ئەوا ئەنارشیزم بڕوای وایە لە بنەڕەتدا مرۆڤە سادەو تەندروستەکان پێویستیان بەحکومەت نییە، چونکە خۆیان خۆڕێکدەخەن، لێرەدا ڕەهەندە پۆزەتیڤەکەیان دەکەوێتەڕوو، بەڵام دەبێ سەرنج لەوە بدرێت هەمیشە دیاردەی مرۆڤدۆستی و یاخود هیممەت بەرزی و تەنانەت هەوڵ و کۆشش لەگەڵ کارە نائەقڵانی و نەستیەکانی مرۆڤدا هاوتەریب نییە.

کەواتە ئێمە لەلایەکەوە ڕووبەڕووی چەمکە نیگەتیڤەکەی ئەنارشیزم واتا دۆخە ناڕێسامەندییەکەی دەبینەوەو لەلایەکی ترەوە لەگەڵ چەمکە پۆزەتیڤەکەیدا ڕووبەڕوو دەبینەوە، واتا ئەنارشیزم وەک ڕێگاچارەیەک لەسەروو ئەو ڕێساو بەرنامەی کارانەی کە تاکەکەس لەژێر چنگی زۆرەملێی دەوڵەتدا قەتیس دەکات کە جیاکردنەوەی ئەم دوو فاقییەش لە سیمای (ژانوس)[٦] دا جێگەی بایەخە. ئەم دووفاقییەی ئەنارشیزم، بناغەی تیۆری مرۆڤی سروشتی لەهەمبەر مرۆڤی شارستانیدا دادەڕێژێت. هەڵبەتە دەبێ سەرنج لەوە بدرێت کە ئەم دووفاقییە بەهیچ چەشنێ لەلایەن خودی ئەنارشیستەکانەوە قبوڵ ناکرێت و ئەوان ڕێگاچارەکەی خۆیان بەدیالێکتی ناکۆکییەکانی ئێستای کۆمەڵگا دەزانن.

هەندێ لەمێژوونوسان وەک (توچ مەن)[٧]، ساڵی (١٩١٤ز) بەئاوابوونی ئەنارشیزم دادەنێن، واتا کاتێک چینی مامناوەندی ئەورووپی ویژدانی کۆمەڵایەتیانەی خۆیان بەدەستهێنا، لەکاتێکدا گروپێکی تر وەک (کۆل)[٨] لەو بڕوایەدان یەکێتی چین و بزووتنەوە سیاسییەکان، ئەنارشیزمیان لەخۆیاندا تواندۆتەوەو سەرەنجام مێژوونوسێکی وەک (ود کوک)[٩] لەو بڕوایەدایە ئەنارشیزم مەرگی کۆتایی خۆی لە ساڵی (١٩٣٩ز)دا واتا دوای شکستی کۆماری ئیسپانیا ئەزموون کرد[١٠].

بەواتایەکی تر (ود کوک) ساڵی (١٩٣٩) بەکۆتایی ژیانی ئەنارشیزم دادەنێت، بەڵام لەڕاستیدا بەتەواوەتی ئەوە ئاشکرایە کە ئەنارشیزم وەک هێزێکی بزووێنەر لەمێژوودا، هیچ جۆرە واقیع و ڕەسەنایەتییەکی تیادا نەبووە. لەمڕووەشەوە ئەنارشیستەکان هیچکاتێک لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە واتا لەڕووی فراوانی لایەنگرەوە، بەرچاو نەبوون. بۆنمونە کاتێک نزیکەی سێ هەزار ئەنارشیست لە لیۆن[١١] لە دەوری باکۆنین[١٢] کۆببوونەوە، ناوبراو ئەم ژمارەیەی بەزیاتر لە چاوەڕوانی خۆی ناوبرد.

ئەنارشیستە کلاسیکییەکان وەک باکۆنین، مالاتیستا[١٣]، سۆریل[١٤] و کرۆپۆتیکین[١٥] ئەنارشیزم بەجۆرە ژیانێک پێناس دەکەن کە هیچ جۆرە وێنایەک یاخود بەرنامەیەکی بۆ ئایندە نییە. ئەوان جەختیان لەسەر مرۆڤە سروشتییەکان دەکردەوە، واتا ئەو مرۆڤانەی پێش مرۆڤە سیاسییەکانیان داوەتەوە، شارستانییەتیش شتێک نییە جگە لە فاکتەرێکی کۆتوبەند کە هیوا راستەقینەکان لە مرۆڤی سروشتی دەستێنێتەوە. ئەوان لەو بڕوایەدان لەم دۆخەدایە کە ڕستە بەناوبانگەکەی

هۆبز:» جەنگی هەمووان دژ بەهەمووان» بەڕاست دەگەڕێت. لەمبارەیەوە ئەنارشیزم لەگەڵ هۆبزدا بەتەواوەتی دژیەكن و لەگەڵ مرۆڤی سروشتی و دڕندەی ڕۆسۆدا تەباترە.

## ا: جۆرەكانی ئەنارشیزم:

كاتێک بمانەوێ بنەمای جۆرەكانی ئەنارشیزم شرۆڤە بكەین، ڕووبەڕووی ئەم هەقیقەتە دەبینەوە كە لەبنەڕەتدا لەبەرئەوەی ئەنارشیزم لەگەڵ هەرجۆرە سیاسەت یاخود هەقیقەتێكی سیاسیدا ناكۆكە، بەم پێیە ناكرێ مۆدێلیشی هەبێت، بەڵكو ڕێبازو میتۆدی بەدەستهێنانی باشترین جۆری ژیان لەدیدگای ئەنارشیستەكانەوە لەگەڵ ئەو ستراتیژانەی جێگەی خواستی ئەوانە، دەتوانرێ شرۆڤە بكرێت. بەمانایەكی سادەتر ئەگەر لە جۆرەكانی ئەنارشیزم بدوێین، مەبەستەكە جەختكردنەوەیەكی زیاترە لەسەر ئەو ڕێگاو ڕێبازەی كە باشتر مرۆڤەكان بگەیەنێتە ئامانجە ڕاستەقینەكانی خۆیان.

بۆنمونە ئەم پرسیارانە دەخرێتەڕوو كە لە یەكەمین هەنگاو و لەساتی دەستپێكی كاردا، ئایا دەبێ سود لەهێز وەربگیردرێت؟ ئایا دەوڵەت دەبێ بەیاریدەی ڕێكخستنی كرێكارانەوە، لەخوارەوە بەڕێوەببرێت یاخود سەرەتا سیستەمێک دروست بكرێت كە ئامانجەكەی لابردنی دەوڵەت بێت؟ ئەگەر لە ڕەهەندی مێژووییەوە بنۆڕینە مەسەلەكە، هەمیشە گروپ و بزووتنەوە كەمینەكان دوای ماوەیەک دووچاری لێكترازان دەبنەوەو بەسەر حیزبە جۆراوجۆرەكاندا دابەش دەبن، چونكە ئەوان هێزی سیاسیان بۆ گەیشتن بەئامانجەكانیان نەبووە. ئەنارشیزمیش لەم ڕێسایە جودا نییەو ئەگەر لەجۆرەكانی بدوێین، لەهەمان ئەو چوارچێوەیەدا دەبێت.

## 1-ئەنارشیزمی بەرژەوەندخواز[16]:

یەكەمین ڕەوتی ئەنارشیزم لەیەكگرتنی بێگانەكان و بێ نیشتیمانەكان[١٧] و ئایدیالیستەكانی شاری یۆتۆپیادا[١٨]، لەچوارچێوەی تیۆری ئەنتی ئەریستۆكراتیدا فۆرمەڵە بووەو خۆی كامڵ كرد. ئەم گروپە هەمیشە بۆ ئایدۆلۆژیاكەی خۆیان جەختیان لەسەر دەستگرتن بەسەر ماڵوموڵكی دەوڵەمەندان بەقازانجی هەژاران دەكردەوە. هەژارو بێنەوا ڕاستەقینەكان هیچ كاتێ نەیانتوانیوە وتەبێژێكیان بۆ خۆیان هەبێت، چونكە قسەكردنیان لەڕێنماییەكانی ئەواندا پێگەیەكی نەبووە، هەربۆیەشە لە نوسینەكانی دیدرۆ[١٩] یاخود گۆدوین[٢٠] هەمیشە بە سەرسورهێنەرانە شوێنپێی لێكجیاكردنەوەی هەژارو دەوڵەمەند دەبینرێت.

تەنانەت ئەنارشیستە بەرژەوەندخوازەكانی وەک سان سیمۆنیش[٢١]، جەخت لەسەر هەستێكی ئەقڵانی ناكەنەوە، بەڵكو پتر بەدوای دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەكدان بۆ خۆخاڵیكردنەوە لە گوناه و ڕزگاربوون لە خەجاڵەتی گوناه. لەپێناو ڕزگاربوون لەم دۆخە نادیارو گرفتدارە، بەناچاریی دەبێ پەنا بۆ هێزی ئەقڵ ببەین. لەمڕووەوە ئەنارشیستە پراگماتیستەكان، پیشەسازی وەک هەقیقەتێک قبوڵ دەكات بەم مەرجەی لەلایەن دەسەڵاتێكی ئەقڵانییەوەو لەسەرەوە بەڕێوەببرێت تا پێداویستییە

راستەقینەکانی کۆمەڵگا دابین بکات. ئەوان لەو بڕوایەدان تاکەکەس و کۆمەڵگا، دەوڵەت یاخود کەرتی تایبەت، دەسەڵاتدار یاخود دەسەڵات بەسەرداکراو، سەرجەمیان دەبێ لەژێر ئاڵای ئەقڵدا کۆببنەوە، لەم ڕووەوە دەوڵەت بەبەربەست لەبەردەم ڕێگای خۆیاندا دادەنێن.

## 2-ئەنارشیزمی لادێی:

لقێکیتری ئەنارشیزم، ئەنارشیزمی لادێیە. ئەگەرچی ئەوروپا لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەخێرایی ڕێگەی بەرەو پیشەسازی گرتبووەبەر، بەڵام هێشتا گوند بەشێکی مەزنی کۆمەڵگەی خۆرئاوای پێکدێنا. پیشەسازی و پیشەسازیبوون لەم ئاقارەوە برەوی پێدەدرا کە هەقیقەتەکان لە کارکردندا جوانتر خۆیان پیشان دەدەن و هەوڵوکۆششی ژیانی لادێ بەیارمەتی پیشەسازی، زیاتر دەبێت.

لە سەردەمی تۆماس مونتزەرەوە[٢٢] تا سەردەمی شارل فۆریە[٢٣]، وتەبێژانی چینی هەژار بەتوڕەییەوە باسیان لە پێشکەوتنی هێزی نوێی پیشەسازیی دەکرد کە بە ناچارییەوە بە سەرمایەداریی کۆتایی دەهات، لەکاتێکدا سەرمایەداری هیچکاتێ نەگەیشتە ئامانجە دەستنیشانکراوەکانی خۆی.

بەپێچەوانەی ئەنارشیزمی پراگماتیزمەوە (بەرژەوەندخواز)، ئەنارشیستە لادێییەکان بڕوایان بە (ڕیفۆرم[٢٤] لەسەرەوە) نییە. بەپێچەوانەوە ئەوان خوازیاری لاچوونی دەوڵەت بوون، بەجۆرێک لەبری ئەوان ئەنجومەنە[٢٥] بێ فۆرمەکانیان[٢٦] دەوێ کە لەسەر بنەمای هەرەوەزو بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی بونیادنراوە.

جارێکی تر گوێبیستی ئەوە دەبینەوە کە لە بنەڕەتدا ئەنجومەنە ئەنارشیستییەکان بۆ ئەم ئامانجە دروست بوون تا ئەو بەها راستەقینانە وەدیبهێننەوە کە سەرمایەداری ناپاک و ناشرینی کردووە. هەروەها ئەو ڕێگاچارانەش بە ناسەرکەوتوو دەزانن کە لیبراڵیزم وەک لایەنگرێکی سەرمایەداری دەیخاتەڕوو. هەربۆیەشە پێشکەوتنە پیشەسازی و سامانە وەدەستهاتووەکانی ئەو پێشکەوتنە، لەدیدی ئەنارشیستە لادێییەکانەوە بەهیچ شێوەیەک یاریدەی ڕزگاربوونی مرۆڤ نادات و بەپێچەوانەوە بەشکستی مرۆڤ کۆتایی دێت.

لە دیدگای ئەم گروپەوە، گوناه لە توخمی سەرەکی سەرمایەداریدا خۆی حەشارداوە، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە سەرەنجام لەپرەنسیپی پۆست سۆشیالیزمدا دەبینرێت[٢٧].

## 3-ئەنارشیزمی سەندیکایی[28]:

ئەگەر ئەنارشیزمی ئەرستۆکراتی بەرژوەندخواز (پراگماتیک) زۆربەیان هەڵوێستێکی توند و بەگشتی لەگەڵ مەسەلە پەراوێزکەوتووەکانی وەک گیاخواردن، ئازادی لە عەشق و زمانی یەکگرتووی جیهانیدا هەوڵی دەستەبەرکردنی هەڵوێستێکی ڕووناکبیران بدەن و ئەنارشیزمی لادێیی دیدگایەکی تائەندازەیەک سنوردارتریان بۆ ئەو مەسەلانەی سەرەوە هەبێت، بەڵام بۆچوونێکی زۆر خراپیشیان لەسەر پرۆسەی بەپیشەسازیبوون و شارنشینی هەبووبێ، ئەوا ئەنارشیسزمی سەندیکایی کە لەڕاستیدا جۆرە رادیکاڵییەکی[٢٩] یەکێتیانەیە[٣٠]، بەبەراورد لەگەڵ هەردوو چەشنەکەی پێشوودا،

نەرمڕەوییەکی زیاتری تێدایە.

پەیوەندی نزیکی نێوان یەکێتێتی و ئەنارشیزم لە ئەوروپا، ئەنجامی سروشتیانەی ئەو ترس و دوژمنایەتییە بوو کە دەوڵەت لە ڕێکخراو و یەکێتییە کرێکارییەکان هەیبوو، چونکە ڕێکخراوە کرێکاریە پرۆفیشناڵەکان، هەر لەخودی خۆیدا جۆرە دژایەتییەک لەهەمبەر دەوڵەتدا دەسەپێنێت، هەروەکچۆن یەکێتی کاتژمێرسازان لە سویسرا دەوڵەتێکی لەناو دەوڵەتدا دروست کرد[٣١]. بەرفراوانبوونی یەکێتییە کرێکارییەکان لەناو بازنەی سنورداری کرێکاراندا، بووەمایەی بێداری سیاسی ئەو چینەو سەرەنجام ڕزگاربوون بوو لە کۆتوبەندی سیاسەت بەمانا راستەقینەکەی.

## 4-ئەنارشیزمی بەکۆمەڵ (سۆشیالیستی)[32]:

ئەگەرچی ئەنارشیزم دژ بەهەرجۆرە حکومەتێکە، بەڵام هەمیشە لەو ڕەوتانەی پەیوەندیان بەناوی باکۆنین، کرۆپاتکین و ئینتەرناسیۆنالیستەکانەوە هەبووە، جۆرە وزەیەکی ئەنبارکراوی سیاسی لەبوونیاندا خۆی خستۆتەڕوو.

ئەنارشیزمی سۆشیالیستی، خوازیاری ئازادکردنی کۆمەڵگایە لەپێکهاتەی چینایەتی و دانانی پێگەی خەڵکە لەبری. ئەگەرچی لەم جۆرە ڕەوتە فکرییەدا، چەمکی سەرەکی چینایەتی هەر دەپارێزێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شوێنکەوتووانی باکۆنین هەوڵ دەدەن تا لەڕووی ناوەرۆکەوە، ئەوە ڕوون بکەنەوە کە چەمکی پرۆلیتاریا لەچوارچێوەی سیستەمی کارگەو پیشەسازییدا، زیاتر لێکدانەوەیەکی تاکەکەسییە نەک هەڵوێستێکی ئابوری و ستراکتوری.

لەمڕووەوەیە کە دەتوانرێ چەمکی پرۆلیتاریا، کۆمەڵەی جوتیاریی، میللەت، خەڵک[٣٣] و تەنانەت لومپێن پرۆلیتاریاش[٣٤] لە ئەنارشیزمی سۆشیالیستیدا بوونەتە ئەلتەرناتیڤی یەکترو لەبری یەکتر بەکاردەهێنرێن. ئەوان لەو بڕوایەدابوون کە تێکۆشانی سەرەکی لەنێوان میللەت و دەوڵەتدایە و پرۆسەی شۆڕشی (١٧٨٩ز)ی فەرەنسا دەبێ لەلایەن شۆڕشەکەی دواترەوە واتا کۆمۆنەی پاریس، گۆڕانی بەسەردابێت و کامڵ بکرێت و پاشان دەوڵەتی نەتەوەیی[٣٥] بەتەواوەتی مانا دەبەخشێت.

ئەنارشیزمە سۆشیالیستییەکان رەخنەیان لە تیۆری خەباتی چینایەتی[٣٦] سۆشیالیزم گرتووە، لەبری ئەوەش لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی پێشنیازی دروستکردنی یەکێتییە لیبراڵەکان بەمۆدیلی کۆمۆنە دەکات.

## 5-ئەنارشیسزمی پیلانگێڕی[37]:

بەشێوەیەکی گشتی هەمیشە کێشەی ئەنارشیزم لەمەدابووە کە میللەت وەک یەکەیەکی گشتی بەهەمانشێوەی خێزانێک لەبەرچاو دەگرێت. ئەم کەموکورتییەو ڕەوتی گەشەپێدانی سێنتراڵیزم و بۆرۆکراتیزەبوون لە دەوڵەتە نەتەوەییەکان، لە گرنگترین قەیرانەکانی ئەنارشیزم بووە.

لەدواداوی سەدەی نۆزدەهەم، کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە پەیوەندیی میللەتانی ئەوروپی دەبینرێت کە لە ڕیزیاندا دەکرێ ئاماژە بۆ ئەم گۆڕانکاریانەی خوارەوە بکەین:

٦-وابەستەبوون بەچینایەتی، چیتر بەهۆکاری ئینتیمابوون بۆ چینایەتی هەژمار ناکرێت. بۆنمونە کرێکارانی کارگەکان چیتر ئینتیمایەکی ئەوتۆ بۆ بەشداریی لە دەسەڵاتی سیاسی پیشان نادەن، بەڵکو زیاتر حەز بە بەدەستهێنانی بەرژەوەندی ئابوری و پشکی زیاتر دەکەن.

٧-ئەنارشیزم ئینتیمایەکی کەمتر بۆ تەکنەلۆژیای پیشەسازی پیشان دەدات و لەپێناو بەدەستهێنانی شوێنکەوتووانێکی زیاتردا، حەزی بەوە دەکرد لە کارگە بچوکەکان و کارگەکانی پیشەی دەستیدا بانگەشە بکات. ئەوان خوازیاری کۆمەڵگایەکی بێ ڕێکخراون، لەو چەشنە هەلومەرجەدا بوو کە ئەنارشیزمی پیلانگێڕیی[٣٨] لەمەیدانی سیاسەتدا بەشێوازێکی نوێ هاتەئاراوە.

بونیادی (ئەنارشیزمی پیلانگێڕی) لەسەر بنەمای کێشەیەکی پێشتر تۆمارکراودا بونیاتنراوە، واتا پێی وایە لە بنەڕەتدا دەوڵەت فاکتەرێکە بەپەنابردن بۆ تیرۆرو دروستکردنی ترس لەناو چین و توێژەکاندا چ بەشێوازێکی یاسایی یاخود بەنایاسایی دەگەنە دەسەڵات، چونکە دەوڵەت هەست بەوە ناکات پێویستی بە هیچ جۆرە پشتیوانییەکی خەڵک هەبێت، چونکە دەسەڵاتی چەکی بەدەستەوەیە. لەمڕووەوە لەدیدی ئەم گروپەوە، کارو ڕێبازەکانی چینی حکومڕان هەمیشە تەزویرو درۆیەو بەپێی ئامۆژگارییەکانی میکاڤیلی، پیلانگێڕانەیە. کەواتە هەمیشە و لەهەمموو شوێنێکدا، ڕۆڵی دەوڵەت بەگژداچوونەوەو پێکدادان دەبێ لەگەڵ هێزی ئەنارشیزمدا.

ئەنارشیزمی پیلانگێڕیی، ئومێدی بە لەناوچوونی خێرای دەوڵەت هەیە، هەربۆیەشە بە نەخشەیەکی پێشتر بۆ دارێژراو، هەوڵ بۆ مەرگی گروپی حکومڕان دەدات و پیلانی بۆ دادەڕێژێت.

لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ سەرنج لەوە بدرێ کە ئەم چەرخە واتا دوادوای سەدەی نۆزدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیست، وەک دەسەڵاتی تەکنەلۆژیا لە ئەوروپاو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وابووە. گرفتێکی تر کە لەناو هەناوی ئەنارشیزمی پیلانگێڕی خۆی مەڵاس داوە، ئەمەیە کە ئەستەمە کوشتنە سیاسی و ناسیاسییەکان لەیەکتر جیا بکرێتەوە. لەمڕووەوە ئەنارشیزم هەمیشە هەڕەشەیەک بووە بۆسەر ژیانی خودی خۆی. هەروەکچۆن کرۆپاتکین لەلایەن خودی ئەنارشیستەکانەوە هەڕەشەی کوشتنی لێکراوە[٣٩].

سنوری نێوان خیانەتە خۆکردو خۆویستەکان[٤٠] و کوشتنە بەئانقەستەکان لەڕووسیا، بەجۆرێک ئاوێتەی یەکتر بوون کە جیاکردنەوەیان تائەندازەیەک مەحاڵ بوو، مەسەلەکە دەبوایە بەناچارییەوە بە ئاژاوەیەکی راستەقینەو تەواو کۆتایی بێت[٤١]. میتافیزیکای ئەنارشیزم بەتەواوەتی لێڵە. پەرجوو (موعجیزە) هەمیشە ڕۆڵێکی گرنگی لەو ئاژاوە ئەنارشیستیانەدا گێڕاوە، هەربۆیەشە (فەیلەسوفە ئەنارشیستییەکان)ی بۆ (شاعیر)و (سیاسەتمەداران)یشی بۆ (یۆتۆپیست)[٤٢] گۆڕیوە. لەمڕووەوە ئەم چەشنە ئەنارشیزمە هەمیشە دوای ماوەیەکی کورت، سەرنەکەوتوو بووە، چونکە دەرەنجامی کارەکە زادەی بیرکردنەوە ناپراکتیکی و ناراستەکەی بووە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ ئەوە قبوڵ بکەین کە ئەنارشیستە پیلانگێڕەکان توانیویانە بێنەوایی و بەدبەختی چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا و هەژاران بەجۆرێک لەجۆرەکان بخەنەڕوو و لەبەردەم چاوی کۆمەڵگا ئاشکرایان بکەن[٤٣].

ئەم قوتابخانەیە، کۆمەڵێک یاسای نوێ و بەرفراوانی لەپێناو پاراستنی مافی کرێکاران

دارشت، هەروەکچۆن هێڵێکی جیاکەرەوەی لەنێوان ستەمی سیاسی و تیرۆری خۆکردی تاوانبارە بەئەزموونەکاندا داناوە، لەڕووی یاسایشەوە ئەم دووانە لێکجودا دەکاتەوە. بەدەرلەوەش یاسای کۆمەڵایەتی و ئابوریی داناوە، بەجۆرێک کێشەکانی ژنان، منداڵان و کەمینەکان و تەنانەت پەنابەران لەبەرچاو دەگرێت.

وڵاتان لەهەمبەر ئەو چەشنە بیروباوەڕانەدا، هەمیشە هەڵوێستێکی نەیارانەیان هەڵبژاردووە، بەجۆرێک کە لە کۆمەڵگا سەرمایەدارییەکان بەتایبەتی ئەمریکاو ئەوروپا (هەروەک کۆمەڵگا سۆشیالیستییەکان) هەڵوێستێکی توندیان لەبەرامبەریاندا گرتۆتەبەر، ئەم خاڵەش نیشاندەری ئەم مەسەلەیەیە کە ئەم بیروباوەڕو ڕێچکە هزریە هێشتا شیاوی لێکدانەوەو بیرکردنەوەیە.

## 6-ئەنارشیزمی کۆمۆنیستی[44]:

بیروباوەڕە توندڕەوە جۆراوجۆرەکان، جۆرێکی تری ئەنارشیزمی هێنایەئارا کە لەڕاستیدا لەڕووی تیۆرییەوە، وەڵامێک بوو لەهەمبەر پارتە پیلانگێڕە دژەڕووناکبیرییە توندڕەوەکان و لەڕووی پراکتیکییەوە لەسەرئاستی نێودەوڵەتی وەڵامێک بوو لەهەمبەر رووناکبیرە توندڕەوەکاندا.

بێگومان دەبێ (ئەریکۆ مالاتێستا)[٤٥] بەنوێنەری بەرجەستەی ئەنارشیزمی کۆمۆنیزم بزانرێت. ئەو جەختی لەسەر سودوەرگرتن لەپیادەکردنی راستەوخۆو بێ یاریدەو بێ پەردە دەکردەوە.

گرنگترین خاڵ لە پرەنسیپی ئەنارشیزمی کۆمۆنیستیدا، (ناسینی دەسەڵات)ە وەک توخمێکی ئۆرگانی و ناوخۆیی لەپێناو گەیشتن بەئامانجەکانی خۆی. مالاتێستا لەمبارەیەوە بایەخی بە دوو مەسەلە دەدا: یەکەمیان پیادەکردنی دەسەڵات بەهیچ شێوەیەک نابێ ببێتەمایەی هەڵاتن یاخود خۆشاردنەوەی هاوڵاتیان، بەڵکو ئامانج لەبەکارهێنانی دەسەڵات دەبێ هەوڵێکی هاوبەش بێ لەلایەن گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵگاو یاخود بەلایەنی کەمەوە بەشێ لەم چین و توێژە بێت کە گەیشتوونەتە هۆشیارییەکی شۆڕشگێڕانە. دووەمیان دەبێ لەهەر جۆرە جەختکردنەوەیەکی زیاد لەئەندازە لەسەر سیستەمی پارلەمانی کە لە خەسڵەتە نێودەوڵەتییەکانی یەکەمە، دوور بکەوینەوە. بەدەر لەمانەش، مالاتێستا تەنانەت بەشێوەیەکی ناراستەوخۆش دووژمنایەتیە دژە مارکسیەکانی باکۆنین و کرۆپاتکین قبوڵ ناکات، هەربۆیەشە ناکۆکیەکی قوڵ لەنێوان کۆمەڵگای سۆشیالیستی باکۆنین و کۆمۆنیزمی مالاتێستادا دەبینرێت.

لە بنەڕەتدا لەبارەی باکۆنینەوە، بەگرفتە بتوانین بڵێین ڕێبەری شێوازێکی هزریی گروپێک یاخود قوتابخانەیەک بێ کە لە خەسڵەتە بەرجەستەکانی (نێودەوڵەتی یەکەم)ە.

مالاتێستاو شوێنکەوتووانی هەروەک سێرگی[٤٦]، ستپنیاک[٤٧]، کافیرۆ[٤٨] لەم بڕوایەدابوو بەرلەهەرشتێ پێویستە کار لەبری قسە دابنێین و پاشان ببین بە ڕێنمایکارو ڕێبەرێکی شایستە. بەگوزارشتێکی تر، لەبری باکۆنیزم دەبێ مەرجەکانی مارکسیزم کە پراگماتیکیانەیە، حکومڕان بێت. واتا دەبێ سۆشیالیزمی زانستی کە (یاساکانی مێژووی گریمانەی ڕەوتی کامڵبوون)[٤٩] و هەوڵدانی

سەخت لەکارو کردەوەدا بکەینە حاکم، بێگومان ئەم ڕەوتەش پێویستی بەدەزگایەکی شۆرشگێڕانە هەیە.

ئەنارشیزمی کۆمۆنیستی بەشێوەیەکی تەواوەتیانە، دژ بە بەکارهێنانی دەسەڵات نییە، بەڵکو لەکاتێکدا سودوەرگرتن لەدەسەڵات قبوڵ دەکات کە لەپێناو پەروەردەو فێرکردن یاخود ستەملێکراواندا بێت.

ئەگەر وادابنێین باکۆنین لەڕێگەی مارکسەوە گەیشتە ئەنارشیزم، دەتوانین ئەوە قبوڵ بکەین کە مالاتێستا لەڕێگەی (سان سیمۆن)[٥٠] ەوە گەیشتە ئەنارشیزم. ئامانجی سەرەکی ئەنارشیزم ئۆرگانیزەکردنی خەڵکە تالانکراوەکەیە تا چانسی هێرشێکی هەمەلایەنە لەپێناو تێکشکاندنی بنکەو سەنگەرەکانی سەرمایەداری فیوداڵدا فەراهەم بکات. بەمشێوەیە ئەنارشیزمی کۆمۆنیستی، هاوشێوەی جۆرە دامەزراوەیەکی سیاسی دەبێت کە لەژێر بڕیارە تاوتوێ نەکراوەکانی پارلەماندا نییە.

کاتێک مالاتێستا بەڕاشکاوییەوە[٥١] دەیەوێ وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە کە چۆن کێشەی حکومڕانیکردنی خۆماڵی و خۆڕێکخستن لادەبرێت، وەڵامێکی تەنزئامێز دەداتەوە.

ئەو دەڵێت:» حکومەتێک لەڕێگەی بلیمەت و دەستەبژێرەکان و بەپشتیوانی خەڵکانی کەم ئاوەز بەرپا دەبێت»[٥٢]. ئەم دیدوبۆچوونە هەروەک شمشێرێکە کە دەبێ فاکتەرەکانی سۆشیالیزمی پارلەمان یەکالا بکاتەوە، لەهەمانکاتیشدا دەربڕی ئەم بیروباوەڕەش دەبێت کە وەرزی سیاسی یەکسانە لەگەڵ دامەزراوەی سیاسی[٥٣].

بەدڵنیاییەوە لەڕووی تیۆریەوە توخمی دەسەڵاتی ئەنارشیزمی کۆمۆنیستی لەپێناو سەلماندنی نەرمرەویی سروشتی مرۆڤدایە کە بەبێ بوونی دەسەڵاتێکی حکومی، دەتوانێ پێداویستییەکانی خۆی دابین بکات و بایەخ بەڕێکخستنی مەسەلەکانی نێوخۆی بدات. لەمبارەیەوە دەبێ بوترێ ئەنارشیزمی کۆمۆنیستی، پێش لینین دەکەوێت و بەر لە لینینیش (ڕێبازی بڕیاردانی پەتی) لە (ڕێبازی بەڕێوەبردنی حکومەت)ی جیا کردۆتەوە.

مالاتێستا بەپێچەوانەی زۆرینەی شوێنکەوتووانی خۆیەوە، جیاوازی لەنێوان دەسەڵاتی یاسایی و دەسەڵاتێکی تاکڕەودا کردووە. ئەو لە کۆمەڵگادا ئەولەوییەت دەداتە کەسێک کە ئاشنای ئەرکەکەی خۆی بووبێ و ئەرکناس بێت، ئەو چەشنە کەسانە لە کەسێکی هاشوهوشدار و خۆدەرخەر جیا دەکاتەوە.

لەبەرئەوەی ئەنارشیزمی کۆمۆنیستی خوازیاری لەناوبردنی حکومەتە لەڕێگەی پرۆلیتاریاوەو بەناوی سەرجەم مرۆڤایەتیەوەیە، لەم ڕووەوە لە کۆمۆنیزمی سۆشیالیستی جیا دەبێتەوە.

مالاتێستا هەستی بەوە کردبوو کە چەمکی لەناوبردنی دەوڵەت بەلایەنی کەمەوە دەبێ بەخۆپارێزییەوە بەکاربهێنرێ، چونکە چەمکی دەوڵەت هەرجۆرە کارێکی حکومڕانی لەخۆدەگرێت و ئەرکی ئەنارشیزم لەناوبردنی هەرجۆرە زۆروستەمێکە لەدەرەوە، چ لەسەرئاستی هەرێمایەتی یاخود نەتەوەیی بێت، هەربۆیەشە حکومەتی تاکەکەسەکان دەبێ لەلایەن مرۆڤەکانەوە لەناوبچێت و جێگەی خۆی بداتە حکومەتی شتەکان[٥٤].

## 7-ئەنارشیزمی تاکگەرا [55]

کاتێک ئەنارشیزم لە ئەوروپا بەخێرایی بنەما ئابورییەکانی خۆی پتەوکردو هەوڵی دا بەدانانی کاریگەریی لەسەر خەڵک، ببێتە دەسەڵاتێکی شۆڕشگێڕانەو گشتی، هەربۆیەشە لەم ڕووەوە چەند دامەزراوەیەکی بنچینەیی لە ژیانی سیاسی مرۆڤەکاندا دەستەبەرکردبوو، لە ئەمریکاش جۆرە ئەنارشیزمێکی تاکگەرا لەساتی فۆرمەڵەبوون و گەشەکردندا بوو.

دەبێ ماکس شتاینەر[٥٦] بە بانگەشەکاری سەرەکی تاکگەرایی لە ئەنارشیزمدا دابنێین. خەسڵەتی سەرەکی ئەم جۆرە ئەنارشیزمە، بەچەقدانانی خودی مرۆڤ یاخود کەسێکە وەک خاڵی بەیەکگەیشتنی سیمای مرۆیی و بڕیاردانەکانی مرۆڤ بوو، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە دەوڵەت وەک خاڵی بەیەکگەیشتنی سەرجەم سیما نامرۆییەکان و فاکتەری جەوروستەم بەسەر مرۆڤەکانەوە ناسرابوو. لەمڕووەوە هەندێ لە لێکۆڵیارانی ئەنارشیزم، شتاینەر پتر وەک نهێلیستێک دەناسێنن تا ئەنارشیستێک[٥٧].

ئەنارشیزمی تاکگەرا وەک ئەنارشیزمی بەرژەوەندخواز لەسەر فەلسەفەی بەرژەوەندخوازیی بنیات نراوە، ئەم جیاوازییەی هەیە کە زیاتر جەخت لەسەر بەشە توندڕەوییەکانی کەسێتی[٥٨] دەکاتەوە.

بەگشتی دەبێ لەمڕووەوە دوو جۆرە یوتی لیتاریزم لەیەکتر جودا بکەینەوە: مۆدێلی سۆسیۆلۆژیای فەرەنسی و مۆدێلی سایکۆلۆژیای بەریتانی. هەروەکچۆن پێناسی یۆتی لیتاریزمی بەریتانی کارێکی سادە نییە، خاڵی لەیەکتر جیاکەرەوەی ئەنارشیزمی تاکگەرا لەگەڵ موحافیزکاری[٥٩] توندڕەویش زۆر بەگرفتە. لەکاتێکدا شتاینەر بنەمای لۆژیکیانەی ئەنارشیزمی تاکگەرای داڕشت، لە بەریتانیا ڕەخنەکانی موحافیزکارەکان لە دەوڵەت وەک جێرمی بنتام[٦٠] و هێربێرت سپێنسەر[٦١] توند ببوو. ئەم ئاڵوگۆڕو بزاوتە ئەنارشیستیانە، هەستە ڕاستگۆیی و خاوێنەکانی خەڵکی دەبزوواند.

ئەنارشیزمی تاکگەرا بەبێ سەرکردایەتی سیستەمێکی دەسەڵاتدار، کۆمەڵگای سۆشیالیستی بەمەحاڵ دادەنا. ئەم قوتابخانەیە، ڕێزی لە موڵکایەتی تایبەت یاخود بەمانایەکی باشتر لە مافی موڵکایەتی تاکەکەسی دەگرت بەمەرجێ لەلایەن هەوڵ و کۆششی تاکەکەسەوە بەدەستهاتبێ. لەدیدی ئەم گروپەوە، ئامانجی کۆمەڵگا لەهەر مەیدانێکدا دەبێ پاراستنی سەربەخۆیی تاکەکەس بێت، کەواتە هەرجۆرە کۆبوونەوەیەکی مرۆڤەکان ئەگەر ببێتەمایەی سنوردارکردنی ئازادی تاکەکەس بەتایبەتی کۆبوونەوە لە دەوڵەتدا، دەبێ بخرێتە ژێر چاودێرییەوەو لەکاتی پێویستدا، لەناویشببرێت.

بنەمای تاکگەرایی لەسەر یەکسانییە. یەکسانی لە ڕەگەز، نەژاد، ڕەنگ یاخود کاردا، هەربۆیەشە ئەنارشیزم دەبێ هەوڵ بۆ لەناوبردنی تەواوەتیانەی مافی خانەنشینی، ڕیا، قازانجی پشکایەتی بێت بەو مەرجەی بەرهەمی ڕاستەقینەی کاری مرۆڤەکە نەبێت.

سیستەمی دیموکراسی کە لەسەر بنەمای زۆرینە راوەستاوە، بەتەواوەتی بێنرخە، چونکە هەرجۆرە مامەڵەیەک لەگەڵ مافی سروشتیانەی تاکەکەس، ستەمکارانە بووەو دیموکراسی وەک سیمبولێکی تیرانی (تاکڕەو)ی (زۆرینە) بەمردوو دادەنرێت. بەبۆچوونی ئەم گروپە، هەر پێناسێک بۆ ئازادی

لە ئازادێتی لاوازترین حیزبی کۆمەڵگاوە دەست پێدەکات. ئەگەر ئەم ئازادییە لەدەستبچێ ئەوا ئازادیش کۆتایی هاتووە، چونکە مافی یاسادانان بە (زۆرینە) سپێردراوەو (زۆرینە) مافی ئەمەی هەیە کە بەئارەزووی خۆی و سەرەنجام لەڕێگەی ستەمەوە، یاسا دابنێت، کەواتە سەنگی مەحەکی هەڵسەنگاندنی ئازادی، چانسی دەرکەوتن و لەکاتی پێویستیشدا مافی سەرپێچی (کەمینە)یە لەیاسای (زۆرینە).

ئەنارشیزمی تاکگەرا بەهۆی تایبەتمەندێتی و خودی تایبەتمەندێتییەکەی خۆیەوە، پێگەی سەرەکی و مەیدانی ڕۆڵگێڕانی خۆی لە خۆرئاوای ئەمریکادا وەدەستهێنا، ئەمەش لەبەر ئەو فاکتەرە بوو کە ئەم جۆرە ئەنارشیزمە بەرجەستەبوونی کامڵانەی کەسایەتی خۆی لە خۆشویستنی زوهدی دونیادا[٦٢] دەبینێتەوە. بەدەربڕینێکیتر، دابونەریتی دونیاپەرستی پرۆتستاتیزم و مانای قازانجی سەرمایەداری[٦٣]، پێکەوە ئاوێتە دەبن.

ڕەوتی ئەنارشیزم لە ئەوروپا بووە هاوشانی سیاسەتە سۆشیالیستییەکان، سەرەنجام لەمڕووەوە ئەوان هەڵوێستێکی چینایەتیانەیان پەسەند کرد. سۆشیالیستەکان و بەتایبەتی مارکسیستەکان، هەمیشە هەوڵیان داوە تا ئەنارشیستەکان لە بناغەدانەرە سەرەتایی و توندڕەوەکانی خۆیان دووربخەنەوە. لەکاتێکدا لەئەمریکا بارودۆخەکە بەتەواوەتی بەجۆرێکی تر بووە، واتا ئەنارشیستەکان هەمیشە هەوڵیان لەپێناو بەدەستهێنانی موڵکایەتی تاکەکەس و وردەبۆرژوایی داوە، هەربۆیەشە ئەنارشیزم لەئەمریکا هەمیشە بەیەکێک لە گرنگترین ڕەخنەگرەکانی سۆشیالیزم هەژمار کراوە[٦٤].

لەبارەی بیروباوەڕە دژەسۆشیالیستییەکان لەئەمریکا، دەبێ وتەکەی (ویلیام گرین) وەبیربهێنینەوە کە لە ساڵی (١٨٤٩ز)دا وتویەتی، ناوبراو دەڵێت:» لە سۆشیالیزمدا تەنها یەک حکومڕان هەیە ئەویش دەوڵەتە. لەکاتێکدا دەوڵەت بوونەوەرێکی زیندوو نییە کە هەست بە خۆشبەختی و بەدبەختی بکات. سۆشیالیزم جگە لەهەڵخەڵەتاندنی خەڵک هیچیتر نییە، چونکە لە ئۆرگانیزەکردنی خۆیدا بەدبەختی خەڵکی لەخۆگرتووەو تەنها دەبێتەمایەی دروستبوونی چینێک واتا چینی کۆیلەکان»[٦٥].

ئەنارشیستە تاکگەراکان بایەخی زۆر بە فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵان دەدەن و لەم مەیدانەدا بەرنامەی تێروتەسەلیان هەیە. ئەوان لەو بڕوایەدان کە فێرکردن و پەروەردەکردنی مرۆڤە نوێیەکان، جۆرە مرۆڤگەلێکی ئازاد دەهێنێتەدی کە ئەم کارە دەبێ لە سەردەمی منداڵییەوە ئەنجام بدرێت.

## 8-ئەنارشیزمی ئاشتیخواز[66]

لەکاتێکدا زۆرینەی ئەنارشیستەکان بەپێچەوانەی بانگەشەکانی ئێستاوە، هەرگیز تاکتیکە تیرۆریستییەکانیان بەکارنەهێناوە، هەندێ لە شوێنکەوتووە کلاسیکییەکانیان تەنانەت ئەم ڕێبازانە بە ناکاریگەر دادەنێن و ڕەتیشی دەکەنەوە.

ئاوابوونی مێژووییانەی ئەنارشیزم و خۆپاراستنی تەواوەتیانە لەهەرجۆرە بەشدارییەکی سیاسی، ئەم چانسەی بۆ ڕەخساندن کە پاشماوەی ژمارەی شوێنکەوتووەکانیان هەروەک جاران، لەدووتوێی

خۆپارێزی و تەقوادا بهێڵێتەوەو لەهەمانكاتدا پەیوەندی پڕبەرهەمی خۆیان لەگەڵ سۆشیالیستەكاندا لەدەست بدەن و سەرەنجام سنوری باسوخواس و كاریگەرییەكانیان پتر لە رابردوو، كەم ببێتەوە.

ئەو ئەنارشیستانەی بڕوایان بەهێزی پاساوهێنانەوە هەبوو، هەوڵیان دەدا مۆدێلێك بۆ رەفتارێكی هاوبەشی خۆیان بونیاد بنێن تا ئەقڵانیبوونی بۆچوونەكانی خۆیان بسەلمێنن. لە نوسینەكانی گاندیدا[٦٧]، بەكردەوە وێنای ئاشتیخوازانە وەك ڕێگاچارەسەرێكی بنچینەیی و تەنانەت پێویستیش بۆ ژیانێكی راستەقینە دەبینرێت، تەنانەت لەمەش زیاتر واتا گاندی موڵكایەتی و پێداویستییە مادییەكان بە لەمپەری بەردەم ڕێگای ژیانێكی راستەقینە دادەنێت.

تیۆری پێشكەشكراوی دەوڵەتێك لە هزری ئەنارشیزمی ئاشتیخوازدا، لەگەڵ بیروباوەڕە كلاسیكیەكانیاندا تەبایە. بە بۆچوونی گاندی، دەوڵەت لەپرۆسەی بەرژەوەندی و وەبەرهێنانی خۆیدا، بایەخ بەسێ كاری تایبەتی[٦٨] و گرنگ دەدات:

١-دەوڵەت هەمیشە لەخزمەتی میكانیزمی دابەشكردنی كاڵاو خزمەتگوزاریدایە.

٢-میكانیزمێك دەهێنێتەئارا كە ناكۆكی و كێشمەكێشەكانی نێوان خودی فاكتەرەكانی دەوڵەت لادەبات.

٣-سەرەنجام دەوڵەت وەك ئامرازێكی دڵنیابەخش وایە لەپێناو پاراستنی پەیوەندییە نەتەوەییەكان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی.

لەهەمانكاتدا دەبێ ئەوە ڕەچاو بكرێت كە ئەم تیۆرییە، لەناواخندا جەختیش لەسەر سروشتی دەوڵەت دەكاتەوە وەك یەكەیەكی سەربەخۆی تێكدەریش. سەرجەم دەوڵەتە نەتەوەییەكان لەسەر بنەمای ستەم بنیاد نراون نەك فەزیلەت و مرۆڤدۆستی. هەر كارێكی ناچارییانە كە لەلایەن دەوڵەت یاخود بەئامرازێكی زۆرەملێ ئەنجام بدرێت، بەشێوەیەكی پۆزەتیڤ سەیری دەكەن.

لەبنەڕەتدا كێشەی كۆمەڵگا لەكێشەی تاكەكەسەوە دێتەئارا، هەڵبەتە بەم گریمانەیەی كە لەكۆمەڵگادا تەبایی و یەكگرتوویی هەبێت.

بەم شێوەیە ئەگەر وادابنێین سروشتی دەوڵەت بۆ پاراستن و زیادكردنی دارایی تایبەتی بێت نەك لە قۆناغی یەكەمدا بۆ زیادكردنی خێروبێری گشتی، كەواتە دەبێ بەناچارییەوە دەوڵەت پاكسازی لەخۆیدا بكات. واتا لەبری دەسەڵاتی حكومی، دەبێ فیدراسیۆنێكی جیهانی بەپێی ڕێككەوتنی هەمووان[٦٩] و بە هەرەوەزی بێتەئاراوە تا جێگەی دەسەڵاتی دەوڵەت بگرێتەوە[٧٠].

لە نوسینەكانی تۆڵستۆیشدا[٧١]، لێكچوونێكی زۆر لەگەڵ بیروباوەڕەكانی گاندی دەبینرێت. تۆڵستۆی خۆی لەهەمبەر ڕووسیایەكی پیرۆزكراودا دەبینێتەوە كە ویژدانی هاوبەشی چینی دەوڵەمەند كۆمەڵە كۆیلەیەكی هاوشێوەی یەكتر بوون، لەكاتێكدا بەدرێژایی هەفتە لەبری دۆزینەوەی ئەو ڕێگاو ئامرازانەدان كە گوندنشینە بەرواڵەت ئازادەكان تاڵانبڕ بكەن.

تۆڵستۆی فۆرمە خاوێن و نەشێوێندراوەكەی مەسیحییەت بەمەزهەبێك دەیخەملێنێ كە لەبری كارە نائەقڵانی و زۆرەملێكان، جۆرە (ڕێككەوتنێكی نوێ لەژیاندا) دروست بكات، بەجۆرێك هیچ كەسێ نەتوانێ پەنا بۆ ستەم دژ بە كەسێكی تر ببات. ئەنارشیزمی ئاشتیخواز گەیشتۆتە ئەم

ئەنجامەی کە دەسەڵاتی دەوڵەت و هەر ناوەندێک یاخود تاکەکەسێک کە بەجۆرێک لەجۆرەکان پەیوەندی بەدەسەڵاتی دەوڵەتەوە هەبێت، هەروا بەسادەیی ئەم (ڕێککەوتنە نوێیەی ژیان) پەسەند ناکات، هەربۆیەشە ئەو دەوڵەت و لایەن و کەسانە دەست بەتیرۆرە سیاسییەکان دەکەن.

بەبڕوای تۆڵستۆی، حکومەت و چینی حکومڕان لەسەر بنەمای هەق کار ناکەن، بەڵکو دامەزراوەیەکی دەستکرد دەهێنێتەکایەوە کە بەیارمەتی و هاریکاریی تەواوەتیانەی زانستی هەموو مرۆڤەکان دەسەڵاتێک دروست بکات، دەسەڵاتێک کە خۆی لەنێو ئەو بازنەیەدا قەتیس دەکات و ئیدی خۆڕزگارکردنیش مەحاڵ دەبێت.

لەڕوانگەی گاندی و تۆڵستۆیەوە[٧٢]، مێژووی کۆمەڵگا چینایەتییەکان خۆی بەڵگەی ئەم بانگەشەیەیە کە زۆرو ستەم هیچکاتێ دژ بەخودی خۆی واتا دژ بەکۆدەنگی کۆمەڵگا[٧٣] بەکارنەهێنراوە. کەواتە بەمشێوەیە زۆرو ستەم ئۆرگانیزە دەکرێت و هێزەکەشی زیاد دەکرێت. لەگەڵ بێداری ویژدان و هەستی مرۆڤەکاندا هێزی دەسەڵاتیش جڵەو دەکرێت و لەگەڵ ئازادکردنی سەرمایە سروشتییەکانی خەڵک، هاریکاریی و عەشقی دوولایەنە جێگەی زۆرو ستەم دەگرێتەوە. بەهەرحاڵ ئەنارشیستە ئاشتیخوازەکانیش هەمیشە حەز بە بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەت دەکەن.

بیروباوەڕی ئەنتی دەسەڵات لای تۆڵستۆی، هەوڵێک بوو لەپێناو بونیادنانەوەی مەسیحییەتێکی خاوێن و ئایدیالەکانی ژیانێکی سروشتی و ڕەسەن لەناو نەتەوەیەکی سادەدا، بەڵام ڕەخنە توندەکانی تۆڵستۆی لە ڕێککەوتنامەی کۆمەڵایەتی سەبارەت بەو ستەمانەی لە کۆمەڵگادا ڕوودەدەن، بیرکردنەوەکانی تۆڵستۆیان بەرەو جۆرە نهێلیزمێکی کلتوریی ڕاپێچ دەکرد. تۆڵستۆی لە نەیارەکانی نوێگەری و هەرجۆرە دەسەڵاتێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی و یاخود کڵێسا بوو، هەربۆیەشە ناوبراو لەساڵی (١٩٠١ز) لە کڵێسای ئەرتۆدۆکسی ڕووسیا دەرکرا. ئەم هزرە بەپێچەوانەی سەرجەم ئەو هزرانەی کە باس کران وەک: فاشیزم، لیبراڵیزم، مارکسیزم هێشتا نەگەیشتۆتە دەسەڵات و ئەزموونێکی پراکتیکیانەشی نەداوە بەدەستەوە.

## پەراوێزەکان:

1-anarchisme.

2-anarchia.

3-individualisme.

4-Prerre Joseph Proudhon (1809-1865).

٥-نمونەی ئەم جۆرە مرۆڤانە لەکۆمەڵگاکاندا کەم نین کە بەشێک لەکاتی خۆیان بۆ کارێکی خێرخوازی وەک خزمەتکردنی باخچەیەکی گشتی، کارکردن لەرێکخراوێکی مرۆیی بەسەر دەبن، هەم کار دەکەن و هەم کاتێکی بەسودیش بەسەردەبەن (وەرگێڕی کوردی).

٦-ژانوس یاخود ژانیۆس خوداوەندێکی ڕۆمییەکانە کە لێکۆڵیاران بەجۆرە دووفاقییەک تۆمەتباری دەکەن، چونکە دەیوست بەها دژیەکەکان تێکەڵاوی یەکتر بکات، تەنانەت وا لەمرۆڤ دەکات راست و ناراستیش ئاوێتەی یەکتر بکات تەنها لەپێناو ئەوەدا کە کارەکەی مەیسەر ببێت (و-ک).

7-Tuchman.

8-Cole, G.D.H.

9-Woodcock, G.

10-Irving, L,H, Grudlagen de politischen soziologie, 1975, s, 77f.

11-Lyon.

12-Bakuniin.

13-Malatest.

14-Sorel.

15-Kropotkin.

16-der utilitaristische anarchismus.

17-nostalgie.

18-Utopismus.

19-Diderot.

20-Godwin.

21-Saint Simon .

٢٢ - (Thomas Muntzer): لەدایکبووی (١٤٦٨) کە سەرەتا پەیرەوی لە لۆتەر دەکرد، پاشان لێی جیابۆوەو شوێن ئەنابابتیزم کەوت و بووە یەکێک لە ڕێبەرانی شەڕە گوندییەکان لە ئەڵمانیا. لێکۆڵیاران، ئەنابابتیزم بەجۆرە مەسیحیەتێکی کۆمۆنیزم پێناسی دەکەن. مونتزەر لەساڵی (١٤٩٠) لەسێدارەدرا.

٢٣ - (Sharies Fourier ١٧٧٢-١٨٣٧) یەکێکە لەبونیادنەرانی سۆشیالیزمی یۆتۆپیا (بەلایەنی کەمەوە لەڕوانگەی مارکس و ئەنگڵزەوە بیرکردنەوەیەکی یۆتۆپی بوو)، ناوبراو جەختی لەسەر کۆمۆنە سەربەخۆ و بچوکەکان دەکردەوە کە هیچ جۆرە ڕەهابوونێک پەسەند ناکات. بیروباوەڕەکانی ناوبراو کاریگەرییەکی زۆری

لەسەر ئەو بزووتنەوانە هەبوو کە جەختیان لەسەر هاریکاریی و بەشداری هەرەوەزیی دەکردەوە.

24-Reform.

25-gemeinschaft.

26-Formlos.

27-Tolmon, J.L. Politischer Massianismus, die romantische phase, koln/ opladen, 1963, s.11.

28-anarchosyndikalisten.

29-radikal.

30-Unionismus.

31-Tolmon, ebd, s, 156.

32-Der kollektivistische anarchismus.

33-poble.

34-lumpen proletariat.

35-nation state.

36-klassenkampf.

37-Der konspiratorische anarchismus.

٣٨-مەبەست لە پیلانگێڕی، پیلان و دەستکیسەیەکە دژ بەدەوڵەت بێت (نوسەر).

39-Massaryk, T,G. zur russischen Geschicts- und Religionsphilosophiem, 1913, s.372.

40-egoistc.

41-Massaryk, ebd,

42-Utopisten.

٤٣-هەربۆیەشە بەهەڵە فەلسەفەی ئەنارشیزم لەبیری ڕایگشتیدا بەهاوتەریب لەگەڵ بێسەروبەرەیی ناسراوە (نوسەر).

44-Der kommunistische anarchismus.

45-Erico Malatesta.

46-Sergej.

47-Stepniak.

48-Carlo Cafiero.

49-Die gesetze der historischen evolution.

50-saint simon.

51-rhetoric.

52-Malatesta, E, anarchismus, 8 aufl, Munchen, 1965, 8, 39.

٥٣ -لێرەدا بۆچوونی مالاتێستا لە بۆچوونی تیۆریستانی دیموکراسی دەستەبژێر، نزیک دەبێتەوە (نوسەر).

54-malatesta, ebd, s, 32.

55-Der individualistische anarchismus.

٥٦-شتاینەر كە ناوە رەسەنەكەی (Johann Kaspar Schmidt ١٨٠٦-١٨٥٦)ە، لە بەرلین لەژێر كاریگەری بیروباوەڕەكانی هیگڵ و فیۆرباخدا ئینتیمای بۆ چەپ پەیدا كرد. ئەو لە بونیادنەرانی ئەو قوتابخانەیەیە كە تاكەكەس دەخاتە چەقی سەرجەم بەهاكانەوە. (Solipismus) لەزمانی لایتینیدا بەمانای تەنهاو تاكەكەس دێت. بەپێی ئەم قوتابخانەیە، تاكەكەس تەنها بەئەزموونەكانییەوە خاوەنی هەقیقەتەو جیهانی دەرەوە تەنها وێناكانی ئەوە. ئەم بیرۆكەیە لەمۆدیلە توندەڕەوەكەیدا هەر لەلایەن شتاینەرەوە وەك قۆناغێكی فكریی سەربەخۆی ئەخلاقی- زانستی بونیادنرا كە یەكێكە لەتوندڕەوترین لقەكانی تاكگەرایی (نوسەر).

٥٧ -اندرو وینسنت: ایدئولوژی های مدرن سیاسی، ترجمه مترچی پاقب فر، تهران، ققنوس، ١٣٧٨، ص (١٧٦),

58-extrem personalistische ausrichtung.

59-extrem konsservatismus.

60-Jeremy Bentham.

61-Herbert spencer.

62-weltlichen aszetismus.

63-kapitalistische sparsinns.

64-Schuster, E.M, einheimscher amerikanische anarchismus, munchen- berlin, 1981, s, 39ff.

65-Greenem William Bradford, Equality (gleichheit), privatdruckm 1949, ss, 70-71 f.

66-der Pazifistische anarchismus.

67-Gandhi.

68-Funktion.

69-konsens.

70-jack, H, A, the wit and wisdom of Gandhi, in: lrvong louis, grundlagen der politischen spziologie, Freiburg, 1975, s121, f..

71-tolstois.

72-Masaryk. T.g. ebd, s.186.

73-konsens.

### سەرچاوە:

دكتر ملک یحیی صلاحی، اندیشەهای سیاسی غرب در قرن بیستم. چاپ اول، ١٣٨١، ص (١٥١-١٦٨)

# ئایا دیکارت ژەهرخوارد کرا؟

**هاشم ساڵح**
**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع**

دانەری ئەم کتێبە مێژونوس‌و فەیلەسوفی فەرەنسی «جان مارک فارۆ»یە، کە ئەندامی ئەکادیمیای زانستی ئەخلاق‌و سیاسەتە لە پاریس، هەروەها دادوەرێکی گەورەیەو شارەزای کێشە گەورەکانە. ئەو لێرەدا وێنەیەکی گشتی‌و ورد، دەربارەی ژیانی یەکێک لە گەورەترین فەیلەسوفەکان، بەدرێژایی هەموو سەدەکان، پێشکەش دەکات. «دیکارت» بە درێژایی مێژوی فەلسەفە، بەیەکێک لەو ١٠ کەسە مەزنەی مێژوی فەلسەفە حسابدەکرێت، واتە «ئەفلاتون، ئەرستۆ، دیکارت، سپینۆزا، جان جاک ڕۆسۆ، کانت، هیگڵ، نیتچە، فرۆید، هایدگەر»، بێگومان فەیلەسوفانی زۆر گرنگی دیکەش هەیەو نابێت بەرهەمەکانیان لەبەرچاو نەگرین.

دانەری کتێبەکە سەرەتا فیکرەیەکمان لەسەر ژیانی «دیکارت» پێدەدات، «دیکارت» لە ٣١ ئازاری ساڵی ١٥٩٦، لە شارێکی بچکۆلانە کە پێیدەوترا (لاهی) لەدایکبووە، بەڵام هەنوکە ئەو شارە پێیدەوترێت دیکارت، بە خۆشی ڕۆڵە جوامێرەکەیەوە کە وایکرد ئەم شارە بچوکە لە سەرتاپای جیهان ناوبانگ دەربکات. بەپێی ئەو دابەشکردنەی لە کۆمەڵگای فەرەنسی سەردەمی کۆندا لەئارادابوو، «دیکارت» سەر بە خێزانێکی خانەدانی بچوک بوو. ئەمە مانای ئەوەیە «دیکارت» سەر بە چینێک بوو، دەکەوتە سەرەوەی ئاستی میللەت، بەڵام ناگاتە ئاستی چینی خانەدانە گەورەکان کە خاوەنی سەروەت و سامانێکی فراوان بوون‌و حوکمی فەرەنسایان دەکرد.

«دیکارت» دوای ئەوەی لە شاری (بواتیە) کە پایتەختی ئەو ناوچەیە بووە- دواتر «میشێل فۆکۆ»ش هەر لەو ناوچەیەدا پێدەگات- خوێندنی ئەکادیمی تەواودەکات، بڕیاردەدات خۆی بۆ گەڕان

بە دوای حەقیقەتدا تەرخان بکاتو وەک مامۆستا ئیش نەکات، بەڵکو وەک بیرمەندێکی ئازادو گەڕۆک ئیش بکات. لە ڕاستیدا «دیکارت» بڕێکی زۆر پارەی لە باوکییەوە بۆ جێمابوو، بۆیە پێویستی بە ئیش نەبوو، تاکو بژێوی ژیانی دابین بکات. ئەمەش یارمەتیدا هیواو خولیاکانی لە بەدەستهێنانی زانستو مەعریفەی فراواندا بەدیبێنێت. بەم شێوەیە «دیکارت» وەک خۆی دەڵێ لە کتێبە گەورەکەی جیهان، بڕیاردەدا خۆی بۆ زانستو فەلسەفەو گەڕان بەشوێن حەقیقەتدا تەرخان بکات. ئەو جیهانی وەک کتێبێک دەبینی لەبەردەمیدا کراوەیەو ڕاخراوەو چاوەڕوانی یەکێکە بیخوێنێتەوە: واتە یەکێک بێتو سیمبولو ڕەمزو نهێنییەکانی شیبکاتەوە.

«دیکارت» لە شەوی ١٠ تشرینی دووەمی ساڵی ١٦١٩، ڕێگای خۆی لە ژیاندا دەدۆزێتەوە، ئەمەش دوای ئەوەی سێ خەونی ترسناک دەبینێت کە هەژاندنێکی گەورە دەیهەژێننو زۆری نامێنێت عەقڵی لەدەستبدات. دەڵێن لەو شەوەدا وەحی بۆ هاتووەتە خوارەوە. بەم شێوەیە ئەو نەهامەتیە تێدەپەڕێنێتو بۆ یەکەمجار دەگات بە حەقیقەت، ئەویش لە ڕێگەی دۆزینەوەی زانستێکی نایاب کە زانستی بیرکارییە. ئیدی لەو ساتەوەختەوە «دیکارت» هەستدەکات هەموو تەمەنی بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتە فەلسەفییە تازەکانو نەهێشتنی وەهمو هەڵە تایبەتەکانی فەلسەفەی کۆن، تەرخان دەکات. واتە فەلسەی سەدەکانی ناوەڕاست کە تێکەڵێک بوو لە تیۆلۆژیای مەسیحیو فەلسەفەی ئەرستۆ. بەم مانایە «دیکارت» لە مێژوی فیکردا، دابڕانێکی گەورەیە.

«دیکارت» بۆ ئەوەی بەم کودەتا مەعریفیە گەورەیە هەستێت، ناچار بوو فەرەنسا جێبێڵێت، چونکە ئەو سەردەمە فەرەنسا، فەرەنسایەکی فێندەمێنیتالیزمی دەمارگیرو ستەمکار بووەو پڕ بووە لە داگاکانی پشکنین. ئیدی لە سەرەتای ساڵی ١٦٢٨، واتە ئەو کاتەی تەمەنی ٣٢ ساڵ بووە، دەڕوات بۆ هۆڵەندەی لیبرالو تێیدا نیشتەجێ دەبێت. لەوێ بەشی زۆری کتێبە سەرەکییەکانی، ئەگەر نەڵێن هەموو کتێبەکان، دەنوسێ. ئاشکرایە هۆڵەندە لەو کاتوساتەدا، لە هەموو وڵاتانی دیکەی ئەورووپا زیاتر ئازادی تێیدا بەرقەراربووە، لەگەڵ ئینگلتەرە. هەروەها لە هەموان زیاتر فیکرە تازەکانی وەرگرتووە، جگە لەوە لەلایەنی لێبوردەیی ئاینییەوە، لە هەموان کراوەتربووە، بۆ نمونە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ فەرەنسا، ئیسپانیا، ئیتالیا..هتد. بەڵام فێندەمێنتیالیستەکان تەنانەت لەوێش کەوتنە دوای «دیکارت»و هەڕەشەیان لێکرد، ئەگەر هەوڵو کۆششی باڵیۆزی فەرەنسا نەبوایە، لەوانەبوو ئازاری بدەن.

«دیکارت» حەزی دەکرد لە قەراخی شارەکاندا نیشتەجێ ببێت، نەک لەناو شارەکاندا. لە ڕاستیدا ئەو خانووەکەی لە نزیک سروشتو کێڵگەکانەوە هەڵدەبژارد، تاکو چێژ لە تەنهاییو دورەپەرێزی وەربگرێتو خۆی بۆ تێڕامانو بیرکردنەوەو گەشتی درێژخایەن تەرخان بکات. ئەگەر خەڵکی هەستیان پێبکردایەو بیانزانیایە ئەوە «دیکارت»ە، ئەوا زوو زوو خانووەکەی دەگۆڕی. چونکە ئەوکات هەستی بە ئازادی نەدەکرد، بۆیە دەیگواستەوە بۆ شوێنێکی دیکەو خانوویەکی دیکە کە لانی کەم لە سەرەتادا هیچ کەس نەیناسێت. وەلێ هەر هێندەی خەڵکی دەیانزانی ئەوە فەیلەسوفی بەناوبانگ «دیکارت»ە، بێزاردەبوو، بیریدەکردەوە بەرەو شوێنێکی دیکە ڕابکات، ئیدی بەم شێوەیە. لێرەوە

ئەو هەستی دەکرد خەڵکی بێزاری دەکەن یاخود دەستدرێژی دەکەنە سەر تەنهاییو دوورەپەرێزیو تێڕامانەکانی، یاخود لەوانەیە لە تیرۆرکردن ترسابێت.

لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٦٤٩، شاژنی سوید «کریستین» داوای لێدەکات لە ستۆکهۆڵمی پایتەخت، سەردانی بکات. «دیکارت» دوودڵ بوو لەوەی داواکەی شاژن جێبەجێ بکات، چونکە ئەو لە هۆڵەندە خۆشحاڵ بووەو لە سەرماو سۆڵەی باکوریش ترساوە. بەڵام باڵیۆزی فەرەنسا لە هۆڵەندە، داوای لێدەکات ئارەزووەکەی شاژنی سوید بێنێتەدی. ئاشکرایە شاژنی سوید بانگی نەدەکرد، ئەگەر ئەو ناوبانگە گەورەیەی «دیکارت» نەبوایە کە لە ئاسۆدا دەنگیدابووەوەو ببووە ئەفسانەیەک. دواتر «دیکارت» دەڕوات بۆ ئەوێ، تاکو لە ١١ شوباتی ساڵی ١٦٥٠ لە سەرمادا کۆچی دوایی دەکات.

فەیلەسوفی ئەڵمانی «لایبنتز» جوانترین لاواندنەوە لاواندویەتییەوە، کاتێ دەڵێ: (دەمەێ جەخت لەوەبکەم بە مردنی ڕێنیە دیکارت، ڕەگەزی مرۆڤایەتی زیانێکی گەورەی لێکەوت، زیانێک ناتوانێت بە ئاسانی تێیدا هەستێتەوەو زەحمەتە قەرەبوی بکرێتەوە).

ئەم لاواندنەوەیە کە لە فەیلەسوفێکی گەورەوە دێت، نیشانەی ئەوەیە «دیکارت» چەند گرنگو بایەخدارە بۆ تەواوی مێژوی فیکری مرۆڤایەتی، نەک تەنها بۆ ئەوروپا. لە ڕاستیدا «دیکارت» لە مێژودا یەکەم فەیلەسوفی مۆدێرنە لەژێر پاڵتۆکەی ئەوەوە هەموو فەلسەفەی مۆدرێن هاتووەتە دەرەوە. «دیکارت» لە ساڵی ١٦٣٧ لە شاری (لایدن)ی هۆڵەندە، کتبێکی قەبەی بە ناونیشانی (نامەیەک دەربارەی پێکهاتنی جیهانو تیشک) بڵاودەکاتەوە. ئەم کتێبەی ئەو وتارانەی لەخۆگرتبوو کە دەربارەی بابەتگەلێکی زۆری وەک نەیزەکو ئەستێرەی کلکدارو زانستی ڕوناکیو بینینو زانستی ئەندازە نوسیبونی. پێشەکی کتێبەکەی وتارە بەناوبانگەکەی بوو دەربارەی میتۆد. ئەمە ناونیشانی تەواوی وتارەکەیەتی: (وتارێک دەربارەی میتۆد لەپێناو بەرکارهێنانی عەقڵ بە شێوەیەکی باشو گەڕان بە دوای حەقیقەتدا لە بواری زانستدا). بەم شێوەیە «دیکارت» میتۆدی عەقڵانی بۆ ڕۆژئاوا گەڵاڵەکردو وایکرد ڕۆژئاوا سەرکەوێت بەسەر تەواوی میللەتانی سەر زەویدا.

یەکەم کتێب کە بە زمانی گشتی بڵاویکردەوە، واتە بە زمانی فەرەنسی، واژۆی خۆی لەسەر نەبوو، لە ترسی دادگاکانی پشکنینو ڕاوەدونانی لەلایەن کڵێساو فێندەمێنتالستەکانەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی ئاگاداربوو چیان لە «گالیلۆ»کردبوو. لەو سەردەمەدا زمانی فەرەنسی بە بەراورد لەگەڵ زمانی لاتینی، زمانێکی نەخوازراوبوو، ئەوکات زمانی لاتینی زمانی ئاینو زانستو ئەدەبو فیکر بووە. «دیکارت» لەم کتێبەیدا، بەشێوەیەکی زانستی باس لە چۆنیەتی دروستبونی دیاردە سروشتییەکانی وەک باران، هەور، پەلکەزێڕینە.. دەکات، هەروەها باس لە یاساکانی تیشکدانەوەی ڕوناکی دەکات. جگە لەوانە داهێنانە مەزنەکەی: زانستی ئەندازەیی شیکاری. (لەم بارەیەوە بڕوانە کتێبی حمد الراشد، کە ئەندامێکی بازنەی فەلسەفەیە لە سعودییەو کتێبەکەی بە ناونیشانی: ڕێنیە دیکارت.. زاناو فەیلەسوفی سەدەکانی مۆدێرنە. ریاز ٢٠٠٨).

ئاشکرایە پێش «دیکارت»، بۆ لێکدانەوەو چۆنیەتی دروستبونی دیاردەکانی سروشت، تیۆرە غەیبییەکان یان میتافیزیکیەکان باوبوون. بەڵام «دیکارت» هاتو ئەو تیۆرانەی هەڵوەشاندەوەو تیۆرە

زانستییەکانی خستە جێگەیان، کە پشت بە بنەمای تاقیکردنەوەی هەستپێکراوو بینراو دەبەستن. ئەمەش یەکەم هەنگاوی گەورەبوو بە ئاراستەی مۆدێرنە. مەبەستمان لەوە دانانی لێکدانەوەی عەقڵانیەتی ڕێژەییە بۆ دیاردەکانی سروشت، لە شوێنی لێکدانەوەی غەیبییانەی پیاوانی ئاینی.

«دیکارت» لە ساڵی ١٦٤١ یەکێک لە گرنگترین کتێبی لە مێژوی فەلسەفەدا بڵاوکردەوە، ئەویش کتێبی (تێڕامانە میتافیزیکییەکان) بوو، ئەو لەم کتێبەدا قسە لەسەر شتی زانستی ناکات، بەڵکو قسە لەسەر شتی فەلسەفی ڕووت دەکات، وەلێ «دیکارت» کتێبەکەی بە لاتینی نوسیبوو، چونکە کتێبەکەی ئاراستەی زاناو گەورە شارەزایانی سەردەمەکەی خۆی کردبوو، نەک تەواوی میللەت. ئاشکرایە ئەو کات زمانی رۆشنبیری لە هەموو ئەوروپادا، زمانی لاتینی بوو. بەڵام ئێستا زمانی لاتینی بووەتە زمانێکی مردو، تەنها ژمارەیەکی کەم دەیزانن. لە ڕاستیدا ئەو کتێبەی «دیکارت» پرنسیپە سەرەکییەکانی فەلسەفەی «دیکارت» لەخۆدەگرێت، بایەخو گرنگییە گەورەکەی لێرەوەیەو هیچ کتێبێک شان لە شانی نادات، تەنها کتێبی (ڕەخنە لە عەقڵی پەتی) کانت یان (فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح)ی هیگڵ نەبێت.

مەبەستی «دیکارت» لە نوسینی ئەو کتێبە، بەرپەچدانەوەی زانا تیۆلۆژییە مەسیحییەکان بوو، کە لەو سەردەمەدا کۆنترۆڵی عەقڵیەتی دەستەجەمی گەلانی مەسیحیان کردبوو. «دیکارت» پێش ئەوەی کتێبەکەی بڵاوبکاتەوە، ناردی بۆ کۆمەڵێ بیرمەندی گەورە، لەوانە فەیلەسوفی ئینگلیز «هۆبز»و چەند کەسێکی دیکە. ئەوانیش بیروڕای خۆیان لەسەر کتێبەکە دەربڕیو خاڵە هاوبەشو خاڵە ناکۆکەکانیان بۆ دەستنیشان کرد، «دیکارت» دوای ئەوەی وەڵامیدانەوە، لە کۆتایی کتێبەکەدا ڕەخنەکانی ئەوانی بڵاوکردەوە. بەمەش سەلماندی ئەو کەسێکی بابەتییە، بگرە کەسێکی دیموکراتخوازە، ئەو بەوپەڕی سنگفراوانییەوە ڕای جیاواز قبوڵدەکات. ئەو لە بورای فەلسەفەدا، بڕوای بە گفتوگۆی دیموکراسیانە هەیە، واتە مشتومڕی نێوان بیروڕاو بیروڕای دژ، ئەمەش یەکەم هەنگاوە بە ئاراستەی دیموکراسی.

لێرەوە دیموکراسی بەبێ فەلسەفە بوونی نییە، چونکە فەلسەفە لەڕێگەی گفتوگۆو بیروڕا گۆڕینەوەوە، بڕوای بە پێشکەوتنە، نەک لە ڕێگەی لێدان یان تەکفیرو تیرۆرەوە. فەلسەفە پێوانییە فیکرو بیروڕاکانی بێخەوشو مەعسومن، بەڵکو پێیوایە ئەو فیکرو بیروڕایانە کاتینو بەردەوام شایەنی ڕاستکردنەوەو هەمواركردنن. لەبەر ئەم هۆیە، ئەو کۆمەڵگایانەی تێدا تیۆلۆژیای سیاسەتو فێندەمێنیتالیستەکان باڵادەستن، نابنە کۆمەڵگایەکی دیموکراتی، ئەویش لەبەر هۆکارێکی زۆر سادە کە ئەمەیە: ئەو فیکرو بیروڕاو بڕوایانەی لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا باڵادەستن، بریتین لە کۆمەڵێ یەقینی ڕەها کە قابیلی گفتوگۆ نین.

دواتر لە ساڵی ١٦٦٦ ئەو کتێبەی «دیکارت» دەخرێتە ناو لیستی کتێبە قەدەغەکراوەکانەوە، واتە دوای مردنی بە ١٦ ساڵ، ئەمەش مانای فەتوایەکی تیۆلۆژی دەگەیاند بە قەدەغەکردنی خوێندنەوەی کتێبەکانی بۆ جەماوەری مەسیحی کە ملکەچی ڕێنماییەکانی ڤاتیکان بوون. بگرە لە سەرەتای ساڵی ١٦٤٠، واتە پێش مردنی بە ١٠ ساڵ، یسوعییەکان، واتە برایانی مەسیحی توندڕەو، خوێندنی

کتێبەکانی «دیکارت»یان لە قوتابخانەو زانکۆکاندا قەدەغەکرد. بەڵام کتێبەکانی لە سەدەی دواترو پاش ئەوەی عەقڵەکان ڕوناکبونەوەو توانیان لێی تێبگەن، کۆنترۆڵی فیکریان کرد. ئیدی ئەوکات بە پێی دەربڕینێکی بەناوبانگی هیگڵ، «دیکارت» دەبێتە پاڵەوانێکی جوامێری فیکر.

بەڵام ئەوەی لەم کتێبەی بەردەستماندا (دیکارت، سوراچاکێکی فەرەنسی) جێگای سەرسوڕمانە، ئەوەیە وێنەیەکی دیکەی (نەناسراو)مان، سەبارەت بە یەکەمین فەیلەسوفی فەرەنسییەکان، پێشکەش دەکات. لەم کتێبەوە تێدەگەین «دیکارت» وەک چۆن لە بواری فیکردا سەرکێشی کردووە، ئەوا بە هەمان شێوە لە بواری ژیانیشدا سەرکێش بووە. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا کەسێکی ئازاو جوامێر بووەو شایەنی دەربڕینەکەی هیگڵە. ئاشکرایە «دیکارت» پێش ئەوەی خۆی بۆ فیکرو فەلسەفە تەرخان بکات، شمشێری هەڵگرتووەو بەشداری لە جەنگەکاندا کردووە. تەنانەت جارێک لە جارەکانو لەکاتی تێپەڕینی بە دەریادا، یەکێک لە سواربوانی کەشتییە، کە ڕوخساری «دیکارت» دەبینێت لە پیاوێکی خانەدانو دەوڵەمەند دەچێت، دەیەوێت ڕوتیبکاتەوەو پارەکانی لێ بسێنێت. «دیکارت» حەماسەت دەیگرێتو داوای لێدەکات شەڕە شمشێر بکەن، ئیدی دزەکە پاشەکشە دەکاتو دووردەکەوێتەوە.

بەڵام لەم کتێبەدا ئەو شتەی زۆر مەترسیدارە، ئەوەیە دانەری کتێبەکە پێیوایە «دیکارت» بەهۆی سەرماوسۆڵەوە نەمردووە، وەک ئەوەی چەندین سەدەیە باسدەکرێت، بەڵکو کوژراوە. لە ڕاستیدا ئەم گریمانەیە، مامۆستایەکی زانکۆی ئەڵمانی کە ناوی «تیۆدۆر ئایبیرت»ە، لە کتێبێکدا بەناوی (مردنە نهێنییە ئاڵۆزەکەی ڕێنیە دیکارت)جەختی لەسەر کردووەتەوەو هەرایەکی گەورەی لێکەوتەوە. ئەم کتێبە جارێ وەرنەگێڕدراوە بۆ فەرەنسی، پوختەی ئەو گریمانە ئەمەیە: قەشە «فرانسوا فیوکیە» کە قەشەیەکی کاسۆلیکی فەرەنسی بووە، بە فەرمانی ڤاتیکان یان ڕاستتر بەبێ فەرمانی ڤاتیکان، «دیکارت»ی کوشتووە. بۆچی؟ چونکە پێیوابوو فەلسەفەکەی «دیکارت» ڕێگرە لەبەردەم ئەوەی شاژنی سوید «کریستین» بێتە سەر مەزهەبی کاسۆلیکی ڕۆمانی. ئاشکرایە شاژن پرۆتستانتیەکی لۆسەری بووە، واتە سەر بە مەزهەبە نەیارەکەی کاسۆلیک بووە. ئەم قەشەیە لەوە ترساوە «دیکارت»و بیروڕا تێکدەرانەکەی بۆ ئاین کە پێچەوانەی عەقیدەی کاسۆلیکیە، کاریگەری خراپی لەسەر شاژن هەبێت.

لەو سەردەمەدا ئەوروپا نوقمی جەنگی مەزهەبی ببوو، ئەم قەشەیە دوای ئەوەی ژەهر دەکاتە ناو قوربانی پیرۆز، پێشکەشی «دیکارت»ی دەکات. بەڵگەی ڕاستی ئەم چیرۆکە، وەک ئەوەی دانەری کتێبەکە دەڵێت ئەوەیە: «دیکارت» پێش ئەوەی بمرێت، سەری گێژی خواردووە، لەگەڵ ئازارێکی ترسناک لە گەدەیداو ڕشانەوەی بەردەوامو میزەکەشی خوێنی پێوەبووە، هەمو ئەو نیشانانەش تایبەتن بە ژەهراویبوون نەک بە هەوکردنی سیيەکان کە لە ئەنجامی سەرمای سەختی ستۆکهۆڵمەوە توشی هاتبوو. هەروەها بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەم گریمانەیە ئەوەیە شاژنە «کریستین» دوای مردنی «دیکارت» بە چوار ساڵ، وازی لە مەزهەبەکەی خۆیهێناو لەسەر عەرشی پاشایەتی هاتەخوارەوەو چووە سەر مەزهەبی کاسۆلیکی پاپاویەت.

دواجار نابێت ئەم گریمانەیە بە هەند وەرنەگرین. لە واقیعدا بەشی زۆری کەسایەتییە گەورەکانی مێژو، بەشێوەیەک لە شێوەکان ڕوبەڕووی تیرۆر بونەتەوە. بەدرێژایی مێژو بلیمەتەکان وەک کەسێکی شاز یان وەک هەڵەیەک لە هەڵەکانی ڕۆژگار، تەماشاکراون. بۆیە بارودۆخ لە دژیان هەڵدەگەڕێتەوەو هەوڵدەدرێ بەشێوەیەک لە شێوەکان لەناویانبەرن. ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی بەلای بەشێکی زۆری خەڵکەوە، بوونی ئەوانە لەسەر گۆی زەوی، جۆرێکە لە ئیستفزازکردن. ئەو بلیمەتانە پێش ڕۆژگار دەکەون یان لە سەدەو سەردەمەکەی خۆیان گەورەترن. تەنها سەرخۆشیمان لە «دیکارت» ئەوەیە، ئەوان نەیانتوانی دەستیان پێیبگات یان لەناوییبەرن، تەنها دوای نوسینی کتێبە سەرەکییەکانی نەبێتو دوای ئەوەی وەشاندنە فەلسەفییە گەورەکەی خۆی وەشاند.

**سەرچاوە:**

الشرق الاوسط، ٢٥ نیسان، ٢٠١٠، ژمارە ١١٤٧١

# دڵ، رۆح و دیمۆکراسی رادیکاڵ

لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

ئێستا جەنگی سارد کۆتایی هاتووە و خەڵک لە دۆخێکدان ئاسانتر و روونتر دەتوانن لە ئەو دەورەی مارکسیزم دەتوانن لە سیاسەتڕێژی رادیکاڵدا هەیبێ رابمێنن و قسەی لە سەر بکەن. بۆ وێنە دوو گۆڤاری فاینینشاڵ تایمز و سۆشیالیست ریجێستێر دەستیان داوەتە خوێندنەوەی دووبارەی مارکس. بەڕای ئێوە ئەو کەم و کوورییانەی بوون بە هۆی لاوازی مارکسیزم چین و ئاخۆ مارکسیزم هێشتا کارامەیە؟

**ئەرنێستۆ لاک لائۆ:**

یەکێک لە کەموکورتییەکانی مارکسیزمی تەقلیدی ئەم گومانەیە کە خەباتی چینایەتی زاڵە بەسەر داینەمۆ و بزۆزیی ژیانی کۆمەڵایەتییدا. ئەگەر چاو لە مێژووی سۆسیالیزم بکەین دەبینین بزوتنەوە سیاسییە رادیکاڵەکان بە کردەوە تەنها لە پێوەندی لەگەڵ خەباتە جۆراوجۆرەکان، نەتەوەیی و دژە ئێمپریالیستی، مافی هاوڵاتیی و کۆمەڵایەتی، شان بە شانی خەباتی کرێکاری هاتوونەتە مەیدان. ئێمە هەوڵمان ئەوە بووە تیۆرەیەک پێشکەش بکەین(کە هێشتا پشت بەستووە بە مارکسیزم)، ئەم تیۆرەی کە بزووتنەوە سیاسییەکان چۆن بەربڵاو دەبنەوە و خەڵک جۆش دەدەن و لە چ رێگایەکەوە دەبن بە هۆی گۆڕان لە کۆمەڵگادا، بێئەوەی تووشی هەڵسەنگاندنی بە پەلە بین دەربارەی وردەکاریەکانی دۆخ و سروشتی بزووتنەوە سیاسییەکان. ئەم کارە دەبوایە ئاسۆی بینینی

ئێمەی رادیکاڵ فراوانتر بکات و رێگەی ئەوەمان بۆ بکاتەوە بەربڵاویی گۆڕانە سیاسییە چاوەڕوان کراوەکان ببینین.

***شانتاڵ مووفە:***

لە رابردوودا گەلاڵەو هەڵهێنجانی بەرچاوتەنگانە لە ستەم و بەرەنگاری ببوو بە هۆی بەرتەسک بوونی سیاسەتی سۆسیالیستی. ئێمە لەو رووەوە هەوڵماندا تیۆرکەمان گەشە پێبدەین کە هەستمان کرد ئایدیا تەقلیدیە سوسیالیستیەکان لە تێگەیشتن و دەرککردنی ئەو شتەی کە پێی دەوترێ بزووتنەوە کۆمەلآیەتییە نوێیەکان دواکەوتوون، وەک بزووتنەوەی فیمنیستی، بزووتنەوەی دژە ئاپارتاید و بزووتنەوەی پاراستنی ژینگە. بزووتنەوەی سۆسیالیستی هەوڵیداوە ئەم بزووتنەوانە لە سەرچەشنی خەباتی چینایەتیدا بتوێنێتەوە، لەباتی ئەوەی رێز بگرێ لەم جۆرە تەواو جیاوازانەی بەرەنگاری کە بەرهەمی ستەمە جیاوازەکانن. ئێمە ئەو بۆچوونە مارکسیستییەمان بەلاوە پەسەندە کە لای وایە ناکۆکی هۆکاری جووڵەی کۆمەڵگایە. بەلآم لە هەمانکاتدا لامان وابوو مارکسیزمی تەقلیدی هێند کراوە نییە بتوانێ ئەم جۆرە جیاوازانەی خەبات لە خۆیدا بگونجێنێ. هەندێ جۆری ناکۆکی هەن کە ناکرێ بە تەواوەتی بڵێین بەرهەمی سیستەمی سەرمایەدارین و لەم چوارچێوەدا لێیان بگەین. بۆ وێنە ئەو کاتەی فێمنیستە سۆسیالیستەکان باس لەوە دەکەن ناکرێ هەلآواردنی جنسی تەنها بە بەرئەنجامی بۆرژوازی بزانین و پرسەکە دابەزێنین بۆ ئەم ئاستە. بۆرژوازی سەرچاوەی هەلآواردنی جنسی نییە. ناکرێ بە گۆڕان و تەنانەت بە نەهێشتنی سیستەمی سەرمایەداری کۆتایی بە هەلآواردنی جنسی بێنین.

***ئەرنێستۆ لاک لائۆ:***

وەکی تر بۆرژوازی جگە لە چەوساندنەوەی زەحمەتکێشان، بووە بە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێک ناکۆکی دیکە. بۆ وێنە دەکرێ خەڵک جۆش بدەین دژ بە کارگەیەک کە بووە بە هۆی پیس بوونی هەوا. ئەمە خەباتێکی دژە بۆرژوازییە، چونکە سیستەمی سەرمایەداری ئەم کارگەیەی سازکردوە کە بووە بەهۆی پیس بوونی هەوا. بەلآم لە هەمانکاتدا، کرێکارانی ئەم کارگەیە بەشداری لەم خەباتەدا ناکەن، ئەوان لە تەنیشت خاوەنکارەکانیاندا دژ بە خەڵکی مۆبیلیزەکراو دەوەستنەوە بۆ ئەوەی شوێنی کارەکەیان بپارێزن.

**پ: ئەم راستییە چ ئەنجامێکی دەبێت بۆ ستراتیژی سیاسی؟**

***ئەرنێستۆ لاک لائۆ:*** فرەجۆری شێوەکانی ستەم لەم رەوتەدا کە دەبێتە هۆی جۆشدان و مۆبیلزەبوونی خەڵک، نەرم دەبێتەوە. شوناس و خەباتی هەرکام لەم هێزانە بە گۆڕانی جۆری پەیوەندییەکەی لەگەڵ هێزەکانی تر دەگۆڕێ. ئانتۆنیۆ گرامشی دەستی داوەتە تیۆریزەکردنی ئەم

ڕەوتە. گرامشـــی لەســـەر ئەو باوەڕەیە کە سرِی سەرکەوتنی حیزبی کۆمۆنیســـتی ئیتالیا لەوەدایە پێوەنـــدی لەنێوان بزووتنەوەی کرێکاری و دیکەی بزووتنـــەوە دیمۆکراتیکەکانی کۆمەڵگا، بۆ وێنە بزووتنەوەی پەرەسەندنی سەندیکا فێرکارییەکان و خەباتی دژە مافیاییدا ساز بکات. ئەم پێوەندییە یەکگرتنێکی تاکتیکییە. ئەوان دەبایە گەشـــەی زانیاری سیاسیش لەبەرچاو بگرن، واتە بەشدارانی بزووتنەوەیەک وشـــیار بن، بەدیهاتنی خواســـتەکانیان بەبێ لەبەرچاوگرتنی خواستی گرووپەکانی دیکـــە شـــتێکی نەکردەیە. ئەنجام ئەوەی کە کـــێ داوای «عەدالەت»بکات لەگـــەڵ کۆمۆنیزم هاوڕا دەبێت. بنچینەی گەلاڵەی هێژمۆنی گرامشی ئیرادەی گشتییە.

***شانتاڵ مووفە:*** ئێمە پێوەندی نێوان خەباتە جۆراوجۆرەکان لە پەیوەندییەکی هێژمۆنێکدا وەک عەڵقەی هاونرخی زنجیرەیەک دەبینین. ئێمە وشەی هاونرخ بۆ ناسینەوەی سەرجەم جۆرەکانی ستەم بەکاردەهێنیـــن. پەیوەندییەکی هێژمۆنێک ناتوانێ تەنهـــا بەیەک بزووتنەوە کە هەموو خەباتەکانی تری لە خۆیدا تواندۆتەوە شـــێوەگیر ببێت. ئەم مەترســـییە زۆرجار لە مێژوودا رووی داوە. حیزبی کرێـــکار لـــە بەریتانیا زۆر جار هەوڵی داوە بزووتنەوەی ژنان لە خۆیـــدا بتوێنێتەوە، بەڵام ژنان بە دروســـتی جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکەنەوە کە داد نادات کە ژنان ببن بە بەشێک لە خواستەکانی بزووتنەوەی کرێکاری. تەنها ئـــەو کاتە فێمنیزم دەتوانێ پێوەندی هەبێت لەگەڵ حیزبی کرێکاری بەریتانیا، کە حیزبی کرێکار بونیادە حیزبی و دامەزراوەییەکەی بگۆڕێ و زمان و کولتوورێکی دیکە هەڵبژێرێ.

**پ: ئێوە ئەم هێزانەی کە دژ بە هێژمۆنی رادیکاڵ دەوەستنەوە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟**

***ئەرنێستۆ لاک لائۆ:*** ئێمە جیاوازی لە نێوان لۆژیکی هاوسەنگی (کە لە شێوەگیریی هێژمۆنیدا بەکار دەبرێ) و لۆژیکی دژایەتیدا دەکەین. گوتاری چارتیستەکان لە بەرتیانیا گوتاری هاوسەنگییە، چونکە خواســـتە جیاوازییەکانیان بە هاونرخ دەزانن، بۆ وێنە ئـــازادی ئابووری، ئازادی راگەیاندن، کۆماریخوازی و جۆرەکانی تری خەبات هەمووان پاژێک بوون لە گشـــتێک کە شوناســـی گشـــتییان پێک دەهێنا. رێگای لاوازکردنی هێژمۆنی ئەوەیە دژ بە هێژمۆنی بوەســـتیتەوە، واتە جیاوازی دانێی لە نێوانی هەرکام لەم خەباتانەدا. دیســـرائێلی*ئەم کارەی لە رێگای ئایدیای «نەتەوەیەکە»وە کرد. دیســـرائێلی بە تواندنەوە و جیاوازی دانان لە نێوان خواســـتەکاندا بەو ئەنجامە گەیشـــت. بۆ وێنە خواستی خانووی بە خواستێکی رەسمی و گونجاو زانی، ئەم خواستەی لە کۆماریخوازی جیاکردەوەو لکاندی بە دەوڵەتەوە. دامەزراوەیەکی دەوڵەتی دەبوا کاری ئەوە بوایە بپەرژێتە سەر پرسی خانوو و ئاپۆرەی خەڵک دەبێ لەوە بگەن ئەوان لە سێبەری مەلیکە ڤیکتۆریادا و بە هۆی خێر و بەرەکەتی ئـــەوەوە بوون بـــە خاوەن خانوو نەک بە بەدیهاتنی ماف و خواســـتێکی دیمۆکراتیک کە بە ماف و خواستەکانی ترەوە گرێدراوە. لە سەدەی بیستەمدا دەوڵەتی خۆشگوزەرانی بە جیاکردنەوەی بیمەی

کۆمەڵایەتی، خانەنشینی، فێرکاری و هتد، لەو هەوڵە رادێکاڵانەی کە بۆ گۆڕان لە بونیادی دەوڵەت و ئابووریدا دەدران، ئەم رەوەتەی پەرەدا.

**ئێوە ئەگەر خەباتی چینایەتی لە پێشدا دانانێن، ئامانجی سیاسەتی چەپ بە چی دەزانن؟**

***شانتاڵ مووفە:*** ئێمە پرۆژەی چەپ وەک رادیکاڵیزەکردنی دیمۆکراسی پێناسە دەکەین. ئەم بابەتە دەتوانێت هەموو خەباتێک دژ بە پێوەندی دەسەڵات بگرێتەوە، بەڵام لە خەبات بۆ پاراستنی شوێنی کاردا ناوەستێ. لێرەدا دابڕانێک هەیە لە مارکسیزم، چونکە بنەمای رێکخستنی ئەم پرۆژەیە لەسەر ئامانجە دیمۆکراتیکەکانی یەکسانی و ئازادی بۆ هەموان دارێژراوە، ئەو ئامانجخوازییەی کە بەشێکە لە گوتاری بەشێکی زۆر لە هێزەکانی کۆمەڵگای بۆرژوازی مۆدێرن. ئێمە ئایدیای دابڕانی رادیکاڵ لە کۆمەڵگای پێشتر- ئایدیای شۆڕش- مان واز لێهێناوە. ئێمە دەستمان کردوە بەوەی سیاسەتی خۆمان وەک رادیکاڵیزەکردنی ئەو ئایدیا و بەهایانەی لەبەردەستدا بوون و لە بۆرژوازی لیبراڵدا بەدی نەهاتوون لێکبدەینەوە. من لام وایە هیچ شتێ رادیکاڵتر لە خواستی ئازادی و یەکسانی بۆ هەمووان نییە. کێشە لەوەدایە ئەم خواستانە لەو کۆمەڵگایانەدا کە بانگەشەی بۆ دەکەن بەدی نەهاتووە. پرۆژەی چەپ لەسەریەتی گوشار بخاتە سەر ئەم کۆمەڵگایانە کە ئەم ئایدیایانە بەدیبێنن.

**پ: ئەم سیاسەتەی چەپ ئەوەندە کراوەیە کە دەتوانێ هەرچەشنە خەباتێک دژ بە سیستەمی زاڵ، نەک تەنها ئەو خەباتەی کە پێی دەڵێین پێشەنگ و یەکسانیخواز لەخۆ بگرێت. چۆن دەکرێ بەر بە هێزە پاشایەتی خواز و فەندەمێنتالیستە ئاینییەکان بۆ چوونە نێو ئەڵقەی نەمرەوەی بگرین؟**

***شانتاڵ مووفە:*** کۆمەڵێک هێز هەن کە هیچکات نایەنە نێو بازنەی دیمۆکراسی رادیکاڵەوە، چون خۆیان لە گونجان لەگەڵ خواستەکانی دیکەدا دەپارێزن، بۆ نموونە ناکرێ کۆکلۆکسکلانەکان گرێ بدەینەوە بە بزووتنەوەی مافخوازی رەش پێستەکان. بە هەرحاڵ کۆمەڵێک لە خەباتەکان دژ بە پرۆژەی دیمۆکراسی رادیکاڵن، بەو پێیەی لە هەلومەرجی دیاریکراودا چ بۆچوونێکیان هەیە.

خەبات بۆ هێژمۆنی، خەباتە بۆ گۆڕانی وشیاری هەر کام لە گرووپەکانی کۆمەڵگا و تێگەیاندنیان لەوەی بەرژەوەندییەکانیان گرێدراوی بەرژەوەندیی گرووپەکانی دیکەیە. بۆ وێنە دەکرێ خواستەکانی چینی مامناوەند، گرێ بدەینەوە بە هێژمۆنی دیمۆکراسی رادیکاڵەوە، ئەگەر توانای ئەوەمان هەبێت جۆرێک باسی لێبکەین، بە خەڵک بڵێین ئێمە ئامادەین باجی زۆرتر بدەین چونکە بەلامانەوە گرنگە خوێندنگەی باشمان هەبێت، سیستەمی بیمەی کۆمەڵایەتی و دەرمانی باشترمان هەبێت.

دەبێ ئەو گرووپانەی رادیکاڵ نین گرێ بدەینەوە بە بزووتنەوەی سۆسیالیستییەوە بۆ ئەوەی بزووتنەوەیەکی بەربلاوی دژە بۆرژوازی شــێوەگیر ببێت. چەندە زنجیرەی هاوســەنگی هەمەگیرتر بێــت، پرۆژەی دیمۆکراتیــک رادیکاڵتر دەبێت. دەتوانین وێنای ئەوە بکەین یەکگرتێکی ئاشــکرای پێشــکەوتوو لە بەریتانیا دەتوانێ بە شوێن چارەسەرکردنی کێشــەیەکەوە بێت کە بەدیهاتنەکەی دەبێ بە هۆی ستەم لە وڵاتێکی تر. بۆیەش گرینگە خەبات هەڵگری لایەنێکی نێونەتەوەیی بێت بۆ ئەوەی بزووتنەوەی وڵاتێک بە بزووتنەوەی وڵاتانی دیکەوە گرێبدات.

بە هەر شــێوەیەک بێــت کۆمەڵێک لەمپەری بونیادی دەکەوێتە بەردەم زنجیرەی هاوســەنگی، زنجیرەی هاوسەنگی پێویستی بە شتێکە کە ئێمە پێی دەڵێین سنووری هەستیار. هەر هێژمۆنێەک بۆ ئەوەی رادیکاڵ بێت پێویســتی بــە دوژمنێک هەیە، ئەم دوژمنە دەتوانــێ بۆرژوازی بێت، یان وێران کردنی ژینگە، یان پێشێل کردنی مافی مرۆڤ. ئەوەی لە سیاسەتی هەنووکەییدا هەیە و بۆتە هــۆی نیگەرانیی من، ئایدیای یەککگرتنە. پرۆژەیەکی رادیکاڵ ناتوانێ هەڵگری هەموو تیۆرییەکان بێت. رێککەوتن لە نێوەی رێگەدا دەتوانێ هەموو شتێک گەرەنتی بکات و هیچ شتێکیش گەرەنتی نەکات.

### کە وایە دیمۆکراسی جیاواز لە رێککەوتن چۆن پێناسە دەکەن؟

***شانتاڵ مووفە:*** من بیرۆکەی فرەچەشنی بە پێی ناکۆکی بە کار دێنم، بۆ ئەوەی رێگایەکی نوێ بۆ لێکدانەوەی دیمۆکراســی بدۆزمەوە، ئەمە ئەو شــتەیە کە ناکۆکە لەگەڵ گەلاڵەی نەریتی لیبراڵی دیمۆکراســی وەک کارلێکی نێوان بەرژوەندییەکان، هەروەها دژ بە مۆدێلێکە کە کەسانێکی وەک هابرمــاس و راویلز گەشــەیان پــێ داوە. هەرچەن ئەوان جیاوازی بۆچوونیــان هەیە، بەڵام لە ســەر ئەم خاڵە کۆکن کە ئامانجی کۆمەڵگای دیمۆکراتیک گەیشــتن هاوڕاییە، ئەم هاوڕاییەش ئەو کاتــە بــەدی دێت تاکەکان بەرژوەندییە تایبەتەکانیان واز لێ بێنن و لە پێگەی مرۆڤی عاقڵدا بیر بکەنەوە. کە مادام ئێ ئێمە خوازیاری کۆتایی هاتن بە جیاوازی بۆچوونین، دەمانهەوێ خەڵک ئازادی کردەیان هەبێت، کە وایە دەبێ هەموو کات ئەگەری ســەرهەڵدانی جیاوازی بناسینەوەو و پانتایەک لــە بەرچاو بگرین بۆ بەریەک کەوتنی ئەم جیاوازی بۆچوونانە. رەوتی دیمۆکراتیک دەبێ ئەم پانتا و بوارە دابین بکات.

***ئەرنێستۆ لاک لائۆ:*** ئێمە ئەم نوقسانە عەقڵخوازانە لە بنەماکانی مارکسیزمیشدا دەبینین. گەڵێ لە رەوتە مارکسیســتەکان لایان وایە کۆمەڵگا دەتوانێ عەقڵخواز بێت و لە ســەر ئیرادەیەکی هاوبەش رێک بکەوێ. وەک ئەو شــتەی لە وڵاتانی کۆمۆنیســتی رۆژهەڵات و سۆسیاڵ دیمۆکراسی رۆژئاوا رووی دا، دەوڵەت دەبێ بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم ئیرادە گشتییە بێتە مەیدان و دەستکاری بــکات. لەم نموونەدا ئەم چاودێرییە کۆمەڵایەتییە شــێوەیەکی برۆکراتیکی وەرگرت. بۆرۆکراتەکانی

یەکیەتی سـۆڤییەت کە شـێوەیەکی زێدەڕۆییانەی ئەم بەشداری کردنە بوون ، بە خەڵکیان دەوت ئەوان لە کۆمەڵگایەکی عەقڵخوازدا دەژین، نەیارەکان تووشی تێکچوونی دەروونین و دەبێ بنێردرێتە شێتخانە.

**شانتاڵ مووفە**: ئەمرۆکە لە رۆژئاوا ئەگەر رێگایەکی دیمۆکراتیک بۆ بەریەک کەوتنی ناکۆکی و بەرژوەندییەکان نەبێ، خەڵک تووشـی بێ باوەری دەبن و ئیتر بەشـداری سیاسـەت ناکەن، یان خراپتر، بەشـداری خەباتێک دەکەن کە لەگەڵ دیمۆکراسیدا ناگونجێ، بۆ وێنە هەڵاواردنی رەگەزی، فۆندەمێنتاڵیزمی ئایینی و فاشیزم. فەرانسە و گەشەی راستە توندرەوەکان بە رێبەرایەتی لۆپێن لە بەرچاو بگرن، ئەم بابەتە کاتێک روویدا کەسۆسیالیستەکان هەڵوێستی میانەرەوانەیان گرتە بەر و تەسـلیمی ئەم بەڵگاندنەی راستە دیمۆکراتیەکان بوون، واتە راستە توندرەوەکان گەشەیان کرد لە بەر ئەوەی تەنیا هێزێک بوون کە ئاڵترناتیڤی راسـتەقینەیان پێشەکەش کرد و ناکۆکییەکانیان خستە روو.

لۆپێن دەنگی هەموو ئەو کەسانە بوو ناتوانن لە ژینگەیەکی دیمۆکراتیکدا دەنگیان هەبێت بۆ ئەوەی بۆچوونی خۆیان دەرببرن. لەروانینی یەکەمدا دەکرێ بریتانیا بە خاڵی بەرامبەری فەرانسـە بزانین چونکە راسـتێکی تونـدرەوی بەهێز لەم وڵاتەدا ئامادە نییە. مـن لام وایە حیزبی کرێکار لە ١٨ سـاڵی رابردوودا هێشـتا لە کار نەکەوتووەو خەڵک هێشـتا لەم وەهمەدان کە لەم دەوڵەتە تازەدا دەکرێ کارێکی جیاواز بکەی. لە فەرانسـە و نەمسـا راستە توندڕەوەکان وەک ئەڵترناتیڤێک گەشـەیان کرد، لە بەر ئەوەی رەوتەکانی تر تاقـی کرابوونەوە و خەڵک دڵنیا بوون لەوەی هیچکام لـە حیزبە گەورەکان ناتوانن هیچ جۆرە ئەڵترناتیڤێک پێشـکەش بکەن. ئەگەر خەڵک لە ماوەی ٤ ساڵدا هەستیان کرد گۆرانێکی راستەقینە نەهاتۆتە گۆر و حیزبی کرێکار لە دەسەڵاتدا هیچ شتێکی جیاوازی لە حیزبی پاوانخواز ئەنجام نەداوە، لە وەها دۆخێکدا ئەوە جێگای سەرنجە ئەم هێزە بەرەو کوێ دەڕوات. ئەمە تاقیکردنەوەیەکە بۆ راستیی لێکدانەوەکەی من.

**بوارە گرنگەکانی خەبات بۆ گۆڕانی رادیکال بۆ ئایدیای هێژمۆنیک کامانەن؟**

**شـانتاڵ مووفە**: لەمپەری سـەرەکی بەردەم حیزبە چەپە ئەورووپییەکان ئەوەیە بەرنامەی ئابووری ئەڵترناتیویان نییە. هێشـتا ئەو باوەرە زاڵە کە ئابـووری هەرێمێکی قەدەغەیە، چونکە لۆژێکی بازار بە سـەریدا زاڵە، جیهانی بۆتەوە و دەوڵەتی نەتەوەیی لە پاشەکشەدایە. لە راستییدا ئـەم راسـتییانە ئەو حیزبـە چەپانەی هانداوە بەوەی سیاسـەتی هاوڕایی و گونجـان بگرنە بەر. گرینگترین ئەرکی چەپەکان لەم قۆناغەدا دۆزینەوەی ئەڵترناتیڤێکە بۆ نیۆلیبرالیسم.

**ئەرنێسـتۆ لاک لائـۆ**: ئەو کاتەی کە نموونەی نەتەوەیکردنـەوە و وەرگرتنی باجی قورس کە

نموونەی کارکردنی سۆسیال دیمۆکراتەکان بوو، توانایی نەما، راستەکان هاتنە مەیدان تاکووەک جێگر نئۆلیبرالیسم پێشکەش بکەن، ئەو ئەلتەرناتیڤەی گۆرانەکانی سەردەمی لە گەلالەکەی خۆیدا لە بەرچاو دەگرت. چەپەکان کەمتەرخەم بوون لەوەی گوتارێکی ئالتەرناتیڤ دابرێژن. هەر لە بەر ئەوەیە ئێمە مۆدێل و سەرچەشنی تۆنی بلێریمان هەیە کە دەیهەوێ «تاچریسم سەر لە نوێ زیندوو بکاتەوە.

***شانتال موفە:*** بەڵام لێرەدا ناچار نین لە نێوان کینز خوازیی کۆن و نیۆلیبرالیسمدا یەکیان هەڵبژێرین. وەک چۆن بەشێک لە حیزبە سۆسیالیستەکان ئێستاش لە سەر ئەو باوەڕەن ناکرێ کێشەی بێکاری بە پشت بەستن بە روانگەی تەقلیدی دامەزراندنی بە تەواوەتی چارەسەر بکرێ. ئەم پرسە لە رێگای بازاری نەرمی کارەوە کە لە ئەمریکادا زاڵە چارەسەر دەکرێ. ئێمە دەبێ بە جیدی دەست بدەینە دابەش کردنی کارەکان. ئێمە دەبێ جەخت لە سەر کەم کردنەوەی ساعەتی کار و بەشدار بوون لە شوێنی کاردا بکەین. ئێمە دەبێ ئایدیای داهاتی بنەرەتیش لە بەرچاو بگرین._ لە سەر ئەو بنەمایەی هەموو هاووڵاتیان پارەیەک لە دەوڵەت وەک داهاتی بنەرەتی وەربگرن و لە شوێنی کارەکەیان داهاتێکی زیادییان هەبێت. زۆر گرینگە ئەگەر ئێمە پێوەندی نێوان داهات و کار بپچرین تەنها لە بەر ئەوەی هەموو کەس شوێنی نییە بۆ کار کردن. ئەم بابەتە دەرخەری گۆرانێکی کولتووریشە_ئیتر کار چەقی شوناسی ئێمە نییە.بەڵام حیزبە سۆسیالیستەکان کەمتەرخەمن بەرامبەر بەم بابەتە، چونکە روانگەی سێمبۆلیکیان دەربارەی ناوەندیەتیی کار دەچێتە ژێر پرسیارەوە.

***ئەرنێستۆ لاک لائۆ:*** نئۆلیبرالیسم لە بیرکردنەوەی ئابووری بۆرژوازی سەدەی نۆزدەیەم ئەم باوەرەی بە میرات وەرگرتووە کە لە بنەرەتدا تەنها یەک مێکانیزمی ئابووری هەیە کە دەتوانێ بەرهەمهێنانەوەی کۆمەڵایەتی دابین بکات. بۆ رووبەروبوونەوە لەگەڵ نئۆلیبرالیسم نابێ بەڵگاندنی ئێمە بە شێوەیەکی تر هەر ئەو مێکانیزمە ئابوورییە بێت، بەڵکوو دەبێ جەخت لە سەر ئەوە بکەینەوە ناتوانین داهاتە کۆمەڵایەتییەکان تەنها بە لۆژیکی دەرهەستی ئابووری بەرهەم بێنین. ئێمە دەبی باس لەوە بکەین پانتای بەرهەمهێنان گرێ دراوەتەوە بە فرەچەشنی هێزە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانەوە. کارگە شوێنی ئاڵۆزی پێوەندی دەسەڵاتە. کۆمپانیا بان نەتەوەییەکان دەبێ لە ئاستی نەتەوەییدا کار بکەن، ئەو شوێنەی هێزە دژبەرەکان رەوتی سەرمایە لەم سەری جیهانەوە رێنوێنی دەکەن بۆ ئەو سەری جیهان. ئەگەر گوتارەکە بەم ئاراستەدا بروات نیۆلیبرالیزم دەچێتە ژێر پرسیارەوە.

## پەراوێزەکان:

*بێنیامین دیسرائێلی- سیاسەتمەداری بەریتانیایی (١٨٠٤-١٨٨١).

# وتووێژێکی کورت لەگەڵ سلاڤۆی ژیژەك

**ئامادەکردنی: رۆزانا گرینستریت**
**لە ئینگلیزییەوە: مەنسور تەیفوری**

پ: خۆشترین کاتت کەی بووە؟

و: هەندێ جار کاتێ سەیری چرکەیەکی شادی بەردەمم دەکەم یان بیری دەهێنمەوە – نە لە کاتی روودانیدا.

پ: گەورەترین ترست چییە؟

و: بەخەبەرهاتن لە دوای مردن — لەبەر ئەوەشە دەمەوێت دوای مردنم خێرا بمسووتێنن.

پ: کۆنترین بیرەوەریت کامەیە؟

و: بینینی دایکم بە رووتی.

پ: لە زیندووەکان کێت زیاتر بەدڵە و بۆ؟

و:ژان بێرتراند ئاریستەل، سەرۆکی دوو جار لەسەر کار لابراوی هاییتی. ئەمە مۆدێلێکی ئەو شتەیە دەکرێت بۆ خەڵکی دیکە و لە شوێنی دیکەش کاری پێبکرێت.

پ: بێز لە کام هەڵسوکەوتی کەسانی دیکە دەکەیتەوە؟

و: ئامادەیی تەمبەڵانە بۆ یارمەتیدانم. ئەویش لە کاتێکدا نە پێویستم بێت و نە داوام کردبێت.

پ: کەی زیاتر لە هەموو کاتێک سەرت لێدەشێوێت؟

و: پێش خۆشەویستی بە رووتی لەبەردەم ژنێکدا بوەستم.

پ: جگە لە ماڵ و موڵک، گرانترین شتێک کڕیبێتت کامەیە؟

و: ئێدیتی نوێی کۆی بەرهەمەکانی هیگڵ.

پ: گرنگترین خەزێنەیەک پاشەکەوتت کردبێت کامەیە؟

و: سەیری وەڵامی پرسیاری پێشوو بکە.

پ: چی خەمبارت دەکات؟

و: بەختەوەریی ئەحمەقەکان.

پ: ناخۆشترین شت لە دەرکەوتنتدا؟

و: بەو جۆرەی بەڕاستی هەم دەرکەوم.

پ: ناشیرینترین عادەتت کامەیە؟

و: تەکاندانی بێتامی دەستەکانم لە کاتی قسەکردندا.

پ: گەر بچیتە بۆنەی دانانی ماسک، کام ماسکە هەڵدەبژێریت؟

و: ماسکی خۆم لە سیمام دەدەم، بە جۆرێک وابزانن من خۆم نیم، بەڵکوو کەسێک خۆی کردووە بە من.

پ: قێزەونترین چێژت کامەیە؟

و: سەیرکردنی بێماناکانەی هەندێ فیلمی سۆزداریانەی وەک دەنگی مووزیک.

پ: چی بە دایک و باوکت قەرزداریت؟

و: هیوادارم هیچ. هیچ شیوەنم بۆ نەکردن.

پ: زیاتر حەز دەکەیت داوای لێبوردن لە کێ بکەیت و بۆ؟

و: لە کوڕەکانم، چون باوکێکی بە قەد پێویست باش نەبووم بۆیان.

پ: هەستی خۆشەویستی لە چی دەچێت؟

و: لە نەگبەتییەکی گەورە، لە موزاحیمێکی دێوئاسا، لە دۆخێکی نائاسایی هەمیشەیی کە هەموو چێژە بچووکەکان تێدا دەبات.

پ: چی یان کێ ئەشقی ژیانت بووە؟

و: فەلسەفە. بە نهێنی لام وایە واقیع هێند هەیە کە بتوانی سەودای پێوە بکەی.

پ: بۆنی هەرە خۆشەویستت؟

و: بۆنی سروشت لە کاتی رزینیدا، وەک درەختی روو لە رزان.

پ: تا ئێستە وتووتە "خۆشم دەوێیت" و بە ڕاستت نەبووبێت؟

و: کاتێ کەسێکم خۆش بوێ تەنیا بە توندی و نیشانەی خراپ دەتوانم دەریببڕم.

پ: زیاتر رقت لە کێیە و بۆ؟

و: ئەو پزیشکانەی یارمەتی ئەشکەنجە دەدەن.

پ: خراپترین کارێک کردبێتت چییە؟

و: وانەوتنەوە. رقم لە خوێندکارە، ئەوان (وەک هەموو خەڵک) بەزۆری دەبەنگ و وەڕەزکەرن.

پ: گەورەترین نائومێدیت چییە؟

و: ئەوەی ئالێن بەدیۆ پێی دەڵێت" نەگبەتیی نادیار" ی سەدەی بیستەم؛ کارەساتی شکستی

کۆمۆنیزم.

پ: ئەگەر بتوانیت بە رابردووتدا بچیتەوە چی لادەبەیت؟

و: لەدایکبوونم. لەگەڵ سۆفۆکل هاوڕام کە: گەورەترین نوقسان ئەوە نییە کە دەبێ لەدایک ببیت، بەڵکوو ئەوەیە، کە بۆتە بنێشتە خۆشەش، خەڵک کەم تێیدا سەردەکەون.

پ:ئەگەر بتوانی بۆ رابردوو بگەڕێیتەوە، بۆ کەی دەچیت؟

و: بۆ ئاڵمانیای سەدەی نۆزدەهەم، بۆ بەشداری لە وانەکانی هێگڵدا.

پ: چی ماندووێتیت دەحەسێنێتەوە؟

و: گوێگرتنی دووبارە و دووبارە لە واگنێر.

پ: بە زۆری کەی سێکس دەکەیت؟

و: تا مەبەست لە سێکس چی بێت. ئەگەر مەبەست ئەو دەستپەڕە بەردەوامە بێت کە لەگەڵ هاوژیانەکەت دەیکەیت، حەز ناکەم هیچکات بیکەم.

پ: کەی زۆر هەستت بە نزیکی مردن کردووە؟

و: کاتێک سەکتەیەکی سووکم کرد. دەستم کرد بە بێزاریی لە لەشم، لەشم چیدی ملی بە ئەرکەکانی بۆ خزمەتی کوێرانەی من نەدەدا.

پ: تاقە شتێک چۆنایەتی ژیانت باشتر بکات؟

و: ملنەدان بە پیری

پ: چی بە گەورەترین دەسکەوتی خۆتی دەزانیت؟

و: ئەو فەسڵەی لام وایە تێیدا بە باشی هێگڵم راڤە کردووە.

پ: گەورەترین وانەیەک ژیان فێری کردبێتیت کامەیە؟

و: ئەم وانەی کە ژیان شتێکی بێمانا و گێلانەیە کە هیچی نییە فێرت بکات.

پ: نهێنییەکمان پێ بڵێ.

و: کۆمۆنیزم سەردەکەوێت.

## سەرچاوە:

ئەم وتووێژە ٩ ی ئۆگۆستی ٢٠٠٨ لە رۆژنامەی گاردیەن بڵاوبۆتەوە، بەم ناونیشانەی خوارەوە لە سەر تۆڕی ئەنتەرنێت هەیە:

http://www.guardian.co.uk/lifeandstyle/2008/aug/09/slavoj.zizek

# ئینهێ دۆنا، خاتوو خوای شیعر

## -دەقی سەرەکی و توێژینەوەیەک لەسەر کۆنترین شیعری دونیا-

سەعید هونەرمەند
لە فارسییەوە: لەیلا ساڵحی

هەزار و سەد ساڵ بەر لە «سافۆ» (Sappho) و هەزار و حەوت سەد ساڵ پێش «هۆمێر»، لە شاری ئوور(ur) کاهینێک بە ناوی "ئینهێ دۆنا"(Enheduanna) دەژیا. ئەو هەر ئەو کەسەیە کە هۆنراوەی بەرزی «ئینانا (Inanna)؛ خاتوونی گەورەترین دڵی»[1]هۆندۆتەوە. ئەو بەرهەمە کۆنترین شیعری جیهانە. تا ئەو جێیەی بۆمان دەرکەوتووە شیعرەکەی «ئینهێ دۆنا»یەکەم شوێنەوارێکە کە لەسەر سواڵەتە سومێری یەکان نووسراوەتەوە، کەوایە لانی کەم تا کاتێک شوێنەوارێکی کۆنتر نەدۆزرێتەوە، دەبێ ئەو شاعیرە وەک کۆنترین شاعیری جیهان بناسین. «ئینهێ دۆنا» هەر ئەو خاتوونەیە کە ئەویندارانە»ئینانا»ی ستایش دەکرد، هەر بەو هۆیەش ئەم شیعرە جوان و ناسکەی بۆ گوتووە. بەڵام لە نێوان ستایشی ئەو شاعیرە لە «ئینانا»و شوێنەوارگەلێک کە دواتر «حەووا» هەڵدەسەنگێنن و یەکەمین گوناح لەوڕا دەزانن، جیاوازییەکی بەرچاو هەیە. «حەووا» بەهۆی بەجێنەهێنانی ئەمری خوداوەندی میری مەزن، غەزەبی لێدەگیرێ و بە سەرشۆڕی یەوە گەڵا دەپۆشێ و لە بەهەشتەوە بەرەو تاراوگە دەنێردرێ. لەکاتێکدا «ئینانا» نەک هەر تەنیا لەبەر توانای بەدیهێنانی وەرزێڕی، بەڵکو لەبەر خاتری»یوونی»ش[2] کە دیاردە و نیشانەی بەرووبوو و زاوزێیە ستایش دەکرێ.

«ئێنهێ دۆنا» کاهێنی دەوڵەت-شارێکی دەشتەکانی نێوان دیجلە و فۆڕات بوو، شوێنێک کە بە بێشکەی ژیار ناسراوە. هەڵبەت بەر لەو رێکەوتە ژیارەکانیش وەک باقی خەڵکی تر بە شوێن وەدەستهێنانی بژێوەوە کۆچەر بوون، لانی کەم لە چل هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە تا هەزارەی پێنجەمی

بەر لە زایین، ژیاری «نێوان چۆمان»(Mesopotamia) واتە مەودای نێوان دوو چۆمی دیجلە و فۆڕات، لە دەشتەکانی نێوان زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس و چۆمەکانی دیجلە و فۆڕات، دادەمەزرێ. سۆمەرییەکان لە ڕیزەی هەوەڵ دەوڵەتەکانی ئەو ژیارە بوون و ڕەنگە هەوەڵ شارستانیەتێک بووبێتن کە داهێنەری خەت بن. هەر لەوەش رایە کە شیعرەکانی «ئینهێ دۆنا»بە خەت و زمانی سۆمەری نووسراوەتەوە.

شیعری «ئینهێ دۆنا» ڕۆڵێکی یەکجار گرنگی لە پێکهاتنی پێکهاتەی ئەدەبیاتی جیهاندا بووە. وەرگێڕانی ئەو شوێنەوارە کە لەو ساڵانەی دواییدا ئەنجام دراوە، ئەو بابەتەمان بە روونی بۆ دەردەخا. شوێن دانانە سەرسووڕهێنەرەکەی تا ئەو رادەیەیە کە دەکرێ بڵێین دەنگە گرنگ و سەرکەوتووەکانی رابردوو، هەموو لە ژێر تیشکی شوێنی ئەودا بوون بە یەک و ئەدەبیاتیان بە درێژایی مێژوو بەرەوپێش بردووە. لێکۆڵینەوە کەونارایی و بیناسازییەکان ئەم شوێن دانان و هێڵی شکڵ گرتنەی ئەدەبیات بە تەواوی دەسەلمێنن. بۆ وێنە کۆمەڵێک نووسراوە لەمەڕ بیناسازی شارەکانی «ئوور»، «تێڕۆئا»، یان شوێنەوارە ئوستوورەییەکانی ئێران وەک «گەنگ دژ» لەبەردەستدان، کە ئەو راستییە دەردەخەن، ئەم شوێنەوارانە، لە زۆر بواردا کاریگەرییان لەسەر ئەدەبیات داناوە. لەو نموونانە دەتوانین ئاماژە بە «هفت پیکر»بکەین. بۆ بەڵگەی تریش دەتوانین بڵێین پێکهاتە و شێوەی قەڵا و باڵەخانە و شوێنەوارە کۆنەکانیش شوێنیان لەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکان داناوە.

تەنانەت شوێنەوارە کەوناراییەکانیش ئەم راستییە دەسەلمێنن. بەتایبەت شاعیران پێشاندەر و دەرخەری ڕێگایەکن کە تا ئێستا لە ئەدەبیاتدا بیراز کراوە و هاتوچۆی بەسەردا کراوە. لە فارسیدا وەک باسمان کرد «هفت پیکر» نموونەی ڕێکهاتنی کۆشکی «خەوەڕنەق»و ئامانج شاری ئوستوورەییە. هەروەک چۆن شیمانە دەکرێ مافوورەو قەڵای ئێرانییش مەبەستی دیسان نواندنەوەی ئەو شارەیان تێدا حەشار درابێ.

ڕێک هاتنی بابەتەکان لەگەڵ یەک، شیمانەی هەبوونی ئەم شوێن دانانە بەربڵاوە بەهێزتر دەکەن. شوێن پێی ئوستوورەکانی «نێوان چۆمان» لە سەرانسەری ئاسەواری فەرهەنگە جۆراوجۆرەکاندا نیشاندەری ئەو ڕەوتەیە. بۆ وێنە سەیر نیە کاتێک دەبینین وێنەی «ئینانا» لە چاخی پیاوسالاری و لە زۆربەی ژیارەکاندا، لەگەڵ گوناحی «حەووا» کە بە یەکەمین تاوان نێوی زڕاوە، تێکەڵ دەبێ. سەرشۆڕی «حەووا» نموونەی سەرشۆڕی ژن لە چاخێکی مێژوویی تایبەتدایە. ئەو نموونەیە وێڕای هێندێک نموونەی تر، چاخی بەهێزبوونی پیاو دەنوێنن، سەردەمێک کە ئێمە وەک چاخی باوک سالاری ناوی دەبەین و هەڵبەت ئێستاش بە شێوەیەک لە شێوەکان هەر لەو چاخەدا دەژین. بەڵام بەر لەو ڕێکەوتە، بە پێی دیاردە و ئاسەواری جۆراوجۆر، بۆ وێنە چیرۆکە ئوستوورەییەکان، ئێمە لە چاخێکی دوور و درێژی ژن سالاری ئاگادار دەبینەوە. لەو چاخەدا، راست بەو جۆرەی لە چاخی باوک سالاریدا دەبیندرێ، ئێمە شایەدی گازە و ستایش بۆ ژن و «یوونی»یەکەی ئەوین، کە وەک ئەفرێنەر و دەوامدەری نەوەکان ناسراوە. سەردەمێک «سافۆ»و بەر لەویش «ئینهێ دۆنا»، ئەم گەڕانەوە بۆ دوایە؛ واتە لە باوک سالارییەوە بەرەو ژن سالاری، لە ڕەوتی ئەدەبیاتدا دەنوێنن.

بە دۆزینەوەی ئاسەوارەکانی «سافۆ» گۆڕانکارییەکی قووڵ لە جۆری روانین بۆ ئەدەبیات بەدی دێ. چون سەرەتا بۆمان دەردەکەوێ، نووسەرێکی ژن لە رابردووی زۆر دوورەوە و لە راستیدا چەند سەدەش بەر لە «هۆمێر» پێکهاتەی ئەدەبیات دادەڕێژێ و پاشانیش شێوە روانین و وێنەیەکی جیاواز لە ژن دەخاتە روو. بابەتی بەرباسی ئەو، خوداکان یان بە واتایەکی تر ئوستوورە و ئایینەکانە، کە لە ناخی ئەوانەدا ژن و ئەوین دەترووسکێتەوە. شێوازی کارەکەشی ساکار و ئەویندارانەیە. «سافۆ» سەرنجی سەرەکی خۆی دەداتە خاتوو خوای «وێنووس» لە فەرهەنگی لاتیندا، یان «ئافرۆدیت» لە زمانی یۆنانیدا. خاتوو خوایەک کە هەر وەک هاوتا ئێرانییەکەی خۆی «ئاناهیتا»، ئەستێرەیەکی هەر بەو ناوەوە هەبووە و ئێستاش هەیەتی. «سافۆ» مامۆستای گەورە کچان بوو، هەروەها کاهینێکیش بوو کە هەموو تەمەنی خۆی پێشکەش خاتوو خوای «وێنووس» کرد. ئەو خاتوو خوایە بەر لەویش هەبووە و لە ژیارەکانی «نێوان چۆمان»دا، لە نێو «ئەکێدی»یەکان(Akkadian) بە «ئیشتار»و لە نێو «سۆمەری»یەکان بە «ئینانا» ناوی دەرکردووە. بە دۆزینەوە و وەرگێڕانی سواڵەتەکانی «ئێنهێ دۆنا» لە دوو دەیەی رابردوودا بۆمان دەردەکەوێ سافۆش وەک خاتوو خواکەی «وێنووس»، جێگری شاعیر و خاتوو کاهینێکی کۆنتر لە خۆی بووە کە ئەویش «ئینهێ دۆنایە». هەروەها لە شیعری «ئینهێ دۆنا»ش ڕا تێدەگەین، تەنانەت «ئینانا»ش لە بەرزایی ئوستوورە و قارەمانە کۆنە ئوستوورەییەکانەوە لەگەڵمان دەدوێ. هەر بۆیەش شاعیر ئاوەها ستایشی دەکا:

تۆ، تۆ بە عەبا لە مێژینەکانەوە

عەبای خودا لە مێژینەکان. . .

دۆزینەوە نوێیەکان ئاوا دەگێڕنەوە؛ کە دەبێ ماکە شوێن دانەرەکان لە ئەدەبیات و لێکۆڵینەوەکانی داهاتوو، لە نێو چاخە شاراوەکانی پشت تەم و مژی زەمان ببینینەوە. ئێستا کورتەیەکی ئەو توێژینەوەیە کە گەڕانەوەیەکە بەرەو دوا، دەخەینە بەردەست. چەند سەدەی رابردووی ژیاری مرۆڤ یەکسەر لەژێر چۆکی رەخنە و ئەدەبی یۆنانی دابوون. بەڵام پاش بیسترانی دەنگ و چیرۆکی «ئیشتار»، خاتوو خوای «ئەکێدی»، گۆڕانکارییەک لە توێژینەوەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەدی هات. بۆ یەکەم جار ئەو دەنگە لە کەلێن و کولێنی ئەو بەردەنووس و سواڵەتانەدا دەبیسترێ، کە نزیکەی پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەر، لەلایەن خەڵکی «ئەکێد»ەوە نووسرابۆوە.

سەرەڕای ئەوە ئێستاش چەند دەیەی مابوو تا دەقی شیعرەکانی «ئینهێ دۆنا» بدۆزرێنەوە و ناوەرۆکیان تاوتوێ بکرێ. هەروەک باسیشمان کرد لە دەیەی هەشتادا بوو کە دەنگی «ئینانا» بە دلێری بیسترا و چیرۆکەکەی لە دووتوێی ئەو شیعرانەدا گێڕدراوە. هەوەڵ ئاسەوارێک کە لە بابەت ئەوەوە چاپ کرا ناوی: «ئینانا؛ خاتوونی بەهەشت و زەوین» بوو. ئەو کۆمەڵە دەقە گردوکۆیەک بوو لە نووسراوەی سومەرناسانێکی وەک «سامۆئیل کریمێر»(samual n. kramer)و «دیان فۆڵکشتاین»(Diana wolkstein). لەو کتێبەدا «کریمێر» زیاتر لەسەر کۆنترین ئاسەوار و وەرگێڕدراوەکان دواوە، لە کاتێکدا «فۆڵکشتاین» هەوڵی داوە لە ئاوێنەی ژنی ئەمرۆدا، وێنەیەکی شاعیرانە لە «ئینانا» بەدەستەوە بدا. ژنێک کە هەوڵ دەدا شوێن و جێگەی خۆی لە بازاڕی کاردا

دابین بکات. هاوکات لەگەڵ ئەوەش بە مەبەستی نیشاندانی توانای تاکەکەسی و پتەویی کەسایەتی خۆی، سووچە شاراوەکانی هەستی ئەویندارانە و سێکسی خۆی دەنوێنێ و ئازایانە دەری دەبڕێ.
بە یارمەتی هەوڵێکی لەو چەشنەیە کە نووسەر لە نێوان ژنی هاوچەرخ و وێنە کەونارایییەکەی پردێک هەڵدەبەستێ. «ئینانا» وێنەی کەونارایی ژنی ئەورۆ، «یوونی»یەکەی خۆی وەک نیشانی بەروبوو و راست هەروەک هەوڵ و تێکۆشانی ئەو لە چاندن و کێڵان و بەرهەمهێنانی حاسڵاتدا ستایش دەکا، هاوکات بنەما سەرەکییەکانی فەرهەنگی خۆی دادەمەزرێنێ. هەر ئەویشە «پاپۆڕی بەهەشت» بەرەو شوێنی ئامانج و مەبەست دەئاژوێ. هەر بەو جۆرەی کە ژنی ئەورۆ بە گەڕانەوە بۆ بازاڕی کار، توانای بەرهەمهێنانی خۆی، کە پێشتر تەنیا لە پاوانی پیاوان دابوو، لەگەڵ توانای ئافراندنی مرۆڤ، کە ئێستاش هەر لە پاوانی ژندایە، تێکەڵ دەکا. دوو هەزار ساڵ پاش «ئینانا»یە کە تێدەگەین، دوای پاوان کرانی توانای بەرهەم هێنان لەلایەن پیاوانەوە، ئوستوورەکانی ژن سالاری بەتایبەت لە ئەدەبی یوونانیدا، جێگەی خۆیان دەدەنە چیرۆکی پیاوانە. پاشان دوا بە دوای ئەوەش دەبینین «حەووا»بە یەکەمین گوناح تاوانبار دەکرێ و مەجبوور دەبێ گەڵابپۆشێ و لەژێر سێبەری گێڕانەوەی پیاوانەدا بنێژرێ.
ئوستوورەی «ئینانا» هاوسانە لەگەڵ ئوستوورەی «ئیشتار»، کە وەک هاوتای ئەکێدی «ئینانا» دەناسرێ. ئەگەرچی لێرە و لە شیعری «ئینهێ دۆنا»دا، چیرۆکەکە زۆر شاراوەیە و بە زمانێکی خوازەیی داپۆشراوە و بێجگە لە ماکە چیرۆکی و شایەدە جوگرافیاییەکان، شوێن پێیەکی دیار لەو هاوسانییە نابیندرێ، لە راستیدا دەبێ ئوستوورەی «ئینانا» لە شوێنێکی تر و وێڕای هەندێک قەرز وەرگرتن لە ئوستوورەی «ئیشتار» کامڵ بکرێ. سەرەڕای ئەوەش، بەر لەوەی چیرۆکی «ئئیشتار» بۆ خستنە رووی هێڵە گشتییەکانی شیعرەکە بگێڕینەوە، واباشە ئاماژەیەکی کورت بە ئوستوورەی نجوومی ئەستێرەکەی «ئیشتار»و هەروەها ماکە جوگرافیایییەکانی شیعرەکە بکەین.
«ئینانا» خاتوو خوای سومەری و قەدیمی تریش لەو «ئیشتار» لە ژیاری ئەکێدیدا، خودای ئاگاداری خەڵک، ئەوین، بەروبوو، و هەروەها خودای شەڕیش بوو. نیشانەی ئەو ئەستێرەی پێنج پەڕە. خاڵی سەرەکی؛ واتە بابەتی گرنگی ئوستوورەی ئەم خاتوو خودایە ئەستێرەی ناهید بووە، کە لە زانستی نجوومی وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا شوێن دانانێکی قووڵی بووە، هەروەک کاریگەری لەسەر هاوتا ئێرانییەکەی، «ئاناهیتا»(ناهید) یان «ئافرۆدیت»ی یۆنانی، یان «ئیشتار»ی سومەری و هەروەها «زوهرە»ی سامی داناوە. ئەو ئەستێرەیە کە پڕشنگدارە و بە چاوی ئاساییش دەبیندرێ، تایبەتمەندی خۆی هەیە. هەر بەو هۆیەش یەکێک لە گرنگترین، قووڵترین و شوێن دانەرترین ئوستوورە نجوومییەکانی لێ بەدی هاتووە. ئەستێرەی «ناهید»[٣]لە گۆشەی ٤٨ دەرەجەی خۆر، هەمیشە یان بەر لە خۆرهەڵات یان پاش خۆرنشین لە ئاسماندا بەدی دەکرێ. ئەم ئەستێرەیە بۆ ماوەی ٢٤٧ رۆژ لە رۆژئاوا و پاش خۆرنشین وەدەردەکەوێ کە لە فارسی دا «شباهنگ»ی پێدەڵێن و لەو کاتەدا نیشانەی ئەوین و ئەویندارییە، لەوە رایە کە «فیردەوسی» لە چیرۆکی «رۆستەم» و «سوهراب»دا، دیمەنی چوونی «تەهمینە» بۆ هۆدەکەی «تەهەمتەن» واتە رۆستەم بە وەسفی ئەو

ئەستێرەیە لە ئاسماندا دەست پێدەکا:

چو یک بهره از تیره شب درگذشت

شباهنگ بر چرخ گردان بگشت[٤]

واتە چون شەو داهات کاتی ئەویندارییش گەیشت. بەڵام ئەو ئەستێرەیە پاش چاردە ڕۆژ ون بوون، دیسان و ئەو جار لە ڕۆژهەڵات و بەر لە هەڵاتنی خۆر بەدی دەکرێ، هەڵبەت بۆ ماوەی ٢٤٥ ڕۆژ ئەو ڕەوتە درێژەی دەبێ. لەو حاڵەتەدا ئەو ئەستێرەیە نیشانەی شەڕ و خەباتگێڕییە . نیزامی گەنجەوی «شباهنگ»ی لەو مانایەشدا هێناوە . ئەو بۆ نیشاندانی بڕیار و ئامانجی ئەسکەندەر بۆ ڕۆیشتن و گرتنی وڵاتە جۆراوجۆرەکان ئاوا دەڵێ"

دگر بار دولت درآمد به کار

دل دوستی با سخن گشت یار

فرو رفت شب روز روشن رسید

شباهنگ را صبح صادق دمید

دگر باره بختم سبک خیز شد

نشاط دلم بر سخن تیز شد[٥]

بە ڕای ئەستێرە ناسێکی وەکو "ئەبووریحانی بیروونی "ئەستێرەی زوهرە"و لە ڕاستیدا خاتوو خوا "ئینانا"، نوێنەری وڵاتی "نێوان چۆمان" و "حیجازە"[٦]و هەر لەوەش ڕایە کە ئەو ئەستێرە پێنج پەڕە لەسەر زۆربەی ئاڵا ئیسلامییەکان دەبیندرێ. مەبەستی ئەوان لە نواندنی ئەو ئەستێرەیە، ئەستێرەی بەیانییە و بە واتای شەڕ و جەهادی بەکاردێنن. بۆوەی ئەو واتایە لەسەر ئاڵاکەیان نیشان بدرێ، زۆربەی جاران ئەو ئەستێرەیە لە دڵی هیلالی سەرەتای مانگدا دەکێشنەوە، بەو مانایە کە ئەستێرەکە لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێ، کەوابوو ئەستێرەی بەربەیانە . ئەستێرەی پێنج پەڕ نیشانەی ئەرتەشی ئەوروپایی لە هەمبەر ئیمپڕاتووری عوسمانیش بووە، بەر لەویش نیشانەی موسوڵمانەکان بووە . لە ڕاستیدا ئەورووپاییەکان ئەو ئەستێرەیە کە لەسەر ئاڵای عوسمانییەکان بوو، لەسەر ئاڵای خۆیان دەکێشنەوە تاکوو بەم شێوەیە خودای شەڕی هێزی دژ و دوژمنی خۆیان داگیربکەن. ئەوەش ڕاست ئەو گۆڕانە بوو "ڕۆمی"یەکان پتر لە دووهەزار ساڵ لەمەوبەر بەسەر "میترا"، خودای شەڕی ئێرانیان هێنا، تا وای لێهات "میترا" بوو بە یەکێک لە مەزنترین خودایانی "ڕۆمی"و پەرەستگەیەکی زۆریان بۆ ساز کرد، بەتایبەت لە ناوچە سنوورییەکانی لای خاکی دوژمنەوە . ئەستێرەی پێنج پەڕ لە "ئامریکا"ش هەر بەو مانایە بەکاردەهێنرێ و لەسەر هەموو کەرەسە و ئامرازەکانی شەڕ دەبیندرێ. تەنانەت لەوەش گرنگتر لەسەر شانی ئەفسەر و ژنڕاڵەکانیشیان وەبەر چاو دێ. "پێنتاگۆن" کە بەواتای ئەستێرەی پێنج پەڕە، وێنەیەکی تری ئەم ئەستێرەیەیە، هەر ئەو مانایەشی هەیە و وەک بنکە و پێگەی خودای شەڕ ناسراوە . کۆمۆنیستەکانیش ئەو ئەستێرەیان وەک نیشانە و هێمای خەبات دژ بە چینی بۆرژوا و سەرمایەداری بەکار هێنا. ئەوەش هەر ئەو ئەستێرەیە کە لەسەر ئاڵای" یەکیەتی سۆڤیەتی "پێشوو و " چین" و "کوریای باکوور" دەبیندرێ.

بەڵام (با باسێکی) باری جوگرافیایی بابەتەکە (بکەین)، هەروەک دواتر لە شیعرەکەدا دەبینین شاخ و خودای شاخ «ئینۆنا»یان ڕەنگە «ئیبە» ڕۆڵێکی گرنگ و سەرەکییان هەیە. هەروەها بارودۆخی شوێن و فەزای شیعرەکەش بە جۆرێک ئاماژەیەکە بۆ دیمەنێکی کوێستانی، هەر لەبەر هەبوونی ئەو ماکانەشە کە زۆربەی توێژەران پێیان وایە ئوستوورەی «ئینانا» لە وڵاتێکی کوێستانی یان لانی کەم نزیک بە وڵاتێکی کوێستانی و وێش دەچێ لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای زنجیرە کێوی زاگرۆس هەوێنی گرتبێ. چونکە لە دەشتەکانی «نێوان چۆمان»و تەنانەت لە وڵاتی «میسر»یش کە ئەوێش بۆی هەیە بێشکەی شارستانییەت بووبێت، شاخ و کێوێکی بەرچاوی لێ نەبووە و ئێستاش لێی نییە. خاڵێکی سەرنج ڕاکێشی تر، ئاڵوگۆڕی وەرزەکانە کە لە »نێوان چۆمان» کەمتر بەرچاوە. لەوەش را کە سەرما و گەرما وەک کەرەسە و ئامرازی شەڕی «ئینانا» ناو دەبردرێن، بۆی هەیە ئاماژەیەک بێ بۆ وڵاتێک بە کەش و هەوایەکی مامناوەندییەوە. بە سەرنجدان بەو خاڵانە واباشە هێڵە سەرەکییەکانی چیرۆکی «ئیشتار»، هاوتای ئەکێدی «ئینانا» لێرەدا بهێنینەوە.

لە ئوستوورەی «ئیشتار»دا هاتووە کە ئەو پاش ئەوەی «تەمووز» یان «دۆمۆز»ی[٧] کوڕی دەبێ، حوکماتی سەرزەمینی پێ دەبەخشێ. بەڵام کاتێک تێدەگا لەلایەن خەڵکەوە پێشوازییەکی سەیری لێ دەکرێ و خەڵک ئەویان (لە دایکی) خۆشتر دەوێ، رقی لێ هەڵدەگرێ و تاقمێک دەنێرێتە سەرزەمین و رایان دەسپێرێ، هەرچۆنێک بێ سەری بە گۆمدا کەن و لە ناوی بەرن. ئەوانیش تەمووز بریندار دەکەن و بە برینداری دەینێرنە جیهانی مردووەکانەوە. پاش ڕۆیشتنی «تەمووز» بۆ جیهانی تاریکی، دونیای روون دەبێتە شۆرەکاتێکی وشک و بێ ئاو و سەوزەڵانی. خەڵکی لە بارەگای «ئیشتار» دەست دەکەن بە پاڕانەوە و لاڵانەوە و ئەو لە کردەی خۆی پەژیوان دەبێتەوە، دەچێتە جیهانی مردووەکان بەڵکو کوڕەکەی بگەڕێنێتەوە، بەڵام خوشکی «ئیشتار» کە دەستەڵاتداری جیهانی مردووەکانە، مل نادا و ئیشتار ناچار مەرجەکەی ئەو قەبووڵ دەکا کە تەمووز شەش مانگی ساڵ لە ژێرزەمین بێ و شەش مانگیش زیندوو بێتەوە و بێتەوە رووی زەمین. بەو شێوەیە وەرزە سارد و گەرمەکان لەسەر عەرز بەدی دێن. لەدایکبوونی «تەمووز» بۆ «ئیشتار» دەرد و ئێشێکی زۆری پێوەیە، بەڵام دووبارە لەدایکبوونەوەی ئەو واتە گەڕانەوەی عەولادەکەی «ئیشتار» لە جیهانی مردووەکان، بەژانتر و هاوڕێ لەگەڵ ئێش و برکێکی دەروونییە. لەدایکبوونی هەوەڵ ئاوێتەی خۆشەویستی و چێژە، بەڵام لەدایک بوونی دووهەم، هاوڕێ لەگەڵ پەژیوانی و لە خۆبوردووییە. ڕۆیشتنی «ئیشتار» بۆ جیهانی مردووەکان، واتە هەمبەر بوون لەگەڵ دژوارترین بارودۆخ؛ نیشانەی لەخۆبوردوویی و پەژیوانی و توێژبەردانی گیان و رووحە. لەدایکبوونەوەی سەرلەنوێی «تەمووز» نیشانەی تێپەڕین لەو جیهانە ترسێنەر و بەسامەیە. ئەوە هەر بنەما بنەڕەتییەکانی فەرهەنگی وەرزێڕییە، کە پێشتر «ئینانا» دایڕشتووە و بە مەرگ و لەدایکبوونەوەی گژ و گیا لە وەرزەکانی زستان و هاویندا، سەرلەنوێ نیشان دەدرێتەوە. ئاسەواری ئەم ئوستوورەیە لەسەر فەرهەنگی ئێرانیش ئاشکرا و حاشاهەڵنەگرە. بەڕای «مێهردادی بەهار»، «سیاوەش»هەر هەمان کەسایەتی «تەمووز»ە لە ئەستوورە ئێرانییەکاندا.[٨] لە نێوان چیرۆکی «سیاوەش» و «تەمووز»، خودای

رووەکی ژیاری «نێوان چۆمان» بێ شک وێکچوونێکی زۆر هەیە، بەڵام ئەوە تەنیا نموونە نییە و جگە لەوە نموونەی دیکەش زۆرن. بێجگە لەوەش گەڵاڵەی دایک و کوڕ بە شێوەیەکی بەرچاوتر و بەهێزتر لە باقی ئوستوورە ئێرانییەکاندا ئەو کاریگەرییەیان پێوە دیارە. بۆ وێنە پێوەندی نێوان «هومای» و «داراب»، ئەو کوڕەی وا دەکەوێتە بەر رقی دایکی و دەردەکرێ و پاشان دەگەڕێتەوە. هەڵبەت ئەو گەڕانەوەیەش ئاوێتەی ژانێکی قورسە، کە دەبێ «هومای» تابشتی بێنێ. هەروەها شیمانە دەکرێ چیرۆکی «ناهید» و کوڕەکەی «ئیسکەندەر» لە نووسراوە فارسییەکاندا، لە ناوچەی «نێوان چۆمان»و بە شوێن وەرگرتن لە چیرۆکی سەرەکی «ئیشتار» و «تەمووز» دیسان گێڕدرابێتەوە. لەو چیرۆکانەدا ماکی هاوسانی تر زۆرن کە رەنگە ئەو شوێن دانان و شوێن وەرگرتنانە بەهێزتر بکەن. لەلایەکی تریشەوە شوێنی ئەو چیرۆکە لە ئوستوورە یۆنانیەکانیشدا دەبیندرێ. خودای رووەک «ئەدونیس»و گەڕانەوەی ئەو لە جیهانی مردووەکان لە سەردەمێکی تردا لە پێوەندی نێوان «عیسا» و «مەریەم»دا شکڵ و شێوەی تازەتر بە خۆوە دەگرێ و تێکەڵ ئەوینێکی دایکانە دەبێ. هەروەها دەتوانین ئاماژە بە شوێن دانانی ئەو بەسەرهاتە لەسەر بەسەرهاتی «ئیلعازر»[9] لە شوێنەوارە مەسیحییەکاندا بکەین. لە چاخەکانی ناوەڕاستی ئەورووپاش شوێنی لەسەر ئوستوورەی «فیشرکینگ» و «شاە ئاتوور»[10] و باقی ئوستوورە ئانگلۆساکسۆنییەکان داناوە.

تێڕوانینی سەرلەنوێی ئەم ئاسەوارانە لەژێر تیشکی شیعری «ئینهێ دۆنا»دا چوارچێوە و پێوەرە ئەدەبیەکان تووشی ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی دەکا. بە وتەی «فۆڵکشتاین» روانین لە شیعری «ئینهێ دۆنا» و «سافۆ»، لە گۆشەنیگای ئەندێشە فیمینیستییەکانی هاوچەرخ ڕا دەڵێی «گەڕانەوەیە بۆ داهاتوو». بێ شک ئەگەر کار و توێژینەوە لەسەر فەرهەنگی «نێوان چۆمان» قووڵتر بێتەوە، «گەڕانەوە بۆ داهاتوو» بەرینتر و بەرچاوتر دەبێ، لەژێر سێبەری ئەو توێژینەوانەدا، رەنگە زۆربەی بنەما و واتا ئەدەبییەکان بگۆڕدرێن، بەتایبەت بە لەبەردەستدابوونی ئووستوورەی «ئینانا»و شیعری بەرزی «ئینانا؛ خاتوونی گەورەترین دڵ» کە قووڵاییەکی فەلسەفی نوێ دەخاتە روو. (وێدەچێ ئەو گۆڕانە رەوتێکی بەلەزتر بەخۆوە بگرێ) بە وتەی «بێتی میدور» وەرگێڕی ئینگلیزی شیعرەکە، توێژەرانی ئینجیل لە داهاتوودا تێدەگەن کە گریانی «ئینهێ دۆنا» بەو تەرجیع بەندەوە: « خۆ من هی تۆم/بۆ بە کەنیزم دەخوازی؟» هاوسانە لەگەڵ گریانەکانی «ئەییووب» کە دوو هەزار ساڵ دوای «ئینهێ دۆنا» بەسەر لاپەڕەکانی کتێبی «عەهدی عەتیق»دا فرمێسکی هەڵوەراند. ئەو هەروەها دەڵێ کە شوێن دانانی «ئینهێ دۆنا» لەسەر دەقە رۆژهەڵاتی و رۆژئاواییەکان تا ئەو رادەیەیە کە دەبێ بڵێین «ئەو هەر لە سەرەتاوە لەگەڵمان بووە». لە ڕاستیدا کاریگەری «ئینهێ دۆنا» تەنیا کاریگەری شاعیرێک لەسەر شاعیرانی پاش خۆی نییە، بەڵکو لەوەش زیاتر نیشانەی رۆڵ و بەشی بێ ئەملا و ئەولای ژنانە لە ئەدەبیات و فەرهەنگی جیهاندا.

«ئینهێ دۆنا» شیعرەکەی لە سێ بەشدا هۆندۆتەوە. وەرگێڕاوی بەشی هەوەڵی لەژێر ناوی «ئینانا و ئیبە»دا لە ژێرەوە هاتووە، بەو هیوایەی بەشەکانی تریشی لە داهاتوودا بکەوێتە بەردەستی خوێنەران.

## ئینانا و ئیبه
## (INANNA AND EBIH)

ئین-نین-می-ئووش-ئا[11]

### * گازه

خاتوونی ولاتە ئاگرینەکان
داپۆشراو بە زرێی ترس
سوار چاکی جوانووی ئاگری سوور و بەتین
ئینانا
رمبی رەسەنی بە دەستەوە و
بە عەبایەکی بەسامەوە
وەک سێلاوێکی بە گرفە و هاوار و تووڕە
هەر ئەویشە لە ناوەندی گۆڕەپاندا رادەسێ و
مەتالێکی پتەو بە رووی زەویدا دەکێشێ.

خاتوونی مەزن ئینانا!
هەلاییسێنەری شەڕ
بکووژی دوژمن

ئەو کەسەی
بارانی تیری بەسەر دوژمندا دەبارێنێ
هێز و توانا
لە هەمبەر نەیارەکاندا پێک دەهێنێ
شێری گوڕیوی باخی بەهەشتە و
لەشەکان تێک دەهاڕێ و
رەگ و ریشە لەبن دێنێ
بەسەر سینگی عەرزدا

گایەکی یاخی
کە سمەکانی چاندووە لە زەمیندا و
تەیاری هەلمەتە بۆ سەر دوژمنان
شێرێکی ئاورین
نەوڕەس و بەلەسە
کە لەسەر برۆای خۆی سوورە.

### * ستایش بۆ ئەو

خاتوونی من
مندالی زێڕین. . . . . . . . . . . . پەروەردەی بەهەشت
ئینانا
کیژۆلەی زێڕین. . . پێگەیشتووی سەر گۆی زەوین
تۆ پێدەگەی
بە دوو باسکی ئاوەلاوە
لە دوو لاوە هەر وەک ددانەکانی پادشای خۆر

ئەوکاتەی کە زرێی ترس دەپۆشی لە بەهەشت
دەبیە بلوورێکی پڕشنگدار لەسەر رووی زەوی

ئەو کاتەی لێزگەی شاخەکان شی دەکەیەوە
دەبییە تۆڕێکی چندراو لە هەودای شین و ئاسمانی[12]
ئەو کاتەی کە لەئاو دەدەی
لە رووناکی جۆباری ناو کێوەکاندا
لەدایک دەبی لە کۆسارادا
لە تەلاری بلوورینی رەسەن و بێ خەوشدا

ئەو کاتە لە ئامێز دەگری
عەبا لە مێژینەکان
لەمێژینە خوداکان

ئەو کاتەی سەرەکان دەبڕی
وەکو داسێک
کە بەژنی بەرزی گەنمەکان دەدروێتەوە

پاشان سەر رەش(١٣)
ستایشت دەکا بە هۆنراوەکەیەوە
سۆمەریەکان وێکرا دەنگ هەڵدەبڕن
هەرکەس لەگەڵ هاژەی رووبارێک دەبێتە هاودەنگ

خاتوونی خەبات
یەکەم منداڵی خودای مانگ(١٤)
کیژۆڵە ئینانا
ستایشت دەکەم
ئەوەیە ساز و سترانی ئەمن

*ئینانا دەنگ هەڵدەبڕێ
من، خاتوون
گەڕۆکی ئاسمانەکان
رێبواری بێ وچانی سەر زەوین
لە رۆژهەڵات لە وڵاتەکانی ئێلەم(١٥) دەچەمێمەوە
لە رۆژئاوا —لەولاوەتر
بە دەوری وڵاتەکانی سوبیردا دەسووڕێمەوە و
لەولاتریش وڵاتەکانی لولوبۆ دەپێوم
هەڵمەت دەکەمە سەر کوێستان
هەر راست لە ناخی دڵیەوە

من، خاتوون
نزیک بوومەوە و
کۆسار نەترسا

من ئینانا

نزیک بوومەوە
کۆسار نەترسا
هاتمە نزیک شاخی ئیبە
شاخ رانەچەنی و
چەق و چۆ نەیگرت
بە دەنگی لەرزینی خۆی دانەڕما و
لمبۆزی بە عەرز تێک نەشکاو
لێوەکانیشی زەویندیان رانەمووسی

ئەو تازە پێگەیشتوانە(١٦) دەخەمە ژێر چنگی خۆم
گیانیان دەخەمە لەرزین و
وایان لێدەکەم سامی من بیان گرێ

گایەکی بەگوڕ
بە هەموو هێز و تواناییەوە تێک دەشکێنم
گوێلپارێکیش
بەو تۆزە توانایەی لە لەشیدایە

بە قامچی سەما پاشقولیان دەدەم(١٧) و
بە کەمەندی سەربزێوم وەخۆیان دێنمەوە
ئاوری شەڕ هەڵدایسێنم
تیردان و تیرم ئامادەن
لکەکانی قۆچەقانی تێک دەهاڵێنم و
نێزەی چێوی و
مەتاڵ و سەرنێزەم زاخاو دەدەم

لە سنووری دارستانەکانیان ئاور دادەگیرسێنم
بە تەور ملی دەرووندان دادەپاچم
بانگ دەهێڵمە خودای ئاور
گیبێلی بێ خەوش
هەتا گڕ بەرداتە لەش و شاخە زەبەللاحەکانیان

لە ئاراتا[١٨] شاری خۆمەوە
گەوهەری شاراوەی درەوشاوە
ترس دەخەمە گیانی گشت کۆسارەکان

وەک کاتی نەفرەت لێکراوی ئان[١٩]
ئیتر قەت ناڕوێنەوە و
لە چەشنی شوێنی وێرانی ئەنلیل[٢٠]
ئیتر قەت پشت ڕاست نەکەنەوە

ڕێگای من ستایش بکەن کۆسارەکان
هەر ڕاست من ستایش بکەن
بە سترانێک

## * ئینانا دەچێتە لای ئان

ئینانا
ڕۆڵەی خودای مانگ
گوڵێکی جوانی پێگەیشتوو
بە عەبای ژنانەیەوە
کە کەوتۆتە سەر بەلەکی ناسکی
وە سەر تەوێڵی هێوری کشاوە
تیشکێک لە بڵێسەی گڕ و تروسکەیەک لە سام
یاقیقێکی ڕووناکی
لە ڕەنگی خوێن بە ملیدا هەڵواسیوە

پاشان بە دەستیەوە گرتووە
گورزێکی حەوت سەر
ڕاوەستاوە لە هەیوانی لاوەتیدا و
گورزێکی بەردەوام بە دەستی ڕاستەوە

پێ دەنێتە سەر ماڵی زین،
بەڵێ پێی بچووکی
دەنێتە سەر پشتی بە تووک داپۆشراوی
گا کێوێکی ئاسمانی

هەر ئەویشە دادەمرکێنێ
سکڵی پڕ ورشەی ڕووناکی
لە ئاسمانی کووڕی ئێوارەدا
ئەستێرەی هەنگاوەکانی بەسەر ڕێگادا
ڕادەبرێ بە دەروازەی سەرگەردانیدا

دەچێتە دەرگای خوداوەند
تا میوە نۆبەرەکانی
بە دوعا و نزا پێشکەش ئەو بکات
ئان دەستەکانی گرتۆتەوە
میوەکان وەردەگرێ
بە خۆشی لە ئینانا دەگا و
لە کاتدا دەحەجمێ
کاتێک کە هی ئەوە و
بە جووڵەیەک ئینانا
لە لای دەستە ڕاستی دادەنیشێنێ

ئینانا وەقسە دێ:
ئان
باوکی من. [٢١]
ڕاوەستاو بی! سیلیم[٢٢]
قسەکانی من ببیستە
گوێ بۆ وتەی من ڕادێرە

ئان، وتەی تۆ
لە بەهەشتدا دەنگی داوەتەوە و
بە ترووسکەی سامی من ڕازاوەتەوە

ئان تۆ ئەو کەسەی
لە بەهەشت و لە سەر عەرز
زێتر لە هەر کەسێکی دی
قورسایی دەبەخشی یە وتەم
ئەوە تۆی کە
وڵاتێکی پان و بەرین
هەتاکوو سنووری بەهەشت[٢٣]
دەبەخشی یە تەورە ئاسنین و ساردەکەم

کەسێک کە کۆلکە زێڕینەکانی هەڵداوە
جوان، وەک خاتوونە بەشکۆکان
کاتی راوەستانم پێ دەنوێنێ
ئەو شوێنەی وا تەختەکەی من داندراوە
ئەو شوێنەی وا
وەکازەکەمی لە دەستە تامەزرۆکەم
داچەماندۆتەوە

من شان لە شانی مەترسی دەدەم
لەگەڵ شەش هاوسەنگەری بە زرێی شەڕ
داپۆشراو
رێی ئاسمان دەگرمە بەر
تا سنوورەکانی بەهەشت
وەک خاتوونێک دەچمە پێشێ و
فێنکایی مانگ لە مەمکۆڵەی ئاسمانەوە
دەبارێنم

تیرەکانم لە دەستی من دەرباز دەبن و
زەوین و دارستان و باغ
وەکوو ددانی ئەقاقیا تێک دەشکێنن
تیرەکان وەکوو شەنەی تیژ
زەوی سەربزێو رێک دەکەن

دەستەکانم لە چەشنی چنگی بایەقووش
کەللەکان لێک بڵاو دەکەن
وەک یەکەم مار[٢٤]
لە کۆساران دەردەکەوم
بەلەز هەر وەک ئەو مارانەی لە دێراوەکاندا
دەخزن
من کەللەکان تێک دەشکێنم

ئان:میری مەزن
ناوی ئەتۆ هاوڕێی منە
گوڵۆڵەی کەتانێکم کردۆتەوە و رایەڵم کردووە
هەتاکوو کۆتایی زەوین
چاوم شوێن بە شوێن زەوی دەدۆزێ
من دەزانم درێژایی زەمین چەندە
تێپەڕیوم بەرێی بێ خەوشی بەهەشتدا
قووڵایی ئەوێش دەزانم
تەنانەت تۆ ئینۆنای چلەکێش[٢٥]
کە لە سامی مندا شەکاوەی
گوێم بدەیە
من خاتوونی مەزن
نزیک بوومەوە و شاخەکان رانەچەنین

من ئینانا
نزیک بوومەوە
کۆسار نەترسا
هاتمە نزیک شاخی ئیبە
شاخ رانەچەنی و
چەق و چۆ نەیگرت
بە دەنگی لەرزینی خۆی دانەڕما و
لمبۆزی بە عەرز تێک نەشکاو
لێوەکانیشی زەویندیان رانەمووسی

ئەو تازە پێگەیشتوانە دەخەمە ژێر چنگی خۆم
گیانیان دەخەمە لەرزین و
وایان لێدەکەم سامی من بیان گرێ

گایەکی بەگوڕ
بە هەموو هێز و توانایەوە تێک دەشکێنم
گوێلپارێکیش
بەو تۆزە توانایەی لە لەشیدایە

بە قامچی سەما پاشقولیان دەدەم و
بە کەمەندی سەربزێوم وەخۆیان دێنمەوە
ئاوری شەڕ هەڵدایسێنم
تیردان و تیرم ئامادەن
لکەکانی قۆچەقانی تێک دەهاڵێنم و
نێزەی چێوی و
مەتاڵ و سەرنێزەم زاخاو دەدەم

لە سنووری دارستانەکانیان ئاور دادەگیرسێنم
بە تەور ملی دەروونداں دادەپاچم
بانگ دەهێڵمە خودای ئاور
گیبێلی بێ خەوش
هەتا گڕ بەرداتە لەش و شاخە زەبەللاحەکانیان

لە ئاراتا شاری خۆمەوە
گەوهەری شاراوەی درەوشاوە
ترس دەخەمە گیانی گشت کۆسارەکان

وەک کاتی نەفرەت لێکراوی ئان
ئیتر قەت ناڕوێنەوە و
لە چەشنی شوێنی وێرانی ئەنلیل
ئیتر قەت پشت راست ناکەنەوە

ڕێگای من ستایش بکەن کۆسارەکان
هەر راست من ستایش بکەن
بە سترانێک

ئان
پادشای هەموو خوداکان
وەڵامی دەداتەوە
ئازیزەکەم!
ڕۆڵەی شیرین!
تۆ کۆسارت دەوێ
ناخی دڵی
ئاوات وەڵام دەداتەوە
هۆ خاتوونی مەزن
شاخی ئیبە
تۆ خۆت ویستت
تۆ خۆت حەستەم ترینیانت هەڵبژارد
ئە ئاوای بە ئینانا وت:
خوداکان
لە شوێنی خۆیان راوەستاون
لە ترسان سوژدەیان بۆ ئیبە برد
ئینۆنا
لە تافی پیرۆزی خۆیدا دانیشتوو
خەمین و لەرزۆک
بە لەشێکی نەشتەر ئاژن کراوەوە

سامێکی سووری ئاگرین
هەموو نیشتمانی ئێمە گۆج دەکا
سامێکی ئاگرین لە کۆسارەکانی ئیبە را
قین دەخولڤێنێ لە وڵاتەکانی چوار دەورمان

ترۆپکی شاخی ئیبە
گومبەزی شینی بەرەو قەراغێک رادا

دارەکان
بە بەروبوویەکی زۆرەوە، گەیشتوو
لە دامێنیدا سەربەرزانە وەستاون

توێژ توێژ گەڵای ئەستوور
بە دارە چڕ و پڕەکانیەوە
ئاسمان تاریک دادەگێڕن

شێرەکان جووت جووت
دێن و دەچن لەژێر نسێی ئەو لقانەی
پەنجە لە ئاسمان دەسوون
بەرانە کێوی بە خوری نەرم و نۆڵەوە
بزنە کێوی چاو کراوە
بێ شوان لێر و لەوێ، بەرەڵڵای سەر تەپۆڵکەکان
گا کێوی لە هات و چۆدا
پێیان ناوەتە سەر پەرەمووچی کەروێشکەی سەوزەڵانی

بزنێک بە جووتێک شاخی چەماوە
لە ژێر دارە سەروە کۆسارییەکان
لە جووتەکەی خۆی دەگەڕێ

من یەکەم زەبری سامم
بەسەر شکۆی بێ کۆتایاندا
من، وێڕای تۆ ناچمە ئەوێ
هۆ کیژۆڵە ئیدنانا
من سەر لە پێناوی تۆ نانێم
لە هەمبەر ترووسکەی ئاگرینی کۆسار
ئان ئاوا لەگەڵی دەدوێ

ئیدنانا! پێش وێژ
سۆفیلکەی پێش وێژی بەدشووم!
دڵی دەکەوێتە چنگی قینەوە
بە زەبری پاژنەکانی
ئیدنانا لە پڕێکدا
دەڕوازەی ماڵی شەڕ دەخاتە سەر پشت
بە دەستەکانی ئاڵقەڕێز
لە دەرگای شینی دەردێنێ
بە هەڵڵا و بگرەوە-شێتی یەکی دەرباز بوو لە ماڵی کەوان
شەڕی شێتانەی خۆی دادەبارێنێ
لە نێوان باسکەکانیدا باهۆز هەڵدەسوورێنێ
ئەوسا بۆ عەردی دەنێرێ

ئافرەت ژێی ناسک دەکێشێ
تیرە بێ هەڵەکان-تەیاری هاوێژران

باهۆزەکانیش
زەوی تێکەوە دەپێچن. لوول دەخۆن ، نەشتەر دەبارێنن و
هەڵدەفڕن لەگەڵ ئیدنانا
عەردی پان و بەرین
لە کەش و هەوای خۆش دا هەڵدەمژنە ناخیانەوە
تەپ وتۆز ڕێگە بە پیلوو هەناسە دەگرێ و
وێڕای وردەبەردی شکاو و وردە خیزی سوور بۆوە
لە گەڵ خۆڵەمێش دەسوورێتەوە و رادەبرێ
خاتوونی مەزنی من کێوەکە تێک دەشکێنێ
پانێی بە تەختی عەرزی دا دەکوتێ و
دەمی خەنجەر لە هەسانی بەردەکان دەسوێ
ئەستۆی ئیبەی توند گرتووە
هەر وەک باقەیەک حەیزەران

هەوا تیژ تێپەڕ
بە ناسکە گریانێکی ورد
درز دەخاتە دڵی بێ هێزی ئیبەوە
بە بەردی دامێنی شاخ
ئینانا تێک دەهاڕێ، مست دەهاوێ
پێک دادەدا و لێک هەڵدەبڕێ
تۆفانی ڕەوەزەکان
خاڵیگەی شاخ لێک هەڵدەدڕێ

مارەکان خەمۆک و تێک هاڵاو
بە لقەکانەوە هەڵواسراو
لە سەر ئەمری بە سامی ئینانا درۆشە دەردێنن
ژاری کوشندەی خۆیان دادەبارێنن
زمانی ژاراوی ئیناناش
وەک گیایەکی سیس کەری نەفرەت لێکراو
بە دەوران دەوری دارە پڕ بەرەکان و
دارستانە سەوزەکاندا لوول دەخوا

ئینانا بێ بەزەیی
هەناسەی داغ و ویشکی خۆی دەبزوێنێ
بەسەر هەڵاڵەی ڕووەک و گیای شلکدا
تۆز و خۆڵی وشکیش زۆر بێ بەزەییانە
وەک گژەبایەک بەسەر لاسکی قەوزە گرتوودا
دەبارێنێ
تا بەڵکو دوامین دڵۆپەی شەونمیش لەبن بێنێ

بەسەر مێرگە سیس هەڵگەڕاوەکاندا
هەر تۆفانی ئاگرە دەبارێ
بڵێسە ئاسمان بە بەژنی ڕەوەز دەبڕێ
سەمای قامەتی بڵێسە دووکەڵ بە وڵات وەردەکا
تروسکەی خاتوونی مەزن لە ساتێکدا هەموو
وڵات دادەگرێ
ئینانای پیرۆز
نوێ ڕوخساری نەترس
بە هێز وێنەی سەرکردەیەکی چوار شانە و لاو
لە شەڕێکدا کۆسار بە چۆکدا دەهێنێ و
سەرکەوتوو لە جێگای خۆیدا رادەوەستێ
کۆسار! ئینانا دەگری
ئیبە!
چونکە تۆ بالآت کرد و قەدت کێشا
چونکە تۆ ئاوەها بەرز راوەستای
بە کەپەنکێکی ئاوا جوانەوە
خوێن شیرین و سەوز و لەخۆبایی
عەبای میریی بە شانەوە و
ئامێزت کراوە بە رووی ئاندا
لمبۆز لە عەرزی مەخشێنە و
لێوت لە عەرزی مەسوو
من ئەتۆم کوشت
من بە پەژارەوە هەڵمەتم کردە دڵت

تۆ ئەی فیلی بە تاقەت
لووتی بەرزت بادەدەم
ئەی گا کێوی بە شان و باهۆ
ملت دەشکێنم

دوو شاخی ئەستوورت دەگرم
تووڕت دەدەمە ناو تەپ و تۆزەوە
بە قینەوە پێت ڕێ دەخەم
هەتا فرمێسک ڕوخسارت بخووسێنێ و
پەژارە دڵت داگیر کا
ئینانا
سەرکەوتووی بەسام
دیسان زمانت بگەڕێ

کێو، کوێستان
باوکە ئیبە ئیزنم بدە
هەتاکوو گورزی سامناکم
بە دەستی راستی بەهێزمەوە بگرم و
بە دەستی چەپ تەورەکەشم هەڵسووڕێنم
تەور و گورز بە قەستی بڕین هەڵدەدڕن
وەکوو نووکی تیژی شەنە

ئینانا پەرەستگەی سەرکەوتنی خۆی چێ دەکا

بەرد لەسەر بەرد
پەرەستگە ساز دەکەم
تا هەرێمی حوکماتی خۆم دیاری بکەم
بەرد لەسەر بەرد
بە گەورەیی و شکۆوە تەواوی دەکەم
لەسەر تەختی گاشەبەردێک قورس و قایم
رادەوەستێ و
تافی دانیشتن دەڕازێنێتەوە
کورگارایەک[٢٦] بۆ گازە کردن بانگ بێڵە
ئامرازی پیرۆز، گورز و خەنجەری پێ ببەخشە
گالایەک[٢٦] بانگ کە
سەردوولکە وێژێکی سەر شین
ئامرازەکانی ستایش
تەپڵ و تەمبوورەی بدەیە

بانگ کە خزمەتکارە پیرۆزەکان
بۆ رێ و رەسمی وەرگەڕانی تەخت و بەخت
کاهین دەبێتە ژن و
کاهینەش دەبێتە پیاو

من ئەو پەرەستگە بەشکۆیە ساز دەکەم
ئەو کەسەی کە توانی هەڵمەت بکاتە کێوەکان
ئەو کەسەی ئێستە سەرکەوتوو راوەستاوە
ئاوهەڵدێر، لافاوێکی بە لرفە
من مێرگەکانم شۆردەوە
بە شەپۆلی توندی بەلەز
پەرژینەکانیشم بەتاڵان برد
کۆسارەکان!
من سەرکەوتووم
ئیبە!
من سەرکەوتووم
یەکەم کیژی مانگ
کە ئیبەت تەفر و توونا کرد

ئینانای کیژۆڵە
ستایش بکرێ!
(وە) ستایش(هەر شایانی) نیسابایە
کەخاتوو خودای نووسینە.

## پەراوێزەکان:

١- ئەو شیعرە لەو کتێبەی ژێرەوە وەرگیراوە:

Inana:lady of larjest heart,poems of the Sumerian haigh priestess enhedunna,translated by betty de shong meador,university of texas press,austin1988.

٢-یوونی لە زمانی سانسکریتدا بە ئەندامی مێوینەی ژن دەڵێن، هەروەها لە ئایینە هیندوەکاندا وشەیەکی پیرۆزە.

٣-وێکچوونی ئاناهیتا و ئینانا لەلایەن زۆربەی مێژوونووسانەوە سەلمێندراوە. بۆ وێنە هیرۆدۆت دەڵێ: ئێرانییەکان ستایشی ئورانیا (urania)لە ئاشووریی و عەرەبەکانەوە فێر بوون. برۆسووسیش کە مێژوونووسێکی کەلدانی سێ سەدە بەر لە زایینە دەنووسێ: ئەردەشیری دووهەمی هەخامەنیشی پەیکەرەی ئافرۆدیتی لە بابێل و شووش و هەمەدان و دیمەشق و سارد دامەزراند و ستایشکردنی ئەوی فێری خەڵکی رۆژئاوا و باشوور کرد. (یەشتەکان، ئیبراهیم پووورداوود، ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەساتیر، بەرگی یەکەم، لاپەڕەی ٦٤-١٦٣)

٤-شانامەی فیردەوسی، چاپی مۆسکۆ، بەرگی دووهەم، لاپەڕەی ١٧٤ و٦٢

٥-نیزامی گەنجەوی، ئیقبالّنامە، ناوەندی نیگاە، لاپەڕەی١٣٢٣

٦-ابوریحان بیرونی، "التفهیم"، نشر هما، ١٣٦٧، ل١٩٨، آثار الباقیه ل٤٥٧

٧-تەمووز لە ئووستوورەی ئینانا دا مێردی ئەوە و ئینانا لە ئەنجام دا ئەو بە جێی خۆی بۆ ماوەی شەش مانگ لە ساڵ دا دەنێرێتە جیهانی تاریکییەوە. دێهخودا لەژێر وشەی تەموزدا ئاوای نووسیوە: لە زمانی بابێلیدا خوداوەندی بەهار و یار و هاودەم یان تەنانەت مێردی ئینانا خاتووخوای زاوزێ و بەروبوو بوو. هەر ئەو ناوەشە کە لە ناوی مانگە سووریانییەکاندا هەیە. تەمووز ناوی هەوەڵ مانگی هاوین و مانگی دەهەم لە ساڵی رۆمی و سووریانییەکانە کە لە نێوان حوزەیران و ئاب(ژوون و ئووت)دایە. بۆ وێنە:

که زنده است آن خرد کودک هنوز

و یا شد ز سرما و مهر تموز

٨٨-بڕوانە:مهرداد بهار، از اسطوره تا تاریخ، وتاری "سوگ سیاوش" ١٣٧٩، ل ٤٥٩-٤٦٩

٩-عیسا بە هەناسەی خۆی ئەلعازێر زیندوو دەکاتەوە و بەم جۆرە ئەو لە جیهانی مردووەکان دەگەڕێنێتەوە.

١٠-ئەو دوو کەسایەتیە ئوستوورەییەی چاخەکانی ناوەڕاستیش بە مەرگ و نەمانەوەی خۆیان لە جیهانی مردووەکان، لەگەڵ کۆتایی هاتنی وەرزی سارد و دەستپێکی وەرزی گەرما پێوەندییەکی راستەوخۆی هەیە. تی ئێس ئیلیووت لە شیعری بەرزو بەناوبانگی خۆی واتە "وڵاتی قاقڕ"دا لەناوی ئەو کەسایەتییە کەڵکی وەرگرتووە.

١١-ئەوە یەکەم میسراعی شیعرەکەیە و سەردێڕی بە ناوبانگی شیعرەکە لەلای سوومێرییەکان ماناکەی ئاوایە: خاتوونی هەرێمی درەوشاوەکان. ئینانا و ئیبە ناوێکی نوێیە کە زۆربەی سومێرناسان بۆ ئەم شیعرەیان داناوە.

١٢-تۆڕی شین(sa-za-gin)سەرگین، پێوەندی هەیە بە تۆڕی مەزن واتە سە، شوش، گال(sa-sus-gal) ئامرازێکی شەڕە کە بەپێی بڕوای هال پێوەندی بە تووڕەیی خوداکانەوە هەیە.

١٣-سومێرییەکان بەو ناوە ناسرابوون.

١٤-ئینانا خوشکە گەورەی خودای خۆر واتە"ئۆتۆ"یە.

١٥-ئیلەم، سووبیر و لۆلۆبۆ ئەو وڵاتانە بوون کە لەژێر دەستەڵاتی سارگۆن(یەکەم ئیمپڕاتووری نێوان چۆمان) دابوون.

١٦-وێدەچێ مەبەست لە زاراوەی تازە پێگەیشتوو شاخێک بی کە تازە روواوە. لە دەقە کەونارایییەکاندا زۆر باسی رووانی شاخەکان کراوە.

١٧-قەمچی پیرۆزی ئینانا بەشێک لە یاری یان سەمایەکە کە لە جێژنەکانی ئەودا بەڕێوەچووە.

١٨-ئاراتا شارێکی بە ناوبانگی کوێستانی بووە لە ئێرانی کەونارادا کە خەڵکەکەی لە پەرەستگەی سومەرییەکاندا عیبادەتیان کردووە و بنەما ئایینی یەکانی ئینانایان هەبووە. ئاراتا لەبەر کۆیلە و پیشەسازییەکەی بەناوبانگ بووە.

١٩- بەپێی زانیاری کتێبێ(شناخت هویت زن ایرانی، مهرانگیزکار و شهلا لاهیجی) ئان خودای ئاسمانە.

٢٠- بەپێی زانیاری کتێبێ(شناخت هویت زن ایرانی، مهرانگیزکار و شهلا لاهیجی) ئینلیل کوڕی ئان و ئیمپڕاتووری خوداکانی سەرزەوییە. لە هەندێ سەرچاوەشدا بە واتای خودای هەوا هاتووە.

٢١-زاراوەیەکە بۆ رێزگرتن لە گەورە پیاوان.

٢٢-لە دەقەکەدا سیلیم هاتووە و وەرگێڕ بڕوای وایە کە وشەیەکی سۆمەرییە و بۆی هەیە هەر وشەی سەلامی عەرەبی بێت.

٢٣- ئەم کۆپلەیە وێکچوونی هەیە لەگەڵ چیرۆکی رۆیشتنی کاووس بۆ ئاسمان کە لە "بندهش و دینکرد"دا هاتووە.

٢٤-موش، سگ، کل(mus-sag-kal) بوونەوەرێکی ئووستوورەییە بە مانای ماری یەکەم یان یەکەم جۆری مارە

٢٥-"ئینۆ"ناکان راوێژکاری خوداکانن. لە سۆمەریدا ناوی ئەوان (an-nun-ke) ئان-نون-کێ، کە بە واتای ئاو یان تۆمی شازادەیە و بۆی هەیە لە وشەی(a-nun-ke) ئا-نوون-کێ یان ئینکی را هاتبێ کە خودای ئاوە شیرنەکان و خودای ئارەزوویە و ئەو کەسەیە کە بەپێی ئوستوورەیەک ئاوەکانی دیجلە و فوڕات لە تۆوی ئەو را سەرچاوەیان گرتووە.

٢٦-کوورگارا و گالا، دوو کاهینن کە نێرمایی یان جسنی دیاریکراویان نییە.

## سەرچاوەکانی وەرگێڕان:

١-هنرمند، سعید، کهن ترین شعر دنیا، اینانا بانوی بزرگترین قلب، مجله بخارا، بی تا.

٢-مومنی، خورشید، میان رودان، تمدن سومری و کهن ترین شعر گیتی، مجله چیستا ٢١٤.



# نامە بۆ میلنا

فرانز کافکا
لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**مران - ئەپریل و مەی 1920**

خاتوو میلنای ئازیز. پێش هەر شتێک من داوات لێ ناکەم لە توێی دێڕەکانی ئەم نامەیەدا بۆ شتێکی قووڵتر بگەڕێیت. بەم مەرجەوە ئەم نامەیە بخوێنەرەوە. نزیکەی چواردە ڕۆژە من بەردەوام ئازاری بێخەوی دەچێژم.

لە ڕاستیدا ئەم بێ خەویە زۆر بە جیدی وەرناگرم: ئەم ماوەی بێ خەویە دێت و دەڕوات و هەمیشە هۆکارەکانی زیاد لە هۆکارە ڕاستەقینەکانن. سەیر ئەوەیە (کارل بادکار) ئەمە بە هۆکاری کەش و هەوای مران دادەنێت. ئەم هۆکارانە کە زەحمەتە دیاری بکرێن، هەرچییەکن با هەبن. بەڵام بەرئەنجامیان وایە کە مرۆڤ وەک کۆتەرە دارێکی قورس و بێ جووڵە، لە هەمان کاتیشدا وەک ئاژەڵێکی لێ بەسەر دێت کە لە ناو لانەکەیدا ئۆقرە نەگرێت و ئارامی لێ هەڵگیرا بێت. وەلێ لە لایەنێکی ترەوە من شاد و قایلم، تۆ بە ئارامیی نووستویت و سەیرە کە دوێنێ سەرەڕای بێزاریەکەت هێشتا ئاسوودە خەوتوویت. کە شەوانە خەو بەلامدا تێدەپەڕێ و گوێم پێ نادات، ئیدی دەزانم بە کوێدا دەڕوات و من ئاشنای ئەو ڕێگایەم و خۆم بە دەستیەوە دەدەم. بە هەرحاڵ ململانێ کردن لەگەڵ خەو کارێکی گەوجانەیە. نووستوو پاکژترین بوونەوەرەو مرۆڤی بێ خەو گوناهبارترین کەسە. تۆ لە دوا نامەتدا سوپاسی ئەو مرۆڤە بێ خەوەت کردووە. ئەگەر کەسێکی نەناس و بێ ئاگا لە مەسەلەکان بیخوێنێتەوە، بێگومان وا بیر دەکاتەوە کە «ئەمە چ جۆرە مرۆڤێکە، بەم حاڵەوە

وا پێ دەچێت کەژەوانی کردبێت» لە ڕاستیا ئەو چ کارێکی ئەنجام نەداوە، تەنانەت پەنجەیەکی نەجوولاندوە (مەگەر بۆ نووسین) خواردنی شیرەو خۆراکی باشە، بێ ئەوەی هەمیشە لە بەردەمیدا سێوو چا ببینێت (ئەگەر چی زۆر جار دەیبینێت) بێجگە لەوە داویەتە دەست ڕێکەوت چی دەبێ بابێ و چیاکان هەر لەو شوێنەدان کە بوون. ئایا چیرۆکی یەکەمین سەرکەوتنی دۆستۆیفسکی دەزانیت؟ ڕووداوێکە دەتوانیت بەسەر گەلێک کاری تردا بیگشتێنیت. من ئەم ناوە گەورەیە هەر بۆ خۆشی باس دەکەم ئەگینا لە مەیدانی کاردا، لەوانەیە بەسەرهاتێک کە لە دراوسێیەتی تۆ یان تەنانەت لەوە نزیکتر روودەدات هەمان مانا بگەیەنێت. هەروەها من ئەم رووداوە و بەتایبەتی ناوی کاراکتەرەکانی زۆر بە لێلی بزانم. دۆستۆیفسکی کاتێک سەرقالی نووسینی چیرۆکی (خەڵکانی هەژار) بوو، لەگەڵ یەکێک لە هاوڕێ ئەدەب دۆستەکانیدا بە ناوی گریگوریو دەژیا. هەرچەندە چەند مانگێک بوو گریگوریو نووسینی زۆری ئەوی لەسەر مێزەکە دەبینی، بەڵام تەنیا ئەو کاتە دەست نووسەکەی وەرگرت کە چیرۆکەکە کۆتایی هاتبوو. کە چیرۆکەکەی خوێندەوە شاگەشکە بوو، بێ ئەوەی بە دۆستویفسکی بڵێت بردی بۆ لای رەخنەگری بەناوبانگ نیکراسۆ. سەعات سێی سەر لە بەیانی رۆژی دوایی زەنگی ماڵەکەی دۆستویفسکی لێ دەدات «گریگوریو و نیکراسو» هەردوکیان بە پرتا و بۆ ناو ژوورەکە دێن، دۆستوێفسکی لە ئامێز دەگرن و ماچی دەکەن. نیکراسو کە یەکەمجاریەتی دوستۆیفسکی دەبینێت، بە ئومێدی ڕوسیای ناوزەد دەکات، ئەوان یەک دوو سەعات زیاتر بە باسی چیرۆکەکەوە بەسەر دەبەن و لە بەرەبەیاندا ماڵئاوایی لێ دەکەن و دەڕۆن. هەمیشە دۆستۆیفسکی ئەو شەوەی بە بەختەوەرترین شەوی ژیانی خۆی داناوە کە بەسەر پەنجەرەکەدا دەچەمێتەوەو لە دواوە تەماشای ئەو دوانە دەکات، لە کاتێکدا کە تەواو لە خۆی بێ ئاگایە دەست بە گریان دەکات. هەستی قووڵی ئەو لەو شەوەدا، وەک خۆی باسی کردووە — نازانم لە کوێدا — بەم شێوەیەیە: «چ مرۆڤگەلێکی جوامێر، ئەم مرۆڤانە چەندە شەریف و خانەدان و من چەندە نزم و عەوامم. گەر بیانتوانیایە ناخی من بخوێننەوە، ئەگەر پێم بوتنایە کە من کێم ئایا بڕوایان پێ دەکردم» ئەوەی کە پاشان دۆستۆیفسکی کەوتە ململانێ لەگەڵ ئەو دوو کەسەدا تەنیا خوێی چێشتەو ئیتر پەیوەندی بە چیرۆکەکەی منەوە نیە کە لە تەواوبووندایە.

خاتوو میلنای ئازیز، ئایا تۆ ئەو نهێنیەی لەم چیرۆکەدایە و توانای تێگەیشتنی ئێمە ناتوانێت بەدەستی بهێنێت دەبینیت؟ بە بڕوای من نهێنیە شاراوەکە لەم چیرۆکەدا ئەمەیە. ئەگەر مرۆڤ بە دیدێکی گشتی و هەمەلایەنەوە بتوانێت تەماشای مەسەلەکە بکات گریگوریو و نیکراسو لە دۆستۆیفسکی بە شەریفتر دانانێت. بەڵام ئەگەر ئەم ڕوانینەن و بۆچوونە (کە لەو شەوەدا دۆستۆیفسکیش حەزی پێ نەبوەو، بێجگە لەوە یەک نموونەیش بەشی سەلماندنی ناکات) ئەگەر واز لەو روانینە هەمەلایەنە بێنیت و تەنیا گوێ لە دۆستۆیفسکی بگریت کە چی وتوە، لەم حاڵەتەدا ناچاریت گریگوریوو نیکراسو بە جوامێر دابنێیت و دۆستۆیفسکی بە سووک و ڕسوا لە قەڵەم بدەیت. هەڵبەت هەرگیز بە تۆزی پێشیاندا ناگات، چ جای ئەوەی بتوانێت وەڵامی ئەو ڕێز و میهرەبانیە

گەورەو نەشیاوەبێت کە ئەو شەوە ئەوان خەڵاتیان کرد. دەتوانێت لە پەنجەرەوە ئەو دوو مرۆڤە خانەدانە ببینێت کە لە دوورەوە ون دەبن و بەم شێوەیە دوورە دەستی خۆیان بیر دەهێننەوە.

بە داخەوە ناوی گەورەی دۆستۆیفسکی سێبەر بەسەر مانای ئەم رووداوەدا دەکات. چاوت لێیە بێ خەویی بەرەو کوێی بردووم؟ بێگومان بەرەو هیچ، یانی بۆ ئەو جێگایەی کە ئیدی ناتوانیت بە چاکی مەبەستەکەت بگەیەنیت.

**-فرانتز کافکا-**

**مران مەی 1920**

خاتوو میلنای ئازیز: چەند قسەیەک بە کورتی، لەوانەیە بەیانی دیسانەوە نامە بنووسم. ئەمڕۆ تەنیا لەبەرخۆم دەینووسم، تەنیا بۆ ئەوەی کارێکم بۆ خۆم ئەنجام دابێت. تەنیا بۆ ئەوەی کەمێک لە کاریگەریی نامەکەت لەسەر خۆم کەم بکەمەوە، ئەگینا ئەو کاریگەرییە شەوو ڕۆژ لە کۆڵم نابێتەوە. تۆ زۆر شتێکی سەیریت میلنا خانم، لەوێ، لە ڤیەنا دەژیت، ناچاریت ناخۆشیی ئەم و ئەو هەڵبگریت و لە هەمان کاتدا ئەمەندە کات بۆ خۆت پەیدا دەکەیت تا یەکێکی تر، بە تایبەتی بابڵێین من کە حاڵی چاک نیە و هەموو شەوێکی لە شەوی ڕابووردوو خراپتر دەنوێت، ببێتە جێی سەر سووڕمانی تۆ. من لێرە سێ کچی هاوڕێم هەن (هەرە گەورەکەیان تەمەنی پێنج ساڵانە) ئەمان لەم ڕووەوە بۆچوونی ماقووڵتریان هەیە. ئەمان بۆ بچووکترین دەرفەت دەگەڕێن لە ئاوم نێن. گرنگ نیە لەو نزیکانە رووبار هەبێت یان نا. هەڵبەت ئەم کارەی ئەوان بە هیچ جۆرێک لەبەر ئەوە نیە کە من زیانێکم بەوان گەیاندبێت. ئەگەر گەورەکان بەم شێوەیە هەڕەشە لە منداڵ بکەن، ئەوا کارەکەیان لای منداڵان بە گاڵتە و خۆشیی دەشکێتەوە. پوختەی مەبەستی ئەوان ئەوەیە کە «ئەمە تەنیا گاڵتەیەکە، خراپ نیە هەندێک جار قسە لەسەر شتی مەحاڵ بکەین» بەڵام منداڵ جیدین و ئاگاداری مەحاڵ نین. ئەگەر دەجار لە خستنی شتێک سەرکەوتوو نەبن، گوێ بەوە نادەن کە جارێکی تریش هەوڵەکەیان بێ ئەنجام دەبێت. لە ڕاستیا ئەوان هەرگیز ئەوە بە هەند وەرناگرن کە پێشتر دەجار کارەکەیان بێ ئەنجام بوە. ئەگەر لە ڕوانگەی زانینی بە تەمەنەکانەوە لە گوفتار و مەبەستی منداڵان بڕوانین، ئەوا منداڵ بوونەوەرێکی سەیر و نائاسایی دێنە بەر چاو. کاتێک منداڵێکی چوار ساڵان (کەوا دەردەکەوێت تەنیا بۆ ئەوە بژی لە باوەشی بگرن و ماچی بکەن — هەرچەندە ئەمە بۆ ورچۆکەیەکیش زۆرە و تا ڕادەیەک هێشتا ورگە زلەکەی قۆناغی زاینی ماوە–) پەلاماری کەسێک دەدات و، دوو خوشکەکەیشی لە چەپ و راست و پێشەوە یارمەتی دەدەن و، لە پشت سەری تۆیشەوە هیچ شتێک نیە بێجگە لە تارمی و باوک و دایکی میهرەبان، جوان و گۆشتن کە بێ مەبەستی کۆمەک کردن لە پاڵ گالێسکەی چوارساڵەی منداڵەکەیاندا لە دوورەوە لەم دیمەنە دەڕوانن و پێدەکەنن. تۆ

لە کاتی وادا ئیدی چەک کراویت و زەحمەتە بتوانیت بڵێیت چۆن لە دەستیان ڕزگارت بووە. منداڵە ئاقڵەکان یان خەیاڵاویەکان بێ هیچ پاساوێکی تایبەتی هەوڵی ئەوەیان دا سەر نگونم بکەن. ڕەنگە لەبەرئەوەبێت کە من لە ڕوانگەی ئەواندا بوونەوەرێکی زیادم و تازە ئەوان لە نامەی نێوان من و تۆیش بێ ئاگا بوون.

**مران- مەی ـ 1920**

رستەی (ئیدی لە توانادا نیە بە چاکی مەبەستی خۆت دەرببڕیت) کە لە دوانامەمدا نووسیومە نابێت بێزارت بکات. ئەم وتەیە لە کاتی تەواو بێ خەویدا وتراوە. ئەو کاتانەی زۆریش دەگمەن نین. خەریکبوو چیرۆکەکەم تەواو دەکرد. لە کاتی نووسینی ئەم چیرۆکەدا زۆر جار بیرکردنەوە لە تۆ ئەوکی دەگرتم. کە چیرۆکەکەم بەرەو کۆتایی دەچوو لاجانگی چەپ و ڕاستم لە کێشمەکێشێکدا بوون بەڕاستیی چاک لە بیرم نیە کە بۆچی ئەو رستەیەم نووسیوە. بێ لەوە، کۆمەڵێک چەمکی فۆرمەلە نەکراوم لە مێشکا بوو دەمویست لە دەرەوە، لە باڵکۆنەکەو لەسەر کورسیە سەفەریەکەدا لەگەڵ تۆدا باسی بکەم، بۆیە لەوێ کە نەمدەتوانی کارەکە بکەم نەیشم توانی ڕووبەڕووی ئەو هەستە قووڵەی خۆم ببمەوە تەنانەت ئێستایش لەوە زیاتر ناتوانم بکەم.

تۆ هەموو بەرهەمە بڵاوکراوەکانی منت هەیە، بێجگە لە دوا کتێبم (پزیشکی لادێ) ئەم کتێبە کۆمەڵە چیرۆکێکی کورتە کە وڵف بۆت دەنێرێت، من هەفتەیەک لەمەوبەر نامەیەکم لەو بارەیەوە بۆ ناردووە. هیچ لە ژێر چاپدا نیە. چی حەز لێ دەکەیت بە کتێب و وەرگێڕانەکانی بکە. هەر کارێک لەو لایەنەوە بکەیت پەسەندە. جێی داخە لە دیدی منەوە ئەم بەرهەمانە هێند بەهادار نین تا دەستنیشان کردنیان لەلایەن منەوە بەڕاستیی بتوانێت بە مانای ڕاپەرموونی من بێت لە تۆ. لەلایەکی ترەوە دڵخۆش دەبم ئەگەر بتوانم چەند وشەیەکی بچووک لەبارەی چیرۆکی (تونچی)یەوە بڵێم کە تۆ حەز بە زانینی دەکەیت. مرۆڤێک بیەوێت بە بەرچاو رونیەوە ژیانی بەسەر بکاتەوە و پیایدا بچێتەوە، ئەمە خولیایەکە دەبێت سزای دۆزەخی بۆ بچێژێت. خراپترین ئەو پێداچوونەوەیە هۆشیاریی نیە بە کارە خراپەکان کە بە ئاشکرا کراون، بەڵکو لەو کردارانەیە کە لە قۆناغێکدا بە چاکمان زانیون.

هەرچۆنێک بێت نووسین بۆ حاڵی مرۆڤ کارێکی چاکە. من لە پێش دوو سەعاتدا، ئەو کاتەی لە باڵکۆنەکەداو لەسەر کورسیە سەفەریەکەم دانیشتبووم و نامەکەی تۆم بەدەستەوە بوو ئێستا هێورترم. کە لەوێ پاڵ کەوتبووم، لەبەردەمما و بە دووری هەنگاوێک قالۆنچەیەک بە پشتا کەوتبوو، نائومێد بوو. توانای هەستانەوەی نەبوو، حەزم کرد کۆمەکی بکەم، ئەمە کارێکی زۆر ئاسان بوو، بە هەنگاوێک و پەلەپیتکەیەکی سووک کارەکە دەکرا، بەڵام نامەکەی تۆ ئەوەی لەبیر بردمەوە و ئیتر نەمتوانی هەستم. تەنیا مارمێلکەیەک دووبارە منی لە ژیانی دەوروبەرم بەئاگا هێنایەوە.

مارمێلکەکە رێک بەو شوێنەدا تێدەپەڕی کە پێشتر قالۆنچەکەی تیا کەوتبوو. من بە خۆمم وت ئەم دیمەنە رێکەوت نیە، بەڵکو حاڵەتی گیانەلاو شانۆی تەماشاکردنی مەرگی سروشتیی گیاندارێکە. بەلام کە مارمێلکەکە بەسەر قالۆنچەکەدا خزا، قالۆنچەکە، لەسەر نخوونیەوە هەڵگەڕایەوە و ئاسایی کەوتەوە سەردەم. لەگەڵ ئەوەشدا قالۆنچەکە کە ماوەیەک هەروەک مردوو بێ جووڵە بوو. لەپڕێکدا بە جۆرێک بە دیوارەکەدا هەڵگەڕا وەک هیچ رووی نەدابێت وابوو. ئەم ڕووداوە تا ڕادەیەک دووبارە هێزی تێگەڕاندمەوە. هەستام. کەمێک شیرم خوارد و نامەیەکیشم بۆ تۆ نووسی.

**-فرانتز کافکاکەت-**

لەبارەی لێکدانەوەکەوە[1] ئەوە بهێڵەرەوە بۆ بەیانی، پێدەچێت کورت و پوخت بێت و هیچی وای نەوێت. وەرگێرانەکەی تۆ لای من زۆر ڕوون و دروستە (کاتێک سەرچاوەی ئەم دادوەریە شەخسی خۆم بم) دروستی و دەست پاکی وەرگێڕانەکەت مایەی سەرسوڕمانە. ئەستەمە بەدحاڵیبوونێکی تیا بەدی بکەیت. ئەگەر تا ئەم ڕادەیەش نەبێت، بەردەوام درکێکی بەهێز و لێ براوانەیە. تاقە شتێک کە من نەیزانم ئەوەیە کە ئایا چیکیەکان، لەبەر ئەو دەست پاکیە، مەبەستم ئەو شتەیە کە من پێش هەر شتێکی دی (لە وەرگێڕاندا) پەسەندی دەکەم (نەک تەنیا لەبەر خاتری کتێبەکەی خۆم بەڵکو ئەوە بڕوای شەخسیی منە) سەرکۆنەت ناکەن. هەستی من بەرانبەر بە زمانی چیکی — لەم لایەنەیشەوە خاوەن هەستم — زۆر لێبووردانەیە بەلام زۆر زۆریش لایەنگرانەیە، بەهەرحاڵ ئەگەر لەم ڕووەوە یەکێک سەرزەنشتی کردی، هەوڵبدە ڕەنج و ماندوو بوونەکەت بە ئەمەک ناسی من ئارام بکەیتەوە.

**مران، مەی 1920**

**خاتوو میلنای ئازیز**

(خەریکە ئەم شێوە قسەکردنە دەبێزرێت، بەلام بۆ ئەم دنیا نائەمینە بیانوویەکە نەخۆش دەستی بۆ دەبات، ئەگەرچی بیانوەکە هەندێک جار بێزارکەرییش بێت، لەگەڵ ئەوەیشدا گوزارشتێک لە گەڕانەوە سەلامەت نیە) من هیچ کاتێک لەگەڵ ئەڵمانیدا نەژیاوم، ئەڵمانی زمانی دایکمە[2] بۆیە بۆ من کارێکی سروشتیە، بەلام زمانی چیک لە دیدی مندا زمانی ڕازەکانی دڵە. هەر لەبەر ئەوەیشە کە نامەی تۆ چەندە لە یەقین دوورم بخاتەوە، بەو ڕادەیە تۆ ڕوون و ئاشکراتر دەبینم. جووڵەی لەشت، دەستت، هێند گورج و گۆڵ، هێند لێ براو. ئەم نامەیە، تاڕادەیەک دیدارێکە. هەرچەندە کە دەمەوێت چاوم بۆ بینینی ڕووت بەرز بکەمەوە و، پاشان چاوو دڵم بدەمە دەست نامەکە — ڕووداوێکی سەرسامکەرە — ئاگر هەڵدەگیرسێ و من بێجگە لە ئاوڕ چیدی نابینم.

ئەم ڕووداوە مرۆڤ هەڵدەنێت بڕوا بەو یاسایە بکات کە تۆ بۆ ژیانی خۆتت داناوە، ئەوی ناتەوێت لە بابەت یاسایەکەوە کە خۆت دانی پیادەنێیت ناتەوێت لەژێر سایەیدا ببیتە جێگای بەزەیی پیاهاتنەوە کارێکی زۆر سروشتیە. چونکە دانانی یاسا بێجگە لە لووت بەرزی و خۆپەسەندی چی تر نیە. لەلایەکی دیەوە ئەو بەڵگانەی تۆ بۆ یاسات هێناون پێویستی بە چەند و چوونی زیاتر نیە. تاقە کارێک کە بکرێت دەست خۆشی لێ کردنی تۆیە. تا ئەو جێگایەی پەیوەندی بە منەوە هەبێت من بڕوام بە یاساکەی تۆ هەیە. هەرچەندە ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم کە ئەم یاسایە، بەم ستەمکاری و تەڵبژێریە ئاشکرایەیەوە بۆ هەمیشە ببێتە بار بەسەر ژیانی تۆوەو بابڵێین ئەمە مەسەلەیەکی زانین بێت، تەنیا زانینی ڕێگایەو ڕێگاکەیش بێ ئەنجامە.

بەڵام ئەمانە هەمووی بەلایەک. بۆ توانای تێگەیشتنی سنووورداری مرۆڤ. بینینی تۆ لە دۆخێکی هێند ناخۆشدا کە ژیانی تیا بەسەر دەبەیت کارێکی سامناک و تۆقێنەرە. من لەم چرکەساتەدا تەنیا قسە لەسەر خۆم دەکەم، ئەگەر ئێمە تەواوی بەسەرهاتەکە وەک ئەرکێکی قوتابخانە تەماشا بکەین، ئەوا تۆ لە بەرانبەر مندا سێ ئەگەرت لەبەردەمدایە. لەم لایەنەوە دەتوانیت هیچ باسی خۆتم بۆ نەکەیت، بەڵام لەم حاڵەتەدا لە خۆشیی ناسینی تۆو تەنانەت لەمەیش گرنگتر لە خۆشی چێژ وەرگرتن لە تاقیکردنەوەی خۆم لە ڕێگای ئەم ئاشنایەتیەوە لەو شادیە بێ بەش دەبووم، لەبەر ئەمەیشە ئێوە نەتانتوانیوە من لە هاودەمیی خۆتان بێ بەش بکەن.

ئەگەرێکی تر ئەوەیە کە تۆ دەتتوانی شتگەلێک لە من وەشاریت، یان ئەو شتانە کە لە تویێ هەندێک شتی بەڕواڵەت فریودەرانەدا داتپۆشیون و تا ئێستا کلاوڕۆژنەی ئەم ئەگەرە لە رووتاندا کراوەتەوە. بەڵام ئێستا بارودۆخەکە بە جۆرێکە کە من ئەم شاردنەوەیە تەنانەت ئەگەر ئاماژەیشی پێ نەدەم هەر هەستی پێ دەکەم. ئەمەیش ئازارەکەی دوو هێندەیە. کەواتە ئەمەیشی پێ ناکرێت. ئەمێنێتەوە ئەگەریی سێیەم: واتا کەمێک هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی خۆت. ئاسەواری ئەم تۆزە تەقەلایە لە نامەکانتا دیارە. زۆرجار لە نامەکانتا ئارامی و ئاسوودەیم خوێندۆتەوە، ئەگەرچی تازە دەربارەی شتی تر دەخوێنمەوە و سەرئەنجام تەنانەت دەربارەی «Reelni hruza»[٣]

ئەوەی تۆ لەبارەی تەندروستیتەوە باسی دەکەیت (من تەندروستیم باشە، تەنیا لە هەوای کوێستاندا خەوم خراپە) من قایل ناکات. تێگەیشتنەکەی پزیشک بە ناتەواو دەزانم. یان باشتری بڵێم تێگەیشتنەکەی پزیشک نە بە باش دەزانم نە بە خراپ. تەنیا کاردانەوەی تۆ ئەوە دیاریی دەکات کە تێگەیشتنەکەی پزیشک دەبێت چۆن لێک بدرێتەوە. بێ دوو دڵی پزیشک ئەحمەقە، یان با بڵێین لە خەڵکی دی گەمژەتر نین. بەڵام خۆ وا پیشان دان و ڕواڵەت سازیەکەیان جێی پێکەنینە. لەگەڵ ئەوەیشدا دەبێت ئەو ڕاستیە بزانین کاتێک کەسێک بکەوێتە ژێر دەستیان پزیشکەکان گێلتر دەبن. لەم حاڵەتەدا ئەوەی ئەوان لە تۆیان دەوێت نە ئەوەندە گەمژانە و نە ئەوەندە مەحاڵن، مەحاڵ ئەوەیە تۆ بەڕاستیی نەخۆش بکەویت و ئەم مەحاڵە هەر بە مەحاڵی بمێنێتەوە. بڕوانە، لەوەتەی قسەت لەگەڵ پزیشکدا کردووە ژیانت چ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە. پرسی سەرەکیی ئەمەیانە.

ئەو پرسیارانەی تر کە دەمێننەوە لە پرسگەلێکی بێ بایەخ زیاتر هیچی تر نین، بێگومان ڕێگام دەدەیت ئەو پرسیارانەت لێ بکەم. بۆچی و لە کەیەوە تۆ پارەت نیە؟ وەک خۆت دەڵێیت بۆ سەردەمێک ئەو هەموو کەسانەت لە ڤیەنا دیوەو ئێستا کەس نابینیت؟ تۆ ناتەوێت پەراوێزەکانی خۆتم بۆ بنێریت چونکە لەوە دڵنیا نیت بتوانم بە هۆیانەوە وێنایەکی شایستەی تۆ لە زەینی خۆمدا دروست بکەم. زۆر باشە. بەڵام لەم لایەنەوە من لە دەستت تووڕە دەبم و نابێت تووڕەییەکەم وەک کارەسات لێ وەربگریت. چونکە بۆ هاوسەنگیی کردن خراپ نیە لە سووچێکی دڵما کەمە پاشەکەوتێکی تووڕەیی بکەم.

فرانتس کافکا

## پەراوێزەکان:

١-مەبەست لێکدانەوەی چەند مەبەستێکە کە میلنا لەسەر ڕۆمانی (کۆشک) لە کافکای کردووە.

٢-مەبەستی کافکا لە زمانی دایک ئەوەیە کە دایکی کافکا زیاتر بە زمانی ئەڵمانی دواوەو باوکی زیاتر بە زمانی چیکی.

٣-بە زمانی چیکی واتا «پەشێویی ڕاستەقینە».

## سەرچاوە:

کتێبی (نامەهایی بە میلنا)

# لوتکەی شانازی

ئێدوارد هەلێت کار
لە فارسییەوە: هادی محەمەدی

ناوبانگی دیستۆیڤسکی لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا زۆر کێشە و بەرپرسایەتی تازەی بۆ دروست کرد. بەردەوام بانگهێشتیان دەکرد کە بۆ یارمەتیدان بە دامودەزگای خزمەت بە هەژاران، کۆڕ بگرێ و بەرهەمەکانی بخوێنێتەوە... یەکێ لە بیسەران دەنگی ئەوی بە «فوارەی تواوەی گڕکان»چواندوە. لایەنگرانی دیستۆیڤسکی کە زیاتر ژنان و خوێندکاران بوون، بەردەوام دەبون بە میوانی؛ هەندێ کەس داوایەکیان هەبوو، هەندێک رێنوێنیان دەویست، هەندێک دەهاتن تا پێغەمبەری پیرۆزی خۆیان ببینن و سوپاس و ستایشی خۆیان ئاراستە بکەن. رۆژ لە دوای رۆژ نامەی زیاتری بۆ دەهات. کابرایەکی یەهودی کە لە پێناو هەتوان کردنی دەزگیرانەکەی، بانکێکی بڕیبوو، چارەنوسی خۆی و راسکۆلینکۆفی وەک یەک زانیبوو، بەردەوام لە زیندانەوە نامەی بۆ دەنوسی و مەبەستی خۆی لەم تالانە روون دەکردەوە. کیژۆڵەیەک داوای رێنوێنی دەکرد: ئایا لە بواری پزیشکیدا درێژە بە خوێندن بدات، یان لەگەڵ گەنجێک کە ئەوی خۆش دەوێ، بەڵام ورەیەکی لاوازی هەیە، زەماوەند بکات؟ دایکێ لەمەڕ چۆنیەتی پەروەردەی ئەخلاقی منداڵەکانی رێنوێنی دەویست... خاتونێک دەیویست فلان چیرۆکی کە فلان گۆڤار رەتی کردۆتەوە، وەربگرێتەوە و لە شوێنێکی تر چاپی بکات.

دیستۆیڤسکی بە ئاشکرا لەم هەموو نامەیە کە بۆی دەهات خۆشحاڵ بوو، هەستی بە شانازی دەکرد و لەوەی کە سەرنجی هەموانی راکێشابوو، هەستی بە چێژ و خۆشی دەکرد. ئەو زۆر زەحمەتی بە خۆی دەدا و وەڵامی هەموو نامەکانی دەدایەوە. هەرگیز هیچ کەسێکی بەناوبانگ بەقەد دیستۆیڤسکی زەحمەتی بە خۆی نەداوە تا وەڵامی پێویستی و پرسیاری لایەنگرانی نەناسراوی خۆی

بداتەوە. هەر چۆنێ بوو، میهرەبانی لەگەڵ کەسانی نەناس، ئاسانتر بوو لەگەڵ میهرەبانی لەئاست خزم و دۆستان؛ وەک خۆی لە زمانی ئیڤان کارامازۆفەوە دبێژێ، دژوارترین کار، خۆشویستنی دۆستان و نزیکانە. ئەو هەردەم بەهۆی گومان و زوو زیزبوون، دۆستانی دەرەنجاند. سالاڤیۆف دەنوسێ: «وەک هەورێکی رەش و تاریک دەهاتە ژوورێ و هەندێ جار تەنانەت چاک و چۆنی لەبیر دەکرد و بۆ بیانویەک دەگەڕا کە شەڕ و قاڵ هەڵگیرسێنێ و تەوس و تەشەرمان لێبدات؛ هەموو شتێکی بە سوکایەتی بە خۆی دەزانی، پێی وابوو هەموان دەیانەوێ تووڕەی بکەن و بیرەنجێنن». تەنانەت هەندێ جار لەهەمبەر ژنەکەیشی ئاوا بوو. دۆستێکی تری دەڵێ: «ئەگەر لەم کاتانەدا کەسێکی غەریب بیدیبا، دەیوت: ئەم کابرا تەنانەت لەگەڵ خزم و کەسی خۆشی بێ ئەدەب و توندوتیژ و دیکتاتۆرە.» بەڵام ئانا بە خۆڕاگری لە مێردەکەی تێدەگەیشت و هەموو کارێکی بۆ دەکرد. ئەڵبەت هەم ئانا و هەم خزمان دەیانزانی کە ئەو (ئانا) بەسەر دیستۆیڤسکیدا دەسەڵاتی رەهای هەیە. نوسەر ئەگەرچی بەرواڵەت بۆ چەند ساتێک تاڵ و تووڕە بوو، بەڵام ئێستاش وەک پێشوو ژنەکەی خۆش دەویست و سوجدەی بۆ دەبرد.

لە نامەیەکدا بۆ ژنەکەی دەنووسێت:

ئازیزی من، هەوێنی شادمانی من، بۆ پێت وایە کە تۆ ژنێکی ئاساییت؟ تۆ ژنێکی دەگمەنی و، هەروەها لە هەموو ژنانی دەگمەن باشتری. تۆ لە تواناکانی خۆت بێ خەبەری. تۆ هەم کاروباری ماڵ هەڵدەسوڕێنی، هەم کارەکانی من. باری هەمومان لەسەر شانی تۆیە، وەک دەزانی ئێمە هەموومان قەڵس و تووڕەین، هەر لە منەوە بگرە تا ئالیوشا... ئەگەر تۆ شاژن بووایی و دەسەڵاتداری وڵاتێک بویتایە، من سوێند دەخۆم باشتر لە هەموان بەڕێوەت دەبرد- ئاخر تۆ زیرەکی، ئاقڵی، دڵپاک و میەرەبانی و باشترین بەڕێوەبەری.

ئەوە کە دیستۆیڤسکی بۆ هەموان خاوەن رێز و گەورەیی بوو، تەنانەت بۆ ساتێکیش بڕوای دەروونی ئەوی لاواز نەکرد کە ئانا لەو مەزنترە. دە ساڵ پێشتر لە نامەیەکدا بۆ ستراخۆف نووسیبووی: «ژنهێنان سێ لە چواری بەختەوەری مرۆڤ پێکدێنێ و پاشماوەی ژیان تەنیا یەک لە چوار.»...

نەوەی پاش دیستۆیڤسکی برایانی کارامازۆف بە دوا دەسکەوتی مەزنی وی دەزانن. بەڵام هاوچەرخانی پێیان وایە رووداوێکی تر کە لە دوا ساڵی ژیانی نوسەردا رووی دا، یانی روداوی جەژنی لەدایکبوونی پووشکین، ئەم شاکارە دادەپۆشێت. بڕیار بوو لە جەژنێکدا لە مۆسکۆ پەردە لەسەر پەیکەری پووشکین لابدرێت. ئەم بۆنەیە، وەک هەر رووداوێکی ئەدەبی تری رووسیا، رەنگ و بۆنێکی خەستی سیاسی بەخۆوە گرتبوو. ئێستا کە بڕیار درابوو بۆ یەکەم جار پەیکەرێک بۆ شاعیرێکی رووسی ساز بکرێت، نیشانەی ئەوە بوو کە بڕیارە پووشکین وەک قارەمانی نەتەوەیی بناسرێت. ئەوەش کە شاری مۆسکۆیان هەڵبژاردبوو، نیشانی وڵات پەرستی لوکاڵی لایەنگرانی رەگەزی سلاڤ بوو. ئەم ئاهەنگە لەلایەن «کۆمەڵی نوسەران و ئەدیبانی مسکۆ»وە رێکخرابوو و؛ ئەنجومەنی

شاری مۆسکۆ، میوانداری کۆڕ و کۆمەڵی ئەدەبی و نوسەرانی مەزنی بە ئەستۆ گرتبوو. شەپۆلێک لە شەوق و هەیەجانی پەنگخواردوو شاری مۆسکۆی لەبەر گرتبوو. پارت و گرووپی سیاسی و ئەدەبی ئەو سەردەمە، هەرگیز هەڵوێستی رەسمی خۆیان لەئاست پووشکین رانەگەیاندبوو؛ زۆربەیان نەیاندەزانی کە ئایا دەبێ پوشکین وەک قارەمانی پیرۆزترین باوڕی خۆیان ستایش بکەن، یان ئەوە کە بە دوژمنی بیروباوەڕی خۆیانی بزانن و هێرشی بۆ ببەن. هەروەها پۆلیس، وەک هەر کەسێکی تر ئەدەبیاتی بە سیاسەت دەزانی و لەژێر کاریگەری نەریتی رابردوودا کە ئەدەبیاتی بە دەڤەری دژایەتی سیاسی ناساندبوو، لە هەموو روداوەکە دڕدۆنگ بوو، و پاش تێبینی و پارێزی زۆر سەرئەنجام رێگەی بەم ئاهەنگەدا. لەنێو کاربەدەستاندا، تەنیا شارەداری مۆسکۆ پشتیوانی لەم ئاهەنگە کرد.

بڕیار بوو رۆژی ٢٦ مانگی مەی، رۆژی لەدایکبوونی پوشکین، پەردە لەسەر پەیکەری لابدرێت. دیستۆیڤسکی، کە یەکێ لە ئەندامانی لیژنەی نوێنەرایەتی «جڤاتی سلاڤ» بوو، رۆژی ٢٣ گەیشتە مۆسکۆ. ئەو لە قەتاردا خەبەری پێگەیشت کە کچی تێزار مردووە و بەمبۆنەوە ئاهەنگەکە بۆ ٦ی حوزەیران دواخراوە. ئەو کە لە خێزان و لە کاری نوسین (ئەوکات خەریکبوو دواین بەشی کارامازۆڤی دەنوسی) دابڕابوو، پێی خۆش نەبوو دوو هەفتە بە بێهودە لە مۆسکۆ تێپەڕێنێ؛ بەڵام لە هەموو لایەکەوە فشاریان بۆ هێنا کە دانیشێ و نەڕواتەوە. ئەو بە شانازییەوە تێگەیشت کە بەڕێوەبەرانی ئاهەنگەکە بە کەسێکی گرنگی دەزانن و بەشدارنەبوونی بە کارەسات دەزانن، بۆیە زۆر خۆشحاڵ بوو. دواتر دەرکەوت کە تۆلستۆی لە بەرزاییەکانی ئەخلاقی یاسنایا پولیاناوە سەیری ئاهەنگەکەی دەکرد، تێکڕای رووداوەکەی بە «گاڵتەجاڕی پەتی» زانیوە، هەروەها گانچارۆڤ، کە ناوچەگەرایەکی خەڵکی پترزبورگ بوو، گرنگی بەم روداوەی مۆسکۆ نەداوە و حازر نەبووە لە ئاهەنگەکەدا بەشداری بکات. کەوابوو لەنێوان نوسەرانی هاوچەرخدا، مەیدان بۆ تەراتێنی تورگنیف و دیستۆیڤسکی ئاوەڵا بوو. هیچ کەس نەیدەزانی کە تورگنیف لەو رۆژەدا چی دەڵێت. بەڵام ئەو کەسێکی لایەنگری فەرهەنگی رۆژئاوا بوو و هێشتا لەسەر باوەڕی خۆی سوور بوو و ئیمکانی نەبوو وتەکانی بە دڵی لایەنگرانی سلاڤ بێت. ئەگەر دیستۆیڤسکیش لەوێ نەبا، ئەرکی داکۆکی لە رەوتی سلاڤیسم (یان ئامانجی نەتەڤی) بە ئیڤان ئاکساکۆڤ، کوڕی رێبەری رەوتی سلاڤ، دەسپێردرا؛ ئەم کەسەش وەک باوکی بەدەر لە کۆڕی تەنگی رەوتی سلاڤ، وەک کەسێکی جدی نەناسرابوو. نەبوونی قارەمانانی بەناوبانگ، شکۆیەکی زۆر زیاتری بەبوونی دیستۆیڤسکی بەخشیبوو. ئەو دەیبینی کە ئەرکی رێبەری گرووپێکی گەورەیان بەو سپاردووە، وەها دۆخێک بۆیە هەستیارتر و هەست بزوێنەتر دەبوو چونکە ئەو دەبا ئەم کارە لە هەمبەر دوژمنی دێرینی خۆی، تورگنیف، ئەنجام بدات.

لە ماوەی ئەم دوو هەفتەدا دیستۆیڤسکی زۆربەی خزم و دۆستانی دانیشتوی مۆسکۆی بینی و لە زۆر کۆڕ و میوانی ئەدەبیدا بەشداری کرد کە بیرەوەری ساڵی ١٩٤٥ و کۆڕی بلینسکی و کاتی نوسینی رۆمانی چەوساوەکانی بۆ زیندوو کردەوە، بەدڵنیاییەوە دیستۆیڤسکی هیچ کات وەک ئەم ماوەیە هەستی بە شکۆ و شانازی نەکردووە...

بەڕێوەبەرانی ئاهەنگەکە، بەبێ پرسی دیستۆیڤسکی و لەوەش خراپتر لە دانیشتنێکی نهێنیدا لەلای تورگنیف، بەرنامەی ساڵیادی پووشکینیان ڕێکخستبوو. دیستۆیڤسکی هیوادار بوو کە داوای لێ بکەن شیعری شاسواری هەژاری پووشکین[1] کە لە ڕۆمانی گەمژەدا ئاگلایا دەیخوێنێتەوە، بخوێنێتەوە. بەڵام ئەم کارەیان بە کەسێکی تر سپارد و داوایان لە دیستۆیڤسکی کرد سەبارەت بە پێگەو گرنگی پوشکین، پەیڤێک پێشکەش بکات.

ئاهەنگی پوشکین، وەک لە جەژنەکانی ڕوسیادا باوە، وردەکاری زۆری تێدا بوو، ئەمەش سەبر و پشوودرێژی خەڵکی ڕوسیا دەگەیەنێت. سەرەتا بەرنامەیەکی ئایینی لە کڵێسای ستراتینوف بەڕێوەچوو. پاشان پەردە لەسەر پەیکەری پوشکین لادرا. ئەوجار کۆڕی ڕەسمی لە زانکۆ دەستی پێکرد. پەیڤبێژان هەموو مامۆستای زانکۆ بوون و فەزایەکی تەواو ئاکادمێک زاڵ بوو. ڕوداوی سەرەکی لەم کۆڕەدا ئەوە بوو کە تورگنیف وەک ئەندامی فەخری زانکۆ هەڵبژێردرا. زانکۆکانی ڕوسیا، ڕێک بەپێچەوانەی نەریتی ئەنگلۆساکسۆن، جێگای ناسراوی بیروڕای مۆدێرن و پێشکەوتنخوازانە بوو و ئەو شانازییە کە بە پوشکین درا ئەم ڕاستییەی دەردەخست کە تورگنیف نە تەنیا وەک گەورەترین ئەدیبی زیندووی ڕوسیا ناسرا، بەڵکوو هەروەها وەک قارەمانی ڕەوتی ڕادیکاڵ ناسێندرا. دیستۆیڤسکی بە هێمنی و دووربینی دانیشتبوو؛ بەڵام تورگنیف بە هەرا و هوریا ڕێزی لێگیرا. هەمان شەو، ئەنجومەنی شار میوانییەکی بۆ نوێنەران ڕێکخست، کە پاشان چەندین کۆپلەی تر لە شیعر و نوسراوەکانی پوشکین خوێندرایەوە. دیستۆیڤسکی و تورگنیفیش چەند کۆپلە لە نوسراوەکانی پوشکینیان خوێندەوە، دۆستۆیڤسکی سەرەڕای ئەوە کە دەیبینی کە بەشداربووان بە چەپڵە و هەرای بەرزتر ڕێز لە تورگنیف دەگرن، بەمجۆرە دڵگەرمی بە خۆی دەدا کە ئەوە کاری ئەو خوێندکارانەیە کە تورگنیف بە کرێی گرتوون.

دوو ڕۆژ دواتر، ڕۆژانی ٧ و ٨ حوزەیران بۆ کۆڕی گشتی تەرخان کرابوو کە بە هۆی «ئەنجومەنی لایەنگرانی ئەدەبیاتی ڕووسی» ڕێکخرابوو. بڕیار بوو لەم کۆڕانەدا هەرکام لە نوێنەرانی دوو ڕەوتی سەرەکی، پەیڤێک بۆ ڕێزگرتن لە پوشکین بخوێننەوە. پەیڤی تورگنیف، کە سەردەمێک بوو هەموان چاوەڕێی بوون، ڕۆژی حەوتەم پێشکەش کرا. لە فەزای تەواو سیاسی مۆسکۆدا، پەیڤی تورگنیف بە وتارێکی سارد و بێ ڕۆح و ناتەواو زانرا. تورگنیف هێندە لایەنگری ئەوروپا و پارێزگار و نەرم و نیان بوو کە نەیتوانی هەست و سۆزی بەشدارانی ڕووسی هەڵگیرسێنێ. ئەو ڕاشکاوانە گوتی هێشتا وەڵامێکی بۆ ئەم پرسیارە نەدیوەتەوە کە ئایا دەکرێ وەک شکسپیر و ڕاسین و گۆتێ، شاعیرانی نەتەڤی بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمان، پوشکین بە شاعیری نەتەڤی ڕوسیا بزانین. ئەو باسی خەسڵەتی نەتەڤی و ڕەهەندی جوانیناسی شیعری پوشکین کرد، بەڵام باسی ئەو ڕەهەندانەشی کرد کە شیعری پوشکین بێ بایەخ دەکەن، ئەم خاڵەشی بەجۆرێک باس کرد کە گوایە خۆشی لەگەڵ ئەم ڕەوتەدایە. بەکورتی، وتارەکەی تورگنیف، ڕەوتی لایەنگری ڕۆژئاوای گێژ و مەنگ کردبوو؛ چونکە نەیاندەتوانی دژایەتی پوشکین بگرن و لەم ئاهەنگەدا کە ڕەوتی سلاڤ وەرێیان خستبوو تا پوشکین بە قارەمانی نەتەڤی بناسێنن، هەڵوێستی دروست بگرن.

وتاری تورگنیف، دوا پەیڤی ڕۆژی حەوتەم بوو. دستۆیڤسکی یەکەم وتاربێژی ڕۆژی دواتر بوو. ئەو هەر لە سەرەتای پەیڤەکەیدا، ڕاستەوخۆ پوشکینی وەک شاعیری نەتەڤی ناساند و ستایشی کرد. پوشکین یەکەم کەس بوو کە دوو کەسێتی تیپیکی ڕووسی نواندبوو- «ئاوارە»یەکی لە خاک و خەڵک دابڕاو کە لە کەسێتی ئالکۆ و ئۆنیگندا نەخشێندرابوو و، ڕووسێکی بەئامانج و ئەمەکدار کە لە کەسێتی تاتانیادا پیشاندرابوو. پاشان دستۆیڤسکی وتی پوشکین خاوەن وزە و توانایەکی تایبەتی ڕووسییە کە دەرکێکی جیهانی و گشتی هەیە و هاوکات کە شاعیرێکی نەتەڤییە، شاعیرێکی مەزنی جیهانیشە، لە کۆتایی وتارەکەیدا هەمان بۆچوونی دێرینی خۆی دووپات کردەوە کە ڕوسیا تاقە هێزێکە کە توانای ناسین، ئاشتکردنەوە و ئیلهام بەخشین بە ئەورووپای هەیە. وەها تێکهەڵکێش (سەنتز)ێک ڕق و قینی دێرینی ڕەوتی سلاڤ و ڕەوتی لایەنگری ئەورووپا چارەسەر دەکا و دەیتوێنێتەوە. ڕوسیا هەرچەندە زیاتر بەرەو ڕەسەنایەتی خۆی بڕوات، زیاتر ئەورووپایی دەبێتەوە.

کاکڵ و ناوەڕۆکی وتاری بەناوبانگی دستۆیڤسکی، کە تا چەندین ساڵ وەک وەرچەرخانێکی مێژووی ئەدەبی ڕووسیا بوو، وەها بوو. ئەم وتارە شتێکی وای تێدا نییە کە لە پاش چەندین ساڵ دیسان شور و شەوقی خەڵک هەڵگیرسێنێت. هەروەها بەپێی نرخاندنی ئەدەبی، شتێکی بەرچاوی تێدا نییە. هەروەها لە ڕووی سیاسی و ئەخلاقییەوە شتێکی تازە باس ناکات، بەڵام دەبێ کاریگەری بەرینی وتارەکەی دستۆیڤسکی لەسەر بەشداربووانی ئەو کۆڕە ڕاڤە بکەین.

ستراخۆف لە ژیاننامەی ڕەسمی دستۆیڤسکیدا دەنوسێ: «هەموان کپ و بێدەنگ سەرتاپێ بوون بە گوێ، وەک بڵێی تا ئەو ساتە کەسێک باسی پوشکینی نەکردووە.» ئەمەش لە کاتێکدایە کە دوو ڕۆژە بەردەوام باسی پوشکین دەکەن. وتاری دستۆیڤسکی شوور و شەوقێکی هەڵگیرساند کە بێجگە لە لایەنگرانی ڕەوتی سلاڤ، بەشێنەیی لایەنگرانی دوو دڵ و نیگەرانی ڕەوتی ڕۆژئاواشی گەشاندەوە. دستۆیڤسکی بە وردبینییەوە ئاماژەیەکی بە خۆشەویستترین و سەرکەوتوترین قارەمانی ژنی بەرهەمەکانی تورگنیف، لیزا، کرد. دەنگی چەپڵە و هەرا وەکو بۆمب تەقییەوە، تورگنیف لە جێگەی خۆی هەستا و بە ئاماژە ماچێکی بۆ دستۆیڤسکی نارد. با درێژەی ئەم ڕوداوە لە زمانی خودی دیستۆیڤسکییەوە بخوێنینەوە کە چەند سەعات دواتر لە نامەیەکدا بۆ ئانا باسی کردووە:

کاتێ لە کۆتایی وتەکانمدا باسی یەکێتی و هاوپشتی جیهانی مرۆڤایەتیم کرد، تالار لە شەوق و شادیدا تەقییەوە؛ ڕەنگە نەتوانم هەل هەلە و هەرای شادمانی کۆتایی وتارەکەم بۆت باس بکەم. خەڵکانی بەشداری کۆڕەکە بێ ئەوەی پێشتر یەکتریان ناسیبێت، یەکتریان لە باوەش گرت، گریان، فرمێسکیان هەڵوەران، سویندیان خوارد کە لەوە بە دوا مرۆڤێکی باشتر بن، هاوڕەگەزی خۆیان خۆش بووێ و ڕق و نەفرەت فەرامۆش کەن. بەرنامەی کۆڕ کۆتایی هات، لەسەر سەکۆ هەموان هاتن بۆ لام- خانمانی بەڕێز، خوێندکاران، کاربەدەستانی دەوڵەت، هەموویان منیان لە باوەش گرت و ماچیان کردم، هەموو- بەڕاستی هەموو-لە خۆشیدا گریان. بەدرێژەی نیو سەعات ناوی منیان دەوتەوە و دەسماڵەکانیان بادەدا. بۆ وێنە لەپڕ دوو پیاوی پیر پێشیان پێ گرتم و گوتیان: «ئێمە بە درێژەی

٢٠ ساڵ لەگەڵ یەکتر قسەمان نەدەکرد، بەڵام ئەمڕۆ یەکترمان لە باوەش گرت و رابردوومان فەرامۆش کرد؛ تۆ ئێمەت ئاشت کردەوە، تۆ مرۆڤێکی پیرۆزی، پێغەمبەری.» ئاپورەی خەڵک هاواری دەکرد: «پێغەمبەر، پێغەمبەر!» تورگنیف کە وتەیەکی دۆستانەم دەربارەی وی وتبوو، بە چاوی پڕ فرمێسکەوە خۆی خستە نێو باوەشم. ئانێنکۆف بە راکردن هات بەرەو پیرم، دەستی گوشیم و شانمی ماچ کرد. پێیان دەوتم: «تۆ بلیمەتی، لە بلیمەت واوەتری». ئیڤان ئاکساکۆف چووە پشتی تریبوون و گوتی: ئەم وتارە، هەر وتار نەبوو، بەڵکو روداوێکی مێژوویی بوو: هەور و هەڵا ئاسمانی داگرتبوو، بەڵام پەیڤی دیستۆیڤسکی وەک هەتاو وەدەرکەوت و تەم و هەوری رامالی و هەموو دنیای نوقمی روناکی کرد. لە پاش ئەم وتارە رق و قین کۆتایی دێ و برایەتی دەست پێدەکات. هەموان پێکەوە دەیانوت: «ئافەرین، ئافەرین» دیسان یەکتریان لە باوەش دەگرت و فرمێسکیان دەڕشت. کۆڕ کۆتایی هات. من هەوڵم دا لە رێگەی پشتەوە خۆم بگەیەنمە دەرەوە، بەڵام هەموان بە شوێنمدا هاتن و، بەتایبەت ژنان هێندە دەستیان ماچ کردم کە ئارەقی شەرمم لێنیشت. خوێندکاران هروژمیان هێنا بۆ تالار. یەکێکیان کە فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابوو لەوپەڕی شەوق و هەیەجاندا قەشی کرد و لە هۆش چوو. سەرکەوتن! سەرکەوتنی رەها!

رەنگە خوێنەر ئەم وتانە بە گەزاف بزانێ و پێی سەیر بێت، بەڵام دستۆیڤسکی کەمی وتووە و زۆری نەوتووە. وەها روداوێکی پڕ لە شانازی، لە گێڕانەوەی خودی دستۆیڤسکی ئێجگار فراوانتر بوو. نوسەر باسی ئەوە ناکات کە لە کۆتایی کۆڕەکەدا چەند کەس لە خانمان تاجە گوڵێکی گەورەیان هێنا و هاتنە سەر سەکۆ و داوایان لە دستۆیڤسکی کرد کە بەرانبەر بە بەشداربوان بوەستێ، ئەوجار تاجە گوڵیان وەک خەرمانەیەکی پیرۆز لەسەر وی راگرت، لەم کاتەدا دیسان دەنگی چەپڵە و هەلهەلەی شادی خەڵک گوێی ئاسمانی کەڕ کرد.

جەژنی رێزگرتن بە خوێندنەوەی چەند دەقێکی تری پووشکین کۆتایی هات. دستۆیڤسکی کە ئێستا ئیتر تاقە قارەمانی مەیدان بوو شیعری پێغەمبەری (پوشکین) خوێندەوە. تا جێگایەک من بزانم دستۆیڤسکی ئەم شیعرەی پێ خۆش نەبوو و بە ویستی خۆی بۆ خوێندنەوە هەڵینەبژاردبوو. بەڵام لە کاتی خوێندنەوەدا، تا دەهات، هاوکات لەگەڵ بیسەران، زیاتر بڕوای دەکرد کە ئەم شیعرە مانا و گرنگی تایبەتی بۆ ئەو هەیە. خەڵک لە کۆتاییدا هاواریان دەکرد: «پێغەمبەر، پێغەمبەر!». بەتایبەت کاتێ کە دستۆیڤسکی ئەم شیعرەی دەخوێندەوە، ئەم راستییە ئاشکرا بوو: پوشکین خودای روسیا بوو و، دستۆیڤسکی پێغەمبەری ئەو.

## پەراوێز:

١. لێرەدا شیعری «شاسواری هەژار»ی ئەلکساندر پوشکین دێنینەوە:

شاسوارێک بوو، هەژار
خامۆش، ساکار
روخساری گرژ و رەنگپەڕیو
رۆح بەرز و دلێر.
لە خەونیدا روخسارێکی دەبینی
کە ئەندێشە ڕێی تێنەدەبرد.
لەنێو دڵی سووتاوی
بە قووڵی نەخشی بەستبوو و
هەردەم گیانی هەڵدەقرچاند.
بۆ هیچ ژنێک نەیدەڕوانی
نەیشی دەویست هەتا مردن
لەگەڵ هیچ ژنێک بدوێ
لەجیاتی شاڵ
تەسبیحی لە مل دەکرد
هەرگیز لە پێش چاوی نەیار
دەمامکی پۆلاییینی لەسەر روخسار لانەدەبرد
دڵی کەیلی عشقێکی پاک

بە خەونێکی شیرین داخرابوو
بە خوێنی خۆی
سێ پیتی ئـ. م. د
لەسەر سپەرەکەی نووسیبوو
لە شوێنێکدا کە پاڵەوانانی تر
لە بیابانی فەلەستین لەنێو گاشەکان
شەڕیان دەکرد و ناوی دڵدارەکانی خۆیان دەوتەوە،
ئەم بە شەوقێکی وەحشیانە هاواری دەکرد
Lunen coeli sancta Rosa (تیشکی ئاسمان،
رۆزای دەروون پاک)
شریخەی ئەم هەڕەشە
دڵی دوژمنی زاڵمی دەلەرزاند
بەڵام کاتێ کە سەرئەنجام بۆ قەڵای دووری خۆی گەڕایەوە
دەرگای دڵی لە دنیا داخست و
کپ و بێ دەنگ
مەجنون ئاسا ماڵاوایی لە ژیان کرد.

## سەرچاوە:

١)دستۆیفسکی جدال شک و ایمان، ادوارد هلت کار، خشایار دیهیمی، نشر طرح نو، چاپ دوم، تهران ١٣٨٤، صص: ٢١٢- ٢٢١.
٢)ابله، فیودور دستۆیفسکی، سروش حبیبی.

# هەموومان لە گۆڤارێکی چکۆلەوە دەست پێ دەکەین

**چیرۆکی: نورمان لیڤین**
**لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد**

نورمان لیڤین[1] (لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٣) لە کتێبی کەنەدا ئێمەی دروست کرد[2] سەردەمی منداڵیی لە کۆمەڵگایەکی یەهوودی باشووری شاری ئۆتاوادا باس دەکات. لە شەڕی دووەمی جیهانیدا لە هێزی هەوایی سەڵتەنەتی کەنادادا کاری کردووە. دوای ئەوە لە زانکۆی مک گیل خوێندوویەتی. لە کۆتایی دەیەی ١٩٤٠ چووە بۆ ئینگلتەراو تا ساڵی ١٩٨٠ لەوێ ژیاوە. ساڵی ١٩٥٠ دیوانێکی شیعری خۆی بڵاوکردۆتەوە بە ناوی بەندبازەوە[3]. دوای دوو ساڵ ڕۆمانی شەقامی پڕقەمچ و پێچی[4] دەربارەی شەڕنووسی. لە ناوەڕاستی ئەودەیەدا کتێبێکی نووسی کە ژیاننامەی شەخسیی خۆی و لێکۆڵینەوە بوو لە ناخی کۆمەڵگای کەنەدایی. کتێبەکە لە شێوازی بەرهەمەکانی هینری میلەرو جۆرج ئۆرێلدا بوو. ئەم-کتێبە کەنەدا ئێمەی دروست کرد — ساڵی ١٩٥٨ لە ئینگلتەرەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چاپ کرا. بەڵام لەبەرئەوەی وێنەیەکی ناپەسەندی بە ژیانی ناو کەنەدادابوو، تا ساڵی ١٩٧٩ لەوێ بڵاونەبووەوە.

لیڤین لە ساڵی ١٩٧٠ دووەم ڕۆمانی خۆی چاپکرد بە ناوی (شارێکی کەنار دەریا)[5] ئەو زیاتر وەک نووسەری کورتە چیرۆک بەناوبانگە. لە کۆمەڵە چیرۆکەکانی: بلیتی یەکسەرە[6] ١٩٦١ سەهۆڵی ناسک[7] ١٩٧٩ ئەمباری شامپانی[8] ١٩٨٤. گەلێک چیرۆکی لیڤین لە ڕادیۆی سی. بی سی. و بی. بی. سی پەخش کراون و لە ئەوروپادا وەرگێڕاون و بڵاوکراونەتەوە.

ئێمە لە شارێکی کەنار دەریای بچووکدا دەژین، هاوینان کە ئەم شارە لە هەموو کاتێکی دی جوانترە، خەڵکێکی زۆر بۆ بەسەربردنی پشوو بۆ ئێرە دێن، ئێمەیش بۆ پشوو بەسەربردن دەچین

بۆ لەندەن.

ئاسایی هاوسەرەکەم لە ڕێگای ڕیکلامەکانی ڕۆژنامەی تایمزەوە ماڵێک پەیدا دەکات. جارێکیان خانووی کابرایەکمان بەکرێ گرت کە لە ناوچە هەژارەکانی ئەفریکادا ئوتێلی دروست دەکرد بۆئەوەی رەش پێستە دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا بتوانن سەر لە زادگای باووباپیریان بدەن. هاوینێکی تر لە ماڵی ئەندازیارێکی تەلارسازدا بووین کە تاڕادەیەک هەموو شتەکانی لە دوورەوە بە کۆنترۆڵ کاریان دەکرد. جاری سێیەم لە ماڵێکدا نیشتەجێبووین کە خاوەنەکەی بەتەمای جیابوونەوە بوو لە هاوسەرەکەی — بە بیانووی نەبوونیەوە — دەیشیویست لە وڵات دەربچێت.

لە مانگی ژوینی ئەمساڵدا، هاوسەرەکەم ڕیکلامێکی لەم شێوەیەی بینی: «ماڵی پزیشکێک لە لەندەن بۆ ماوەی سێ مانگ بە کرێیەکی گونجاو دەدرێت» هاوسەرم تەلەفوونی کرد و بڕیارماندا ماڵەکە بە کرێ بگرین.

ماڵەکە لە سەنتەری شاردایە نزیک بە وێستگەی شەمەندەفەری کنزینگتنی باشوور، زۆر لە پارکی کنزینگتن دوور نەبوو. تەکسی ئێمەی لە وێستگەی پدینگتن سوار کرد — دانیشتوانی لەندەن لە ڕۆژانی گەرمی هاویندا چەندە ڕەنگ پەڕیو بەرچاو دەکەون- تاکسیەکە ئێمەی بردە شەقامێکی پانەوە، بەرانبەر ڤیەلایەکی سپی وەستاو کە لە باخچەی پێشەوەیدا درەختی ئەکاکی نێژرابوو. بوتڵێک شیری گەرم لە بەردەرگاکە بوو. دەرگاکەم کردەوەو جانتاکانم بردە ژورێ. تەلەفوونی ماڵەکە لێی دەدا، وتم:

-هەلو..

دەنگی گەنجێک وەڵامی دایەوە «ئی. بی. سی؟»

وتم: بەداخەوە، ژمارەکە هەڵەیە.

«ژمارەکەتان چەندە؟»

«٤٢٣١ نایتزبریج»

«ژمارەکە تەواوە»

وتم: «بێگومان هەڵەیە، ئێرە ماڵی پزیشکە»

پرسی: «پزیشکەکە لەوێیە؟»

وتم: «نەخێر، چوە بۆ پشوو»

«دەتوانم راسپاردەیەکی بۆ دابنێم؟»

«نەخۆشیت؟»

وتی: «نا، پێی بڵێ دیڤیید وایت تەلەفوونی بۆ کردیت، دیڤید وایت لە سامیریت، نزیکەی شەش مانگە دەست نووسی کتێبێکی خۆمم داوەتێ، بڕیار بوو مانگی پێشوو وەڵامم بداتەوە، تا ئێستا چوار نامەم بۆ نووسیوە.

«بێگومان پێی دەڵێم»

لاوەکە بە دوودڵیەوە وتی: «ئەگەر دەرفەتی تری پێویستە، لای منەوە قەیدی نیە»

وتم: «زۆر باشە» بیستەکەکەم دانا.

بە هاوسەرەکەمم وت «کەس نازانێت لێرە چی ڕوودەدات!»

بەڵام هاوسەر و منداڵەکانم خەریکی ڕێک و پێک کردنی ماڵەکە بوون.

ماڵەکە گەورە بوو، دیار بوو بۆ ژیان دەست دەدات، ژووری پێشەوە ژووری منداڵان بوو بە هەموو کەرەسەی یاریانەوە، تەختەی ڕەش، کتێبی منداڵان و پۆستەری سەر دیوار، لە ژووری دانیشتندا، نیوەی خوارەوەی دیوارەکان قەفەزێکی پڕ لە کتێب بوون، ڕاڕەو، دوولای ڕێی پلیکانەکان، پێ گردی پلیکانەکانیش هەر پڕ بوون لە کتێب. خانوەکە سێ حەمامی تیا بوو، لە چێشتخانەدا، زۆر جار پشیلەیەکی ماڵی لەسەر زۆپا نەوتیەکە نوستبوو. باخی پشتەوەی ماڵەکە یەکپارچە چیمەن و دەوریشی گوڵکاری کرابوو، حەوزێک ماسی سوری تیا بوو، لەو پەڕیشەوە داری ڕاشی دەبینرا.

تەلەفوونەکە لێی داو دەنگێک هات: «دەتوانم لەگەڵ دوکتۆر جونزا قسە بکەم؟»

–بەداخەوە چوە بۆ پشوودان.

–کەی دەگەڕێتەوە؟

–سێ هەفتەی دی.

–ناتوانم ئەمەندە بمێنمەوە، بەیانی دەبێت بگەڕێمەوە بۆ نیویۆرک.

–دەتەوێت پەیامێکی بۆ دابنێیت؟

–گوێم لە دەنگت نیە، دەتوانیت کەمێک دەنگت بەرزتر بکەیت؟

من کەمێک گوێم قورسە و ناچارم سوود لە بیستەک ببینم، ئێستا پزیشکەکان دەرمانی ئەم نەخۆشیە دەکەن. ئەگەر دوو ساڵ درەنگتر لەدایک بوومایە چارەسەر دەکرام.

وتم: «ڕاسپاردەیەکت بۆ دوکتۆر هەیە؟

وتی: بڕواناکەم کەڵکی هەبێت، دەتوانیت سەرێک لە ژووری کارەکەی بدەیت و بزانیت شیعرەکەم دەدۆزیتەوە؟ ناوی شیعرەکە «ماڵئاوایی»یە. ئەگەر لە قۆناغی هەڵەگیریدایە، زەحمەت مەکێشە، چاوەڕێ دەکەم، بەس بزانە لە کوێیە؟ بڕیارە بۆ وتنەوەی وانەی نووسینی داهێنان لە قوتابخانەیەکی شەودا بچم بۆ نیویورک تا پووڵێکم چنگ بکەوێت و پاشان بگەڕێمەوە ئێرە».

وتم: «با تەلەفوونەکەت بە دەستەوە بێت».

چووم بۆ نووسینگەکەی کە لە دوا قاتی ماڵەکەدا بوو، ناو ژوورەکە پڕ بوو لە کاغەز و گۆڤار و دەست نووس و زەرفی نامە. نووسراوی هاتوو نێردراو لە زونکنێکی گەورەدا لەسەر مێزێکی دار دانرابوو. لە چەکمەجەیەکدا چەند چەکێکی پارەی کەم هەبوون، هەروەها چەند پارەیەکی کاغەز و وردە، پەڕەیەکی پوول و دوو پاکەت جگەرە. لەگەڵ خۆمدا وتم: دوکتۆر زۆر دڵنیایە، ئەو ئێمە ناناسێت، ئەی ئەگەر دز بین چۆن! کاغەزی تایپ، زەرفی گەورە، دەزگایەکی تایپ کردن، تەلەفونێک، چەند دەفتەرێکی ڕێنمایی تەلەفوون لە ژوورەکەدا هەبوو. چەند لاپەڕەیەکی چاپ کراو بە مێخێکی سەر دیوارەوە هەڵواسرابوو. لەسەر مێزێکی بچووکتر فایلێکی تۆمار کردنی ڕەچەتەی پزیشکی و چەند ژمارەیەکی گۆڤاری لەنسیت دانرابوون. ڕێک و پێکترین بەشی ژوورەکە کۆتاییەکەی بوو کە ژمارە گەڕاوەکانی ئی، بی. سی کە لەسەر زەوییەکەو لەپاڵ دیوارەکەدا هەڵچنراو بوون. هاتمە خوارەوە و پێم وت: «بەداخەوە، شیعرەکەتم نەدۆزیەوە» وتی: «ئاە» دەنگەکەی زۆر نائومێدانە

بوو «باشە، پێی بڵێ ئارنولد میست تەلەفوونی کرد. ئیم، ئی، ئێس. تی.

وتم: «بێگومانبە»

«خوات لەگەڵ»

بە هاوسەرەکەمم وت: «بە خەیاڵتا نایەت، دوکتۆر سەرنووسەری گۆڤارێکی چکۆڵەیشە».

وتی: «کەواتە ڕزگار نابین».

ڕۆژی دوایی، سەرلەبەیانی زوو، لە زەنگی دەرگا بەئاگا هاتین، پۆستەچی بوو، چەند بەستەیەکیدایە دەستم، نامەی زەمینی لە زۆر شوێنی ئینگلستان و ئەوروپاوە، نامەی هەوایی لە کەنەداو ئەمریکا و ئوستڕالیا و ئەمریکای باشوورەوە. دوو کتێبی تازە لە بنکەکانی بڵاوکردنەوە. چەند گۆڤارێکی بچووکی تر. شتێکیش کە لە بڵاوکراوەی پزیشکی دەچوو، چەند وەسڵێکی پارەیش.

زەرف و بەستراوەکانم لەسەر کورسیەک دانا، ژمارەکانی هورایزن و نیوراپیتینگ و ئینکاونتری و لەندەن مەگەزین و کۆمەڵێکی باش لە کتێبی سەردەم کە لە قەفەزی دەوران دەوری ژوورەکەدا دانرابوون، یادگاری بیست ساڵ لەوەوبەریان بۆ زیندو کردمەوە کە تازە هاتبوومە ئینگلستان.

هێشتا ئەو زەرەرانەی کە بومبباران دابوونی مابوونەوە. ڕیزەکان، کۆبوونی خواردن، جگەرەی قاچاخ، باری ناخۆشی گشتی خەڵک، لەگەڵ ئەمانەیشدا، ئەو قۆناغە لای من خۆشترین قۆناغی ژیانم بوە. ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە ئەوسا لاوبووین و پڕ لە هیوا و هیچ لەو شتانەمان تیا نەبوو کە نووسین پێویستی پێ هەیە. گەلێک لاوی دی لە ناوچە جیاجیاکانەوە هاتبوونە لەندەن، لە کافەو ریستورانتەکاندا. بەتایبەتی جولاینز، مەیخانەیەکی فەرەنسی، کافەی دوفرانس، مان درێکدا یەکترمان دەبینی، پاشان پێکەوە لەوێوە دەچووین بۆ شوێنێکی تر. لەبیرمە چووم بۆ دیدەنیی کەنەداییەکی تری دانیشتووی مونتریاڵ کە ڕۆمانی دەنووسی. لە ئاپارتمانێکی نزیک بە گۆڕەپانی فتبۆڵینی چڵسیدا بوو.

(کە گۆڵیان دەکرد ئێمە دەمانزانی) لە هەمووی زیاتر ئەو ڕۆژە سارد و شێدارانەی زستانم لەبیرە بەو تەمتوومانە خەستەیەوە. لەو تەمتوومانەدا، تەنیا چرای ڕێنماییەکان دەبینران. پاشان گەرما خۆشەکەی ناو ئاپارتمان خواردنەوەی شەرابی گەرم لە پاڵ ئاگری کوورەی دیواردا، لەبارەی نووسینەوە، ئەوەی دەماننووسی، شوێنی چاپ کردنیان، بە بڕواوە چیرۆکمان بۆ نیویۆرکەرو ئاتلانتیک دەنارد. بەڵام ئەم کارە لە کڕینی بلیتی یانەسیب دەچوو. بڵاوکراوە بچووکەکان چیرۆکی ئێمەیان چاپ دەکرد، هانیان دەداین کە لەسەر کار بەردەوام بین.

خاتوو واتەرزم لە بیرە، ئەو ژنە تەمەن پەنجا ساڵە ڕەنگ پەڕیوە قژ زەرد و تەنکە کە پشیلەیەکی ماڵی هەبوو، سەرنووسەری گۆڤارێکی بچووکبوو کە باپیری دایمەزراندبوو، وێنەی تنیسون، پیتزو دیلان تۆماسی بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، قەفەزەی داری هێلانە کۆتری، وەک ژووری دەسەبەنی بەڕێوەبەرایەتی پۆست، ژمارە کۆنەکانی گۆڤارەکەیان تیا ڕێکخستبوو. ئەو نەیدەزانی من کەی بۆ ئەوێ دەچم، بەڵام هەمیشە بەم ڕستەیە پێشوازیی لێ دەکردم. «چەند خۆشحاڵم بە بینینت وەرە ژوورەوە»

بەرەو لای ژوورە تاریکەکەی دانیشتن لە پێشمەوە دەڕۆشت، داوای داکەندنی پاڵتاوەکەی لێ

دەکردم، قاپێک شەرابی دەهێناو پەرداخی پڕ دەکرد و پاشان جگەرەیەکی وێ دەدام.

ئەو کاتەی تەنیا چەند چیرۆکێکم چاپ کرابوو، ئەم ژنە بەڕاستیی وەک نووسەرێک ڕەفتاری لەگەڵما دەکرد. ئەمەیش زۆر کاری لێ دەکردم و توانام بەهێزتر دەبوو. دوای پەرداخێک شەراب و جگەرەیەکی دی، دوای ئەوەیش کە پرسیاری لێ دەکردم سەرقاڵی نووسینی چیم و باش گوێی لێ دەگرتم، دەیوت باوکی هەزار پاوەنی بۆ شیعرێکی کورت داوەتە تنیسون و دوو هەزار پاوەنیشی بۆ چیرۆکێکی کورت داوەتە جۆرج ئەلیوت (مەبەستی ئەوە بوو تێم بگەیەنێت کە نووسین پارەیشی تیایە) ئینجا دەچووینە ژوورێکی تری زۆر پاک و ڕێک و پێک. گۆڤارەکان وەک کەشکی ڕۆژنامە فرۆشتن بەسەر مێزەکەوە دانرابوون و کتێبی ناو قەفەزەکان کتێبخانەی وەبیر مرۆڤ دێنایەوە.

دەیپرسی: «کتێبێک هەیە حەزی لێ بکەیت و ڕەخنەیەکی لەسەر بنووسیت؟»

یەک دوو ڕۆمان یان کۆمەڵە چیرۆکێکی هەڵدەگرت. پاشان دەیوت: «چوار کتێبی دی لەو دەستەیە هەڵبگرە»

ئەو دەستەیە لەو کتێبانە بوون کە ئەو حەزی نەدەکرد ڕەخنە بکرێن. لە یەکەم دیداردا پێی وتبووم ئەو کتێبانە بەرم بۆ کتێبخانەیەک لە شەقامی ستراند. ئەو کتێبخانەیە بە نیوە قیمەت کتێبەکانی دەکڕی و دەیفرۆشتنەوە بە کتێبخانەی گشتی. بەڵام پێش ئەوەی پارەکە وەربگرم دەبوو دەفتەرێک واژۆ بکەم کە لە دەفتەری یادەوەری دەچوو. لەو دەفتەرەدا، لە سەرو ناوی خۆمەوە، واژۆی ڕەخنەگرە ناودارەکانی ڕۆژانی یەکشەمەو ڕۆژانی تری هەفتەم دەبینی، ئەوانیش بە نیوە قیمەت کتێبەکانیان دەفرۆشت.

لەبیرمە کز و بێ پووڵ دەچوومە ماڵیان — زەرفی ڕەنگ قاوەیی لە پشت دەرگاکەیەوە کەوتبوو — بە گوڕ و تینەوە لەوێ دەردەچووم. لە فرۆشتنی کتێبەکان چەند پاوەنێکم دەست دەکەوت. بەس بوو بۆ کڕینی هامبەرگەرێک و کوپێک قاوە و پاکەتە جگەرەیەکی چکۆڵە. کارێکە دەبوو بیکەم، پێویست بوو کتێبەکان بە نەخت بفرۆشم، ئەو ژنە بەردەوام پارەی کارەکەی پێشەکی حساب دەکرد.

پێش خاتوو واترزیش کەسانی تر هەبوون. راوێژکاری چاپەمەنی سەفارەتی نەرویژ لە لەندەن کە گۆڤارێکی بچووکی نەرویژی بە زمانی ئینگلیزی بڵاودەکردەوە. گۆڤارێکی تر لە هیندستان هەر بە زمانی ئینگلیزی. یەکەمین چیرۆکەکانم لەو دوانەدا چاپ کران. کاتێک دانەیەک لەو گۆڤارە هیندیەم بەدەست گەیشت، بینم کارەکتەرە کەنەداییەکانم بوونەتە هیندی. سەرنووسەرێکی تریش هەبوو کە شقارتەی پیاوی بە قەرز وەردەگرت، کە بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە، دەتبینی گەڵایەکی یەک پاوەنی خستۆتە ناوی.

هەموو ئەمانە، وەک گۆڤارەکانیان ڕۆشتوون.

شتێکی تریش لەگەڵ ئەواندا ڕۆشتوە.

ئەو ڕۆژە بێ خەم و خەفەتانەی هەر کاتێک بتویستایە دەتنووسی، ئەگەر حەزیشت لێ بوایە تا قرچەی نیوەڕۆ دەنووستیت. دەیشتزانی نیوەڕوان مرۆڤگەلێکی وەک خۆت لە جێگای تایبەتدا دەبینیت. ئێستا بەیانیان، دوای بەرچایی، چاوەڕوانی گەیشتنی پۆست دەکەم، پاشان دەچمە قاتی

سەرێ و دەرگاکە لە دوای خۆمەوە دادەخەم، خۆم ناچار دەکەم بەسەر ڕۆمانێکمەوە، چیرۆکێکی تازەمەوە، یان وتارێکەوە کە گۆڤارێکی دەست و دڵ کراوە داوای لێکردووم، کار بکەم. کاتی نیوەڕۆژە واز لە کار دەهێنم. پاشان جارێکی دی دەگەڕێمەوە سەرێ تا سەعات چوار، هەندێک جار رۆژێک دەدەمە پشوو، سواری ئۆتوبوس دەبم و بە دەوری شاردا دەگەڕێم. هەر دەڵێی لە بیرم کردوە کە لە سروشتا ئەم هەموو رەنگە هەیە. یان بۆ چەشناو چەشنی سواری شەمەندەفەری هاتوچۆی پلیموت دەبم.

بەڵام بێجگە لەمانە، جێی هەمیشەیی من سەر پلیکانەو ئەم ژوورەیە. ئیدی چی توانام هەیە لە کاردا بەکاری دەبەم. جگەرەی بەرگ هۆڵەندیەکی بچووک دادەگیرسێنم و هەندێک جار لەگەڵ خۆمدا قسە دەکەم. ئێستا تەواو لەوە دڵنیام ئەوەی نوسیومە چاپ دەکرێت. ئیدی نووسین بوەتە هۆی بژێوی من.

هەڵبەتە هێشتا ڕۆژانێک هەن هەموو شتێک باش بەڕێوە دەچێت و زۆر لەبارن. بێگومان نەک وەک ئەو رۆژانەی کە ژیان و نووسین تەواو پێکەوە ئاوێتە بوو بوون. ئەوسا، بڕوام بەو گۆڤارە چکۆلانانە هەبوو، بەڵام ئەوەم نەدەزانی ئەوەی ئەوان پێی دەگەیەنن پەتایەکە بۆ خۆی. ئەو گۆڤارانە ئەو بیرانەیان خستە مێشکی زۆر لە لاوەکانەوە کە سەروکار لەگەڵ ئەدەبیاتدا بە مانای ئەوەیە ژیانت خۆش دەبێت. کاتێک لە ڕاستیەکە تێدەگەیشتیت کە تازە کار لە کار ترازابوو.

دەبوو رۆژی هەینی زوو لە خەو هەستم، وا بڕیار بوو ئەو بەیانیە لە بەشی مارپێچی ڕووبارەکەدا، لە بەلەمێکدا، لەگەڵ بەرنامەیەکی تەلەفزیونی کەنەدی دیدارێک بکەم. بۆ نانخواردنی نیوەڕۆیش دەبوو لەگەڵ بڵاوکەرەکەمدابم.

لە بەیانی زوودا ڕووبارەکە گەلێک دڵگیر و خۆش بوو. خۆر بەسەر ئاوەکەوە دەدرەوشایەوە، ئەوانەی دەچوون بۆ سەر کار وەستابوون و تەماشایان دەکرد. تەماشای منیان دەکرد چۆن سەوڵم لێ دەدا، چۆن ئەوەی چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵدا ساز دەکردم، لەگەڵ وێنەگر و تۆمارکەری دەنگ و کەرەسەکاندا ڕام دەکێشان، وەڵامی پرسیارەکانیانم دەدایەوە کە بۆ لە کەنەدا ناژیم یان هەر بۆ دەنووسم.

بڵاوکەرەوەکەمم لە یانەکەیدا بینی، ئەمریکاییەکی خەڵکی بۆستنە. سەری رووتاوەو کورتە باڵایە. مارتینیەکمان خوارد و یەکێکی تریش. پاشان چووینە هۆڵی نان خواردنەوە. یەکەمجار ماسی و، پاشان مراویمان بە شەرابەوە خوارد. دوای ئەوەیش میوەو شیرینی، کۆتایمان بە قاوەو جگەرەیەکی هاڤانایی هێنا.

بڵاوکەرەوەکە لێی پرسیم پێم باشە کتێبەکەم بە چ قەبارەیەک بێت، ئاخۆ دەتوانم نووسینی بەرگی کۆتایی بۆ بنێرم. وتی تیراژەکەی چەند بێت. چونکە ڕۆژنامەیەکی یەک شەموان بەتەمایە پێش بڵاوکردنەوەی کتێبەکە پوختەیەکی لێ بڵاوبکاتەوە، دەنگۆیەکی دەربارەی نووسەرانی تر و بڵاوکەرەوەکان و کارگوزارەکانی تری ئەدەبی بۆ باس کردم. پرسیاری ئەوەی لێ کردم ئێستا چی دەنووسم و لەکام بەشی بڵاوکراوەکاندا دەیدەمێ.

سەعات لە چوار تێپەڕیبوو کە تاکسیم گرت و بۆ ماڵەوە گەڕامەوە.

هاوسەرم پرسی: چۆن بوو؟

وتم: خراپ نەبوو، ئەی باخی ئاژەڵان چۆن بوو؟

تازە دەستی بە باس کردنی کردبوو گوێم لە دەنگێک بوو، لەوە دەچوو لای دەرگای پێشەوە بێت. چووین بزانین چیە.

پیاوێکمان غافڵگیر کرد دەیویست بە کلیل دەرگاکە بکاتەوە. تەمەنی شەستساڵێک دەبوو، کورتە باڵاو کەتەبوو، پاڵتۆیەکی مشەمای کۆنی لەبەردا بوو.

بە تەریقیەوە پرسی: دوکتۆری لێیە؟

وتم: نەخێر، لە پشوودایە.

«بمبوورە، من لە ساسیکەوە هاتووم، هەر کاتێک بێم بۆ لەندەن بۆم هەیە شەو لێرە بنووم.

بە زمانیا دیار بوو خوێندەوارە.

وتم: بە داخەوە، ئێمە بۆ ماوەی سێ هەفتە ئێرەمان بە کرێ گرتووە.

«هەر کاتێک بێم بۆ لەندەن، دەتوانم لێرە بخەوم»

وتم: «ببوورە جێگامان نیە»

«ناوم جۆرج سمیتە. ئی. بی. سی کارەکانم چاپ دەکات، من شاعیرم»

«خۆشحاڵم، ئێمە تا دە ڕۆژی تر لێرە دەبین و دەڕۆین، فەرموو وەرە ژورێ و پەرداخێک خواردنەوە بنۆشە.

کە کۆنیاکم بۆ تێدەکرد ناوی دوا کتێبیم لێ پرسی.

وتی: کتێبێکی شیعریی هەیە و دەست نووسەکەیشی بۆ بڵاوکەرەوە ناردوە، ناوی بڵاوکەرەوەیەکی بەناوبانگی برد.

«وەلێ هەواڵی نیە»

وتم: «نیشانەی باشیە»

وتی: «ڕەنگە ونیان کردبێت، یان ئەوانیش وەک دوکتۆر چوونەتە پشوو» قوتوویەکی بچووکی لە گیرفانی دەرهێنا، کەمێک تووتنی دەرکرد و کەوتە پێچانەوەی جگەرە، دانەیەکیشی بۆ من پێچایەوە.

پرسیم: «لەکەیەوە کتێبەکەتیان لایە؟»

«نزیکەی پێنج مانگە»

کۆنیاکەکەی تەواو کرد، پەرداخێکی ترم بۆ تێ کرد.

وتم: «ئەگەر من بوومایە تەلەفوونم بۆ دەکردن و دەچوومە بنج و بناوانی، یان شتێکم بۆ دەنووسین»

«بە چاکی دەزانیت ئەو کارە بکەم؟»

«بەڵێ»

ویستم تا بەردەرگا ڕەوانەی بکەم، وەلێ تا وێستگەی پاسەکان لەگەڵیا چووم.

شەقام پڕ لە درەختی زمانە چۆلەکەبوو. میوەی ڕەنگ قاوەیی رژابوە سەر چەمەن و شۆستە و

شەقامەکە.

بە فیزێکەوە وتی: «نامەیەکی تی. ئیس. ئەلیوتم لابوو، هەموو ئەم ساڵانە هێشتبوومەوە. بەڵام مانگی پێشوو فرۆشتم بە پەنجا دۆلار. کچەکەم شووی دەکرد و دەبوو دیارییی بۆ بکڕم» پێم وت شەو لە کوێ دەبێت.

وتی: «یەک دوو جێگای ترم هەیە، هەر شەش هەفتە جارێک دێم بۆ ئێرە، لەندەن مەڵبەندی بازرگانیمە»

چووم و بەستەیەک جگەرەم بۆ کڕی.

وتی: «سوپاس»

پاسە سوورەکە هات و تا سوار بوو چاوەڕێم کرد.

کە گەڕامەوە هاوسەرم وتی: «چاکە، باشتر بوویت؟»

وتم: «نا»

لە هەموو ئەو ماوەیەدا کە لەوێ ماینەوە، کار وا بەڕێ دەچوو، مرۆڤی جۆراو جۆر لە بەردەرگاکەدا سەوز دەبوون، کچێکی موو زەرد کە دەیویست لە پێناوی ئەدەبیاتدا هەموو سازشێک بکات. وتاربێژ و مامۆستا میوانەکانی زانکۆی ئەمەریکی و کەنەدی و ئینگلیزی. کابانی ماڵ. یەکێک لەوانە لە پشت تەلەفوونەوە دەیگوت، «بۆ ئەوەی بەرهەمەکەم چاپ بکرێت ئامادەم هەر کارێک بکەم» ئەو تەلەفوونانەی لە شوێنی دوورەوە دەکران، یەکێک لە دوای نیوەی شەوەوە تەلەفوونی کرد، لە خەوی هەستانین و وتی: «چ کارێکی گرنگم نیە، هەر ویستم تۆزێک ڕابوێرم، ئێمە هەندێک جار لەم کارانە دەکەین. چیرۆکەکانم لە ئەی. بی. سی دا بڵاوکراوەتەوە» دەتوت دنیایەک خەڵک بەو گۆڤارە چکۆڵەیەوە بەستراوەتەوە.

هەوڵم دەدا چەند بتوانم کاتێکی خۆم لە دەرەوەی ماڵەوەدا بگوزەرێنم. چووم بۆ لای کارگێڕەکەم، بە بڕی چوارسەد دۆلار چەکێکی پێ دام کە هەقی فرۆشتنی چیرۆکێکم بوو. هەڵبەتە کۆمیسیۆنی خۆی لێ هەڵگرتبوو. داوەتی نیوەڕۆ خۆری کردم. دەربارەی بڕی ئەو پارەیەی پێشەکی دەدرێت، پاداشتی نووسەر کە بڵاوکەرەوەکانی کتێب بە نووسەرەکەیان دەدا. فرۆختی باشی ئەو کتێبانەی کە چیرۆک نین بە بەراورد لەگەڵ کتێبی چیرۆکدا، قسەمان کرد. لە یانە و ریستۆرانتە گرانەکانی تردا نووسەرانی دیم بینی. لەگەڵیاندا باسمان لەوە کرد کام نووسەری تەمەن مام ناوەند دەیەوێت لە ژنە تەمەن مام ناوەندەکەی جیا بێتەوەو لەگەڵ کچێکی گەنج تردا هاوسەرگیری بکات. کام بڵاوکەرەوەیش وازی لە دەزگاکەی دەهێنا بۆ ئەوەی دەزگایەکی بڵاوکردنەوەی تایبەت بەخۆی دابمەزرێنێت. زانیم دەرچوونی چ گۆڤارێکی تازە بەڕێوەیە و کێ باشتر پاداشتی نووسین دەدات.

پاشان دەگەڕامەوە لای ئەو تەلەفوونەی بەردەوام لێی دەدا، هەروەها ئەو نامە زۆر و ئەو کەسانەی بە شەوقەوە بۆ باس کردنی ئیستاتیکا لەبەردەم دەرگاکەدا سەوز دەبوون. لاوەکانی بێزاریان نەدەکردم، بەڵام حەزم بە هاوتەمەن و لە خۆم گەورەتر نەدەکرد. حەزم بەو هەستی خۆبانتر زانینەی خۆیشم نەدەهات، لەوانەیشە هەست کردن بێت بە گوناە؟ نازانم. بەڵام ژن و منداڵەکانم خۆشیان بەسەردەبرد. چوو بوون بۆ مۆزەخانەکانی ڤیکتوریا و ئالبرت و مۆزەخانەی نیشتمانی و تەیتی،

لە هەموویانەوە کارتیان هێنابوو، لە پشتیان دەنووسین و بۆ هاورێکانیان دەناردن، بۆ یەک دوو سەماگاو شانۆ چوو بوون. ڕۆژێکیش بۆ پارکی ریچموند، ڕۆژێک بۆ هەمپتون کورت و ڕۆژێک لە ڕووباری تایمزدا سواری بەلەم ببوون. حەزیان نەدەکرد پشوو تەواو بێت و بگەڕێنەوە. بەڵام من گەڕانەوەم پێ خۆشبوو، ڕۆژانی ئەی. بی. سی. بۆ من تێپەڕی بوون. دەمویست هەڵبێم. بڵێی هۆی ئەوە بێت کە لاویەتی خۆمی بیردەخستمەوە؟ یان قۆناغێک بەڵێنەکانی نەهاتبوونە دی؟ بە خۆم وت لە هەموو ئەم شتانەدا لایەنێکی ناڕاستەقینە هەبوو ژیانی ئەو سەردەمەی ئێمە لەسەر بنەمای ئابووری دانەمەزرابوو — کە سەردەمانێکی ناجێگیر بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا کە من هەموو ئەم شتانەم دەزانی، بیرەوەریی ئەو قۆناغە وەک نەخش لە بیرمدا هەڵکەنرابوو. بیرەوەریی بێگەردیەک کە ئیدی بوونی نەبوو.

ڕۆژی شەممە، کە چاوەڕێی تاکسی بووین بمانگەیەنێتە وێستگەی پەدینگتن، تەلەفوون لێی دا، کچێک هەواڵی چیرۆکێکی خۆی پرسی. وتم: دوکتۆر لێرە نیە، چەند سەعاتێکی تر دەگەڕێتەوە دەبێت شەو تەلەفوونی بۆ بکات.

«سەعات چەند؟»

«دوای نۆ»

پرسی: «تۆ چیرۆکەکەمت خوێندۆتەوە؟ بەلاتەوە چۆنە؟»

وتم: «ئێمە تەنیا ئەمماڵەمان بەکرێ گرتبوو، بۆ پشوو هاتبووینە ئێرە»

وتی: «ئاە، کەواتە لە ئێمە نیت؟»

«نەخێر»

تاکسیەکە گەیشت، شۆفێرەکە جانتاکانی پێچاینەوەو خستنیە ناو سنووقی دواوە.

## پەراوێزەکان:

1-norman Levine

2-canada made me

٣-ئەو کەسەی لە سێرکدا بە سەرپەتا دەڕوات (the tight – rope walker)

4-the angled road

5-from a sea side town

6-one way ticket

7-thin ice

8-champagne barn

## سەرچاوە:

کۆمەڵە چیرۆکی: معامله پر سود و داستانهای دیگر. ١٣٨٤ انتشارات نیلوفر.

# شەڕ

## پێنج هەڵۆیستە شیعر سەبارەت بە شەڕ

لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

### شەڕ.....

ستیڤن هێڵداک

شەڕ ناکۆکی براکانە
شەڕ تەقینەوەی بۆمبەکانە
شەڕ گریانی دایکانە
شەڕ کەڵەکەبوونی تەرمەکانە

شەڕ دواکەوتنی فەرمانەکانە
شەڕ کۆتایی گەنجێتیە
شەڕ بەربوونەوەی ناپاڵمەکانە
شەڕ بەفیرۆدانی کاتە

شەڕ تێکەڵکردنی خوێنە
شەڕ خەمابرییەکی ڕاستەقینەیە
شەڕ قوڕێکی تەڕە
شەڕ دواین سنوری شێتێتیە.

شەڕ مردوە بێتاوانەکانە
شەڕ زیاد لە فرمێسکێکە
شەڕ میوانێکی قێزەونە
کە چەندین ساڵ دەخایەنێت.

### ماناکانی شەڕ

ئۆسکار مۆنتانۆ

شەڕ واتە بۆمب
شەڕ واتە تەقینەوەکان
شەڕ واتە ئاگر
شەڕ واتە وێرانکاری
شەڕ واتە ڕق
شەڕ واتە شێواندان
شەڕ واتە کوشتن
شەڕ واتە فرمێسکەکان
شەڕ واتە تفەنگەکان
شەڕ واتە خەسارەت

شەڕ مانای ئەوە نیە کێ ڕاستە
شەڕ مانای ئەوە نیە کێ هەڵەیە
شەڕ واتە کێ جێماندێڵێت

## شەڕی من

داکۆتا بۆردیۆ

شەڕی من تفەنگی نیە
شەڕی من کۆتایی نییە
شەڕی من دۆست و دوژمنی تیادا نیە
شەڕی من لەناو خۆمدایە
شەڕ من باش نیە
شەڕی من خراپیش نیە
شەڕی من شەڕ نییە.

## شەڕ

جاکرابیت کریس

شەڕ پیشەی شەیتانە
شەڕ ئەوەیە کە چۆن بریندار دەبین
شەڕ ئەوەیە کە چۆن کۆتایی بە ژیانی ئەو دێت
شەڕ ئەوەیە کە چۆن وام لێدەکات بگریم
شەڕ خێراترین ڕێگەیە بۆ مردن
شەڕ نەمانی ڕێگەی ژیانە
شەڕ ئەوەیە کە چۆن وام لێدەکات ڕقم هەڵسێت
شەڕ نایەڵێت بیربکەینەوە
شەڕ ئەوەیە کە لەنێوان ڕەگەزدایە
شەڕ ئەوەیە کە لە نێوان وڵاتێکدایە
شەڕ هەمیشە لەبەردەرگایە
شەڕ ڕاوکردنە
شەڕ چاوەڕوانییە
شەڕ ئەوەیە کە چۆن هەمیشە ڕابکەین
شەڕ ئەوەیە کە چۆن زۆرێک هەڵگری قیذن
شەڕ ئەو دەرمانەیە کە وەریدەگرین
شەڕ لە هەموو شوێنێکە
شەڕ ئەوەیە کە چۆن وامان لێدەکات سوێند
بخۆین
شەڕ ئەو جلانەیە کە لەبەری دەکەین
شەڕ ئەوەیە کە چۆن وامان لێدەکات وەئاگا
بێینەوە
شەڕ ئەوەیە کە چۆن وامان لێدەکات بترسین
شەڕ هەمیشە لێرە دەبێت
شەڕ ئەوەیە کە چۆن وامانلێدەکات بترسین
شەڕ ئەوەیە کە چۆن وامانلێدەکات فرمێسک
بڕێژین
شەڕ لێرەیە.

## شەڕ

کریستین ڕۆزێندتاڵ

شەڕ شەڕە
شەڕ واتە مردن
شەڕ واتلێدەکات بگریت
شەڕ لە خەمدا جێتدەهێڵێت
شەڕ کوشتنی خەڵکە
شەڕ نایەڵێت هەست بە باشی بکەیت
شەڕ توشی شۆکت دەکات
شەڕ شەڕ شەڕ شەڕ
زۆر شت لە شەڕدا خراپ دەبێت
شەڕ دەتکوژێت
شەڕ واتە شەڕکردن بۆ ژیانی تۆ و ئەوان
شەڕ شەڕ شەڕ شەڕ

### سەرچاوە:

Collected English Modern Poetry. Editing by: Mark Slaughter. Oxford Press, 2007.

# وێستگەکانی سەردەم

وێستگەکانی

## سەردەم..

گۆتە.. شاعیری مەزنی ئەڵمانیا

کۆبنهاگن مۆم بۆ خوان میرۆ دادەگیرسێنێت

ئەدگار ئالان پۆ.. ژیانێکی زۆر کورت

ئەدۆنیس، جادوبازی وشەکان

ئەوروپا حیجاب توندوتیژی

جینۆساید.. تیۆرەو پراکتیك

کۆچی دوایی خاوەنی کتێبی ڕەخنەلە عەقڵی عەرەبی

جابری لە فەرەنسا ناسراوە

کۆچی دوایی ساراماگۆ.. شاعیری ئازارەکانی مرۆڤایەتی

کەس ئاگای لە پشیلە ئێرانییەکان نییە



# گۆتە..
# شاعیری مەزنی ئەڵمانیا

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد

**لەم** دواییەدا کتێبێک لە دەزگای چاپ و پەخشی نەینەوا لە دیمەشق چاپ کرا بە ناونیشانی «گۆتە.. مەزنترین شاعیری ئەڵمانیا»، لە نووسینی محمد سعید الطریحی، کە باسی ژیان و بەرهەمەکانی ئەم شاعیرە دەکات.

نووسەری ئەم کتێبە بەدرێژی باسی ژیانی گۆتەو نەخۆشییەکانی دەکات، هەمیشە گرفتی تەندروستیی هەبووەو بەدرێژایی ژیانی دوچاری نەخۆشیی سیل بووە، کەچی کۆڵی نەداوە لەوەی خوێندنی ماف تەواو بکات، ئەوەبوو دواتر لە زانکۆی ئان دێرلاهن لە کۆلێجی ماف بڕوانامەی لیسانسی وەرگرت، لەتەمەنی بیست و شەش ساڵیدا بوو بە یەکێک لە نووسەرە ناودارەکانی ئەڵمانیا، ژمارەیەک کتێبی گرنگی چاپ کرد، لەوانە: بێرلنکن، ئازارەکانی ڤارتەر، فاوست.

لەقۆناغێکی دیاریکراوی ژیانیدا دوچاری ئەوین و خۆشەویستی دەبێت و ژیانی دەکەوێتە مەترسییەوە،

بۆیە ناچار دەبێت ئەڵمانیا جێبهێڵێت و بەرەو ئیتالیا کۆچ بکات، لەوێ ژیانێکی تازەی دەست پێکردەوەو لەگەڵ کچێکی گوڵفرۆشدا پەیوەندیی بەست کە دواتر چەند منداڵێکی لێبوو.

کاتێک تەمەنی گۆتە بەرەو ژوور هەڵدەکشێت، قەڵەو دەبێت و جەستەیەکی نارێکی دەبێت و روخسارێکی خەمۆک و رومەتێکی پیرو ملێکی گۆشتن و دوو چاوی هەمیشە ماندوو، بەڵام هەوڵی دەدا رۆحی بەداگیرساوی بمێنێتەوەو شانازی بە گەنجبوونی خۆیەوە بکات، تەنانەت لە تەمەنی حەفتا ساڵی و هەشتا ساڵیدا کە قۆناغی شوهرەت و ئەفسانەیی ئەو بوو، دانی بە پیریدا نەدەنا.

نووسەری ئەم کتێبە لەبەشێکی تردا تیشک دەخاتە سەر لایەنی داهێنانەکانی گۆتەو باس لەوە دەکات کە هەر لەتەمەنێکی زووەوە لەسەر شێوەی فەرەنسی شیعری هۆنیوەتەوە بە ئیقاعی کۆنی یۆنانی، بەڵام شیعرەکانی لەگەڵ گیانی سەردەمدا دەگونجا، زۆر بەناسکی و بەشێوەیەکی سەرنجراکێش وشە شیعرییەکانی هەڵدەبژارد.

گۆتە بە ماندووبونێکی زۆرەوە بەشی دووەمی شاکارەکەی بەناوی «فاوست» تەواو کرد، چونکە لەو کاتانەدا لەشی بەتەواوی داهێزرابوو، پێشتر چەند بەشێکی لێ بڵاوکردبۆوە، بەتایبەتی بەشی «هێلین» کە لە زۆربەی گۆڤارە فەرەنسی و رووسییەکاندا بڵاوکرایەوە. گۆتە بەدرێژایی ژیانی لەگەڵ ئەو حزبانەدا ناکۆک بوو کە باوەڕیان بە خۆڕسکییەکی تەندروست نەبوو، بگرە گۆتە بە حەماسەوە باسی توانای خۆڕسکانەی ئینسانی دەکرد لە داهێنان و خوڵقاندندا.

گۆتە لەتەمەنێکی زووەوە کەوتبووە ژێر کاریگەریی مێژوو و شیعری خۆرهەڵاتەوە، لەمیانی وەرگێڕانی خۆرهەڵاتناسەکانەوە بابەتە شیعرییەکانی سەردەمی جاهیلی بەر لە ئیسلامی دەخوێندەوە، بەتایبەتی موعەللەقاتەکانی ئیمرولقەیس و زوهەیر بن ئەبی سولما و تەرەفە بن عەبد و عەمرو بن کەلسوم. هەروەها گۆتە سەرسام بوو بە کەسایەتیی موحەممەد پێغەمبەری موسڵمانەکان، دواتر قورئانی خوێندەوە، دەیویست چیرۆکێک لەسەر ژیانی موحەممەد و ئیمامی عەلی بنووسێت، بابەتێکی درێژی نووسی و چەندین ئایەتی لە سورەتی ئیبراهیم خواستبوو، دیسان سەرسام بوو بە چیرۆکەکانی کلیلەو دیمنە، کە لەسەر زمانی ئاژەڵ چەندین پەند و حیکمەتی جوان فێری بەشەریەت دەکات، هەروەها شانامەی فیردەوسیی دەخوێندەوەو شیعرەکانی نیزامی گەنجەوی بەسەر دەکردەوەو داستانەکانی شیرین و خوسرەو و مەجنون لەیلای دەخوێندەوەو سەرسام بوو بە شیعرەکانی سەعدی شیرازی و جەلالەدینی رۆمی، سەرجەمی ئەم بەرهەمە ناوازانەی شاعیرانی خۆرهەڵات کاریگەرییەکی روونیان لەسەر بەرهەمەکانی ئەم شاعیرە مەزنە ئەڵمانییەدا هەیەو لە بەشێکی بەرهەمەکانیدا رەنگ دەدەنەوە.

**سەرچاوە:**

مسارات البیان، آیار ٢٠١٠

# مایاکۆڤسکی، شیعر، فۆتۆریزم

لە فارسییەوە: هادی محەمەدی

**مایاکۆڤسکی** شاعیری فۆتۆریست و شۆڕشگێڕی روسی، لە ساڵی ١٨٩٤ لە وڵاتی گورجستان لە دەڤەری قەفقاز لەدایک بووە.

ئەو لە ژیاننامەی خۆیدا دەنووسێ: «منم ڤلادیمیر مایاکۆڤسکی»، رۆژی حەوتی مانگی ژووئیە، ساڵی ١٨٩٤ لەدایک بووم.

بەهەر حاڵ سەرتاسەری ژیانی مایاکۆڤسکی خەبات و داهێنان بوو. ئەزموونەکانی ژیانی، کاریگەری قووڵی لە شیعریدا و لە گەشەی ستایلی فتوریزم و لە بەرهەمەکانیدا هەبوو.

مایاکۆڤسکی تا ٢٠ ساڵان سێ جار گیرا و زیاتر لە ساڵێک وەک زیندانی سیاسی بەند کرا.

دواتر بە ناسینی پیاوانی بەناوبانگی رووسی، ڤاسیلی کامنسکی و بورلیوک، قۆناغێکی نوێ لە ژیانی دەستی پێکرد.

«بە درێژایی ئەو رۆژە توانیبووم شیعرێک بڵێم، یان باشتر بێژم، چەند بڕگە لە شیعرێک، شیعرێکی ئێجگار خراپ کە قەت بڵاونەکرایەوە، لە پارکی سرێتنسکی چەند بەشێکم بۆ بورلیوک خوێندەوە و وتم «ئەوە شیعری یەکێ لە هاوڕێیانمە»، ئەو بەرانبەرم وەستا و چاوی لە نێوچاوانم بڕی و هاواری کرد: «نا ئەوە شیعری خۆتە، تۆ شاعیرێکی بلیمەتی... «ئەو شەوە لەپڕ بووم بە شاعیر»! بێگومان ستایلی فوتۆریزم لە روسیا بەهۆی کەسێتی مایاکۆڤسکی و هەوڵ و تێکۆشان و بەرهەمەکانی ئەو گەشەی کرد و پەرەی سەند.

مایاکۆڤسکی پاش دۆڕانی ئەڤینی ماریا دنیسڤا، کچێکی خەڵکی ئۆدسا، لە مانگی ژانویەی ١٩٢٤دا بەپێی ستایلی فۆتۆریزم شیعری هەوری پانتۆڵ پۆشی نووسی، لایەنگرانی رەوتی فوتۆریست بەجۆرێک پێشوازییان لەم شیعرە کرد کە وەک شاکاری شیعری ئەو سەردەمە ناسرا.

ئەگەرچی ڕەنگە شێوازی نوێی دارشتنی وشەکان و ڕستەکان لەم جۆرە شیعرەدا سەیر بێت، بەڵام پەیامی ڕۆشن و دیمەنسازی بەهێزی ئەم شیعرە، ئێجگار سەرنج ڕاکێشە.

مایاکۆڤسکی سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٣٠ دا، کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا؛ ژیانێک کە پڕاوپڕ لە ڕەنجی عشق و ژانی خەڵک و خەبات لە دژی ستەم و دۆگماتیزم لە ئەدەبیاتی ڕوسیا بوو.

ئەم چەند ڕستە کە ڕەنگە بەشێک لە دواین شیعری مایاکۆڤسکی بێت، پاش خۆکوشتنی لە گیرفانیدا بیندرایەوە:



سەعات دووی نیوەشەوە
تۆ لە شیرینی خەو دای.
لە شەودا کاکێشانی ڕێگای شیری،
ڕوباری زیو دەئاژوێنێ.
پەلە ناکەم؛
پەیامێکم نییە تا بە بروسکەی تەلگرام
خەوت لێ بشێوێنم.

دەریا دەکشێتەوە
دەریا دەخەوێت
وەک دبێژن، کارەسات نزیکە.
بەلەمی عشق بە گاشەی ژین تێکدەشکێ.
لەپاش خەم و ژان و ئازارەکان
هەموو شتێ لەنێوانمان کۆتایی دێ.

بڕوانە دنیا چ کش و مات خەوتووە.
شەو باج دەدا بە ئاسمان بە زیوی ئەستێرەکان
لەم ساتەدا مرۆڤ هەڵدەستێ
تا لەگەڵ مێژوو و سەردەمەکان و
گشت ئافراندنەکاندا بدوێ.

**سەرچاوە:**

ئینتەرنێت- سایتی ڕۆشنگەری.

# بە بۆنەی ١١٧ ساڵەی لە دایك بوونەوە

# کۆبنهاگن مۆم بۆ خوان میرو دادەگیرسێنێت



لە عەرەبییەوە: فەرهاد

**من** وەرشەی کارەکەم، وەک باخێکی سەوزەواتی ماڵان دێتە بەرچاو، کەرەستەی وێنەکێشان و کۆڵین و شتەکانی دی لە ڕوەکی ناو ئەو باخە دەچن، سەوزەکان لە گەشەکردندان و هەموو شتێک لێرە ژیانی لێ هەڵدەقوڵێت. منیش، لەم نێوەندەدا، لە باخەوان دەچم «ئەمە قسەی هونەرمەندی ئیسپانی خوان میرۆ (١٨٩٣-١٩٨٣)ە» کە ڕەخنەگرەکان ئیلهامی ناونیشانی پێشانگاکەیان لێ وەرگرت بە ناوی «مێرۆ.. باخەوانی هونەر» ناونیشانەکە تەواو لەگەڵ رەوتی ژیان و هونەر و رۆحی ئەودا دەگونجێت کە هەمیشە بە سروشتەوە بەستراوەتەوە. میرۆی هونەرمەند بۆ دۆزینەوەی

هەقیقەت پەیوەندییەکی پتەوو هەمیشەیی بەو شێواز و ڕێبازە سەرەتاییانەی سروشتەوە هەبوە کە لە زۆر کۆبونەوە هەبوون.

لە پێشانگاکەدا زیاد لە ١١٤ کاری هونەریی میرۆ پیشاندرا بوون کە دابەش بوون بەسەر کاری ئاوێتەیی، پەیکەر و تابلۆی مەسنەدی و چنراوی هونەری، بێجگە لە کاری سیرامیک و پۆستەر. مۆزەخانەی «Arken“ لە کۆبنهاگن ئەم کارانەی لە یادی ١١٧ ساڵەی لەدایک بوونی میرۆدا پیشاندا کە ڕێکەوتی بیستی نیسانی ئەمساڵی کرد.



کارەکانی میرۆ باس لە چیرۆکی هونەرمەندێک دەکەن کە وەک کەسایەتیەکی هونەریی دەگمەن جێگای مشتومڕو سەرسوڕمانە، ئەم کەسایەتیە ئەمەندە بیرۆکە و دید و بۆچوونی زۆری ڕۆناوە کە زۆرجار شرۆڤەکردنیان سەختە و ناچنە ریزبەندی کردنی هیچ لەو خانانەوە کە دیاری کراون و ئێمە دەیانزانین. ئەمە لێکدانەوەی رەخنەگرەکانە بۆ بەرهەمەکانی میرۆ کە بەردەوام جەختی لەوە کردوە کە ئەو دژی فۆرمەڵەکردنیەتی لە جێگا و بوارێکی سنووردارکراودا. ئەگەرچی زوربەی بەرهەمی میرۆ لە پێکهاتەو دەلالەتدا سەر بە سوریالیەتەو ئەمەیش لەگەڵ ڕووبەری تابلۆی بینیندا دەگونجێت. بەڵام لە ڕاستیدا کارەکانی پەیڕەوی کردنەوەیەکی شیعریانەی فەلسەفەی سروشت و کاریگەریەتی لەسەر ڕۆحی مرۆڤایەتی. بۆیە، بەڕای گەلێک لە ڕەخنەگران، کارەکانی میرۆ، گەلێک نەرمیی لەخۆدەگرن لە کاتی ڕاژەکردندا. کەواتە سەیر نیە ئەگەر بۆ تەنیا کارێک، گەلێک لێکدانەوە ببیستین یان بخوێنینەوە… بۆ نموونە تابلۆی «کێڵگە»کەی.

پێشانگاکەی کۆبنهاگن ڕووناکیی خستنە سەر دوا بیست ساڵی تەمەنی خوان میرۆ بوو. واتا لە ساڵی ١٩٦٣ تا دوا کۆچی لە ساڵی ١٩٨٣ دا. کە ئەم ماوەیە قۆناغێکی زۆر گرنگی مێژووی

ئەم هونەرمەندەیە. لەبەرئەوەی چالاکیەکی چرِوپرِی ئەوە لە هونەری پەیکەرتاشی. ئەو دەیویست لەوێوە لە سنووری تابلۆی مەسنەدی یاخی بێت، ئەوەیش یاخی بوون بوو لە سنووری تابلۆی مەسنەدی بۆ بەدیهێنانی ئارەزوویەکی لەوە گەورەتر کە دنیای وێنەکێشان بۆ بیرۆکەکانی دیاریان دەکرد. لێرەدا پێشانگاکەی ساڵی ١٩٧٤ی پاریسمان بیردەکەوێتەوە بە ناوی «کۆشکی گەورە». لەو پێشانگایەدا میرۆ تابلۆی سووتاوی نمایش کرد، کە پێش نمایشکردنەکە سووتاندبوونی.

بەرهەمی خوان میرۆ بۆ ئەو ماوەیەی مۆزەخانەکە تەرخانی کردبوو، پوختەیەکی گرنگی ڕەوتی هونەریی ئەم هونەرمەندەیە، بەتایبەتی کارکردنی لەسەر بیرۆکەی یەکخستنی شیعرو شێوەکاری، شیعر لە ژیانی ئەم هونەرمەندەدا کاریگەریەکی گەورەی بەسەر بیرو دیدگایەوە هەیە. لەو کاتەوە کە شیعری «لویس ئاراگۆن» کاریان لێ کردبوو، هەر ئەمەیش بوو بەهۆی ئەوە کە پاشان بیری سوریالیەکان لە هونەردا کاری تێ بکات، ساڵی ١٩٢٥یش یەکەم مانیفێستی ئەو ڕێبازە واژۆ بکات. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە برِوای میرۆ بە شیعر و کاریگەریەتی، لە ماوەی دوو دەیەی کۆتایی ژیانیدا وای لێ کردووە پەنا بۆ شیعر بەرێت و لە کارە هونەریەکانیدا شیعر ئامادەگیی هەبێت. بۆ پتەوکردنی ئەم رایەی خۆی کە شیعر و وێنەکێشان هاوسەنگن و دەشێت لە کارێکی داهێناندا لە یەکدا بتوێنەوە، ڕستەی شیعریی هێنایە ناو کارەکانیەوە، تەنانەت بۆ هەندێک کاری ناونیشانی وای داناوە کە تەژیە بە هەستی شیعریانە، بە گەلێک لە رامانەکانی کە شێوەی دەقیان هەیە بە ناونیشانی شیعریانە دەری بریون وەک: (باڵی کڵاوکورِە کە بەشینی ئاڵتوونی دەورە دراوە دڵی گوڵاڵە سوورە دەپێکێ کاتێک لە مێرگێکدا دەنوێت کە بە ئاڵتوون رازاوەتەوە-١٩٦٧).

پاشان لە کارەکانیدا ئەو وشانەی بەکارهێنا کە لە شێوەی هێڵدان و ئەپولینێری شاعیر و ماکس ئێرنست دایان هێنا بوو. دوو تابلۆی زۆر سەرنج راکێشی دروست کرد کە (ئەو لەشە گەنم ڕەنگەی حەزی لێ دەکەم لە لەشی پشیلەکەم دەچێت کە ڕەنگی سەوزی پۆشی بێت و (باڵندەیەک کەوتۆتە دوای مێش هەنگێک و دەیخات) لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە میرۆ لەو قۆناغەدا دنیایەکی پرِ لە بیرو دیدی تەواو جیاوازیی لەو دنیایە لەبەرگرتبوو کە لە کارەکانی ساڵانی شەرِدا دەرکەوتبوون, ئەم کارانەی کە بینەر لە یەک کاتدا تووشی ڕامان و سەرسوورِمانی زۆر دەکات. باڵندەگەلێکی جۆراو جۆر، درەخت و ئاژەڵ و مێروو. هێڵکاریی لە شێوەی خۆر و مانگ و ئەستێرەدا، شتگەلێک سەرەتا وا دەردەکەوت کە شێواو یان ترسناک یان دوودڵی دروست بکەن، بەڵام بینەر زوو لەوە دەگات کە ئەوانە ترپەکانی ژیانن. بە تەواوی وەک ژیانی خودی ئەم هونەرمەندە کە زۆر جار خۆی بەم جۆرە وێنا کردووە: «مێروویەکی هەستیار، بە باڵەکانم دەفرِم، وا هەست دەکەم بە نهێنی بەرەو دۆزینەوەیەکی دوور دەچم».

### سەرچاوە:

ڕۆژنامەی ئیلافی ئەلیکترۆنی – دنیای ئەدەب – کلتوور. مایسی ٢٠١٠.

# ئەدگار ئالان پۆ.. ژیانێکی زۆر کورت



**لە عەرەبییەوە: سەردەم**

**دوای** ئەوەی نووسەری بەریتانی (پیتەر ئاکروید) ژیاننامەی هەندێک نووسەری گەورەی وەک دیکنزو تۆماس موروت. س. ئەلیوت و هی تری بڵاوکردەوە. لە دوا کتێبیا ژیاننامەی نووسەری گەورەی ئەمریکا ئەدگار ئامشن پۆ دەنووسێت.

وێنە باوەکەی ئەدگار ئالان پۆ (شاعیری نەفرەتیە) نووسەری کتێبەکە جارێکی تر جەخت لەسەر ئەم وێنەیە دەکاتەوە، لە هەمان کاتدا ئەوەیش دەڵێت ئالان پۆ زۆر بەناوبانگ بوەو تەنانەت لەسەردەمی ژیانی خۆیدا بەتایبەتی بەهۆی قەسیدەی (قەلەڕەشکە)وە. (پۆ) تەنیا شاعیر و

نووسەرێکی دیارنەبوو، بەڵکو وەک نووسەر دەڵێت: «لە سەردەمی خۆیدا بەناوبانگترین ڕۆژنامەنووسی ئەمریکایی بوو» ناوبانگەکەیشی لەسەر بنەمای «ڕەخنەی تیژ» دامەزرابوو کە دەینووسی. هەروەها ئەو توانا گەورە داهێنەرانەیەی کە لە «داڕشتنەوەی ئەفسانەدا» هەیبوو.

نووسەری کتێبەکە گومان لەوە ناکات کە پێی بڵێت: «پێشەنگ» چونکە — ئورسن ویلز- زۆر سوودی لە هەستی ڕەخنەگرانەی ئەو وەرگرتوەو — جول فیرن-یش لە نووسینی ڕۆمانی پۆلیسیدا ئیلهامی لە ئالان پو وەرگرتووە.

نووسەری کتێبەکە جەخت لەوە دەکات کە کەسایەتی ئەدگار ئالان پو کەسایەتێکی سەیر و پڕ لە ناکۆکیە. لە دە فەسڵی کتێبەکەیدا، کە هەر یەکەیانی بە ئاکارێکی پۆ ناودێر کردووە بەم جۆرە سیفەتەکانی ئەوی ریزبەندی کردووە.

«قوربانیی، هەتیو، قوتابی، سەرباز، رۆژنامەنووس، نووسەر، ئەو پیاوەی هەرگیز پێ ناکەنێت، چۆلەکە، رسوایی، ژن». لەم دە فەسڵەدا سیمای ئالان پۆ دەردەکەوێت کە لە ژیانیدا «کەس خۆشی نەویستووە» یان لانی کەم «بڕوای وا بوو کە کەس خۆشی ناوێت».

نووسەر هەر لە سەرەتاوە قسە لەوە دەکات کە ناوی لێ ناوە «مەرگی نادیار»ی ئالان پۆ لە ساڵی ١٨٤٩دا. مەبەست لە «نادیار» ئەوەیە کە ئالان پۆ تا ڕادەیەکی زۆر لەو حیکایەت و ئەفسانانە دەچوو کە خۆی دەیگێڕانەوە هێشتا تەمەنی ئالان پۆ دوو ساڵ بوو کە بێ دایک و باوک کەوت. دایک و باوکی لە تیپێکی نواندنی گەڕۆکدا بوون. لە تەمەنی چل ساڵیدا ئالان پۆ کۆچی دوایی کرد دوای چەند ڕۆژێک تەرمەکەیان دۆزیەوە. چۆن ژیانی پڕ لە نهێنی بوو مەرگیشی هەروا شکایەوە.

هەر تەنیا ئاکار و ناکۆکیەکانی ئالان پۆ جۆراو جۆر نەبوون، بەڵکوو — وەک نووسەری کتێبەکە دەڵێت — بایەخ و گرنگ پێدانەکانیشی هەروا بوون: شاعیر، ڕۆمان نووس، چیرۆکنووس، ڕەخنەگری ئەدەبیی، شانۆ نووس و بڵاوکەرەوە. وەک چۆن ژیانی کورت بوو سوور بوو لەسەر ئەوەی کارە ئەدەبیەکانیشی «کورتبن» بۆیە حەزی لە نووسینی «کورتە چیرۆک» دەکرد. ئەو بڕوای وابوو پێویستە هەموو ڕەگەزەکانی دەق وەک ئەنجام لە ڕاژەی «یەک بەرهەمدا» بێت.

بەلای نووسەری کتێبەکەوە، ئەو ماوەیەی ئالان پۆ لای خێزانی «جون ئالان دوبیدموند» بوو لە ڤیرجینیا، زۆر کاری تێکردبوو، چونکە بەشی زۆریی تەمەنیی گەنجیی خۆی لەوێ بەسەربرد، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی کەم لە زانکۆی ڤیرجینیا خوێندی و پاشان ویستی بچێتە پیشەی سەربازیەوە، ئینجا کەوتە نێو دنیای ئەدەبەوەو سەرەتا لە ساڵی ١٨٢٧ دیوانێکی شیعری نووسی و بەناوی «هاونیشتمانیەکی بۆستن»یەوە بڵاوی کردەوە. دوای ئەو دیوانە وازی لە شیعر نووسین هێناو ڕووی کردە پەخشان و ڕەخنەی ئەدەبی. ساڵی ١٨٣٥ کچێکی تەمەن ١٤ ساڵ خزمی خۆی هێنا بە ناوی «ڤیرجینیا کلیم» زۆربەی زۆری کارە ناودارەکانی ئەدگار ئالان پۆ لە فیلادلیڤیا بڵاوبوونەوە، ئەو لە چەند رۆژنامە و گۆڤارێکی ئەوێدا کاری دەکرد پێش ئەوەی ساڵی ١٨٤٤بڕوات بۆ شاری نیویۆرک. یەکسەر دوای شکست هێنانی لە دەرکردنی رۆژنامەیەکی تایبەتی بەخۆی. بەڵام لەباتی ئەوە بوو بە خاوەنی رۆژنامەی «برودوای جورنال»لە نیویۆرک کە یەکەمجار تەنیا وەک رۆژنامەنووسێک کاری

تیا دەکرد.

لە ساڵی ١٨٤٥ «پۆ» شیعرە بەناوبانگەکەی بڵاوکردەوە کە بە ناوی «قەلەڕەشکە»وە بوو، شیعرێکی گەلێک سەرکەوتوو.

یەکەمجار لە ڕۆژنامەی «ئینفنیک میرور» دا بڵاوکرایەوەو پاشان لە چەند ڕۆژنامەیەکی تردا. دوای ئەوە کۆمەڵێک شیعری تری بڵاوکردەوە بە ناوی «قەلەڕەشکە و چەند شیعرێکی دی».

لەو کاتەدا کە ئالان پۆ لە لووتکەی ناودەرکردندا بوو، تووشی نەخۆشی هات و ئیتر هەرگیز لێی نەبوەوە. بەڵام ڤیرجینای هاوسەری کە تووشی نەخۆشیی سیل هاتبوو، لە سەرەتای ساڵی ١٨٤٧ کۆچی دوایی کرد، ئالان پۆ چەند جارێکی تر ویستی ژن بێنێت بەڵام سەرنەکەوت.

نووسەری کتێبەکە بە درێژی باس لە وێستگەکانی ژیانی ئەم نووسەرە ناودارەی ئەمریکا دەکات. جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ئەدگار ئالان پو هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بوە کە وابەستەی ئەدەب بێت، ئەو ئەدەبەی وەک پیتەر ئاکروید دەڵێت کردی بە «گەورەترین نموونەی ئەدەبی خەیاڵی زانستی لە زمانی ئینگلیزیدا».

نووسەری کتێبەکە لەو بارەیەوە دەڵێت ئەگەر چیرۆکە خەیاڵیەکانی پۆ لەوەدا سەرکەوتوو بێت، کە خوێنەر بوروژێنن بۆ پەی بردن بەو ترس گەردوونیانەی لە ناخی مرۆڤدان. سەرچاوەکەی لەوەوەیە کە «خودی ئالان پو هەر لە منداڵیەوە چارەنووسێکی کارەساتباری هەڵگرتوە» ژیانە «کورتەکەی» ئالان پو کە هەر لە منداڵیەکی زووەوە هەتیوکەوتوە، نەیتوانیوە بەرێک و پێکی خوێندن تەواو بکات بە هۆی نەبوونیەوە، دەرکردنی لە ڕیزی سوپا دوای ماوەیەکی کەم بە کاری خۆبەخشیی تیایدا. ئەم ڕێگا سەخت و پێچەڵ پێچەی ژیانی کاریگەری لەسەر سەرجەم بەرهەمەکانی هەبوە. نووسەری کتێبەکە وای دەبینێت کە: «هەستی کارەسات» وای لە ئالان پۆ کردووە خولیای گەڕان بێت بە دوای کردنەوەی تەلیسم و دۆزینەوەی نهێنیدا. لەم بارەیەوە نووسەری کتێبەکە دەڵێت: «ئەو زۆر حەزی دەکرد پەی بە زمانی نهێنی بەرێت و ئەوە بڵێت کە ناوترێت».

پیتەر ئاکروید لە کۆتاییدا دێتە سەر ئەوەی کە ژیانە تایبەتیە زۆر ئاڵۆزەکەی و ئارەزوە سەرکێشەکەی بۆ خواردنەوە تا ڕادەیەکی زۆر ڕۆڵیان هەبوە لەوەدا کە لە تەمەنێکی کورتا مردووە بەڵام لەو ڕەوتە شوومەدا وێنەیەکی دەگمەن و ئامادەگیەکی بێ وێنەی وای بۆ خۆی کێشاوە کە تا ئێستا توانا و هێزی بەردەوامە. هەر ئەمەیشە کە پول فالیزی شاعیر بەم جۆرە وەسفی دەکات: «ئەدگار ئالان پۆ بەرێگایەکی شاهانەدا چوە ناو هونەرێکی مەزنەوە، لە شتە ئاساییەکاندا نائاسایی دۆزیەوە، لە کۆندا تازەو لە خەوشا بێگەردی. بەڕاستی ئالان پۆ بوونەوەرێکی کامڵە».

## سەرچاوە:

کتێبی ئەدگار ئالان پۆ: ژیانێکی زۆر کورت. نووسینی پیتەر ئاکروید. بڵاوکەرەوە: فینتاج لەندەن ٢٠٠٩.

# ئەدۆنیس، جادوبازی وشەکان

سازدانی: محەمەد وائل ئسعید
لە عەرەبییەوە: عیسا چیایی

**بە** زمانی عەرەبی شیعر دەنووسێت* ئەدۆنیس خەڵکی سوریایە و لە فەرەنسا دەژی، یەکێکە لە گەورەترین شاعیرە هاوچەرخەکانی دنیا، کارە شێوەکاریەکانی لە پەیمانگای جیهانی عەرەبی لەپاریس نمایش دەکرێن *سەرنج ڕاکێش بوون.

*ئەو مەیلەت بەلای وێنەگرتنی زەیتیدا چۆن دەستی پێ کرد ..؟

–لەو پەیوەندیەوە دەستی پێکرد کە هەمبوو بە زۆربەی وێنەگرەکانەوە، چونکە لەماوەی ئەم پەنجا ساڵەی دواییدا گەلێ وێنەگری عەرەبم ناسی، زۆر جاریش ئەوان خاوەن دەسپێشخەری بوون لەو پەیوەندیانەدا، بەوەی کە داهێنەری و مۆتیڤی شیعرەکانم بوون، یەکەمیان شەفیق عەبود پاشان ئەوانیتر هاتن لە محمد عمر خلیل، مروان، زیاد دلول، سەلیم عەبدوڵاو زۆری تریش جگە لەوان، وێنەگرتنی عەرەبی بەپێچەوانەی شارەزایی ئێمەوە زۆر دەوڵەمەندە. ڕەنگە لەئێستادا لە شیعری عەرەبی دەوڵەمەندتربێ ..

* ئەو شتە سەرەکیە چیە کە لە پەیوەندیت بەوانەوە فێری بوویت؟

– فێربووم کە بە قووڵیی لە کارەکانی ئەوان و چاکتریش لەکاری خۆم بگەم. بەتایبەتی لەگەڵ ئەواندا فێری ئەوە بووم کە چۆن شێوەیەکی شیعری دابێنم، لەگەڵ هەموو ئەو پێکهاتانەیدا ئەمەش ڕایەڵکردنی پەیوەندیەک دەگەیەنێ لەگەڵ بۆشایی و لەگەڵ ئەو لاپەڕەیەدا کە ئەو دەقەی تیا دادەنێین .

* بەوەی کە ماوەی دەساڵ دەبێت کاری کۆلاج ئەنجام دەدەیت، پێگەت لە ئاستی بینەر و تەنانەت بەشدارێکی ئارەزوومەندی تابلۆیشەوە گواستەوە بۆ ئاستی جێبەجێکار.

– من لە باسکردنی کارەکانی خۆمدا دەستەواژەی (کۆلاج) بەکارناهێنم، بەڵکو پەنابردن بۆ وشەیەکی عەرەبی بەباشتر دەزانم کە وشەی (ڕەقیمە)یە ئەم زاراوەیەش ئاماژەیە بۆ لاپەڕەیەک کە لەیەک کاتدا وشە و ڕەنگ و وێنەشی تیایە. وشەی (کۆلاج) بۆچوونێکی بەهێزی پیشەیی دەبەخشێ لەکاتێکدا وشەی ڕەقیمە زیاتر بەلایەنی تایبەتی ئەم داهێنانەدا چڕ دەبێتەوە.

* ئایا ئەم وشەیە ئاماژەیە بۆ جۆرێکی ئەدەبی یان وێنەیی کە لە کلتوری عەرەبیەوە گوێزراب ێتەوە؟

– نا، ئەم وشەیە تەنها ئاماژەیە بۆ ڕەنگ، کە لەهەمان کاتدا شێوەو نووسینیشە، هەروەکو لە ناخی خۆیدا ئەو ئاماژەیەی دابێ کە ئەم سێ وشەیە خاڵێکی یەکگرتنیان تیایە.

* کە تۆ شاعیری و سنوورەکەشت زەمینێکی ڕۆحیی نەبینراوە، چۆن ئەو هەستەت لەلا دروست بوو کە ئەم خاکە پێویستی بە دۆزینەوەی بینراویش هەیە؟

– من هەموو کارە شیعریەکانم لەو دڵنیاییەدا چڕبۆتەوە کە هونەر و شیعر گوزارشت لە مرۆڤ و بوون ناکەن بەڵکو تەواوکەری ئەو دوانەن، گوزارشت کردن لەشتێکی دیاریکراو ئەوەیە کە تەنها شتێکی کەم و وخۆشبەختانەش لە دەرەوەڕا لەبارەیەوە بڵێین . کاتێ قسە دەکەم ئەوا من گوزارشت لەخۆم ناکەم بەڵکو دەیڕوخێنم. چونکە شیعر و هونەر درێژەپێدانی بوونن، منیش لەروانگەی ئەوانەوە هەوڵی بەرهەم هێناوەوەی حەقیقەت و تەنانەت داهێنانیشی نادەم، بەڵکو هەوڵ بۆ داهێنانی، بڵاوبوونەوەی حەقیقەتێکی تر دەدەم، حەقیقەتێک کە لە دەرەوە و بەرامبەر ئەو حەقیقەتەی لێیەوە هاتووە بەردەوام دەبێ.



* ئەمەش پەیوەندی بەو وتە بەربڵاوەوە هەبوو کە دەتووت: (من لە ئایندەوە هاتووم)؟

– بەجۆرێک لەجۆرەکان بەڵێ. نووسینی شیعر یان وێنەکێشانی (ڕەقیمە) کردنەوەی ئاسۆیەکی تازەیە. بەوەی کە دەبێتە هۆی دروست کردنی پەیوەندی تازە لەنێوان وشەو شتەکاندا، وەکو ئەوەی تۆ بوون ناچار بکەی بەوەی لەگەڵ تۆدا بجووڵێت. ڕەنگە لێرەدا کێشەی بینراو و نەبینراو دروست بێ. ئەو دوو کێشەیەی کە بەلای منەوە بە قووڵی بەستراون بەیەکەوە، بەجۆرێک کە ئێمە ناتوانین لە یەکەمیان بگەین گەر زانیاریەکی تەواومان نەبێ لەسەر لایەنە شاراوەکانی. بۆیە بۆ بینینی بینراوێک پێویستە بەجۆرێک لەجۆرەکان نەبینراو ببینین. ئەمەش مەرجێکە بۆ کردنەوەی ئاسۆیەکی تازەی ناوەوەی بوون، دەتوانین لەوێوە لە سنووری خۆمان دەربچین و لەهەمان کاتدا درێژەپێدانیشی بین. ڕەنگە هەر ئەمەش بێت کە من لەگەڵ ڕەقیمەدا بۆ بینینی نەبینراو، بۆی دەگەڕێم.

* نووسین لە ڕەقیمەدا پایەیەکی سەرەکی هەیە، ڕەنگە ئەوەش ئاسۆیەکی سەرەتایی بێت. ئایا وشەکان لەوێدا شیعر بەرجەستە دەکەن؟

* هەندێ جار چامەی شاعیرانی دیکەیە وهەندێ جاری تریش تەنیا وشە و بڕگەن لە ڕستە.

بەڵام ئەوەی بەلای منەوە گرنگە تیایدا دەست و خەتەکەیە، چونکە دەست و خەت لە فەرهەنگی عەرەبیدا تەنیا نووسین نییە. داهێنانێکی ڕاستەوخۆیە. هەر لە ڕۆژانی منداڵییەوە فێریان کردم کە دەست و خەتی جوان بەمانایەکی زۆر بێگەردی وشە ئاماژەیە بۆ جوانی نووسەرەکەشی. هەروەها دەست و خەت ئەبستراکیشە چونکە گوزارشت ناکات لەو شتانەی کە وشەکان ئاماژەی بۆ دەکەن بەڵکو گوزارشت لە هێزو لە ڕۆحی ئەو شتە نەبیندراوە دەکات کە لە خۆیدا هەڵی گرتووە. من وەکو شاعیرێک لەدەست وخەتدا درێژبوونەوەیەکی سروشتیم دۆزیەوە بۆ کارەکانم. هەروەکو بەشیعر دەتوانم گوزارشت لە توانستەکانی ناوەوەیان بکەم بۆ گۆڕان. بەمانایەکی تر گوزارشت لە هێزی ناوەوەیان بکەم.

* بەڵام دەست و خەتی تۆ لە ڕەقیمەکاندا جوان نییە. ئازایەتیەکیان تیا نییە بۆ وێنەکێشان، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەژاریەکی ڕوون بەدی دەکرێت. کەواتە تۆ لەودا بەدوای چیدا دەگەڕێی؟

– بۆ سادەیی، وشەکان دەنووسم . یان زۆرجار لەیەکیان دەکەمەوە تا شێوەیەکی زۆر سەرەتاییتر ببەخشمە ئەو پیتانەی کە بەرجەستەی دەکەن. تا نەخوێندرێنەوە.

* ئایا شتەکانی تر لەپای بێ ئەرزشیانە، لەپای نەبوونی هیچ دەلالەتێکە لەو شتانەدا، ئەو شتانەی کە هەڵیاندەبژێری بۆ بەرجەستەکردنی ڕەقیمەکانت؟ سەرەتاش ئەو شتانە لە کوێ دێنی؟

– بەدەم ڕۆیشتنەوە کۆیان دەکەمەوە، هەندێ جار کیسەیەک هەڵدەگرم و پاشماوەی پەت و پارچەی کانزایی و قوماش و شتی دارین کۆدەکەمەوە. خەڵکیش بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە تێم دەڕووانن هەروەکو شێت بووبم. بەڵام من بەبێ وەستان لە کارەکەی خۆم سەلاویان لێ دەکەم. ئەوەش زیاتر سەرنجیان ڕادەکێشێ. بۆیە هەموو شتێ بەئارامی و بێ کێشە بەڕێوەدەچێ، ئەمە درووێنەیەکی خۆشە.

– نووسینێکی تێک و پێکشکاو، شتگەلێکی سووک و خراپ و بێ مانا، ئایا ئەم کارانەت لەسنووری گوزارشت کردنە لە ئیستاتیکای پاشماوە؟

* تا ڕادەیەک وایە، چونکە ڕەقیمەکان لەڕاستیدا لە شتگەلێ پێک هاتوون هیچ بەها و ئاماژەیەکیان نییە. بەڵام بەهۆی ئەوانەوە دەتوانم شێوەیەکی پڕمانا پێک بێنم. چونکە هەمیشە بۆ نووسینی چامەیەکی تازە دەبێ وشەکان لە ناوەڕۆکە کۆنەکانیان بەتاڵ بکرێنەوە بۆ ئەوەی بتوانێ پەیوەندیەکی نوێ لەنێوان وشەو شتەکاندا دابمەزرێنێت و دواتر شایەنی دروست کردنەوەی مانایەکی تازە بێت. وەلێ لەگەڵ ڕەقیمەکاندا تا ئاستێک پێچەوانەی ئەمە ڕوو دەدات، چونکە ئەو ڕەگەزانەی کە دروستیان دەکات خۆیان لە هەموو مانایەک بەتاڵ بوونەتەوە. من لەگەڵ تێکشکاوەکاندا کاردەکەم. تا ڕادەیەک لەگەڵ نەبوودا. لێرەوە شتێک دەست پێدەکا، شتێک بەیارمەتی ئەوەی کە تێکدراوە دروست دەبێ. تەنانەت پیت و وشەکانیش لە ڕەقیمەکەدا بۆ ئەو بەها شاراوە ئەگەریەی کە ڕەنگە بەدەست بێ دووبارەکراونەتەوە. ئەوەی هەندێ جار پەیوەندی بە دەستلێدان و ڕەنگ و وێنەشەوە هەبێ، ئەوا نووسین لەو ڕەقیمانەدا بەتەواوی لە قورسایی مێژوو و ڕەگەکانیشی، لە هەموو ئەو ڕابردووەی کە چەپێنراوی تیا دەشڵەژێ و ئەو شتانەش کە لە کلتووری عەرەبیدا ناوترێن، لە هەموو

ئەمانە بەتاڵ بوونەتەوە.

* چۆن کار دەکەیت؟

– بەبێ میتۆد، یاری دەکەم، بە بێ بیرکردنەوەیەکی پێشوەخت پێکهاتەیەک لە شێوەکان تاقی دەکەمەوە. تەنانەت وا هەست دەکەم چارەسەرێ یان گرتنەوەی شیرازەیەکم دۆزیوەتەوە. ئەو کاتە ئەوەستم ئەم یاریە شتێکی سەرەکیە و لە شیعریشدا هەیە، چونکە لەڕاستیدا هەرگیز ناتوانین بەڕاستی دەست بە نووسینی چامەیەکی تازە بکەین تا تۆزێ یاری نەکەین. بەڵام یاری کردن بە وشەش هەموو ئەو مەترسیانەی لەناخی خۆیدا هەڵگرتووە، ئەو ترسەی کە لە ساختومانە دروستکراوەکاندا هەیە، کە وشەکان هەموو زیندەگیەکی تیا لەدەست دەدەن و دەبنە بەردی ڕووت. کاتێ کە بەدەست شتەکان چارەسەر دەکەین. کاتێ کۆیان دەکەینەوە دەکرێ شێوەی تازەیان لێ پێکبێنین. بەڵام بەکارهێنانی ئەم شێوازە لەگەڵ وشەدا زۆر دەگمەن و گرانترە.

* ئایا هیچ پێشبینیەکت هەیە لەبارەی ئەو فۆرمەی کە لە ڕەقیمە تازەکەتدا بۆی دەگەڕێی؟

–نا، من لە بیرکردنەوەیەکی پێشوەختەوە ئاراستە نابم. چونکە من پێم وایە کاتێ لە بیرکردنەوەیەکی زۆر ڕوونەوە ئاراستەدەبین ئەوا ناگەینە هیچ شتێ. ئەو سەربەستیەی لەجیهاندا ماوە هەموو شتێکی تیا ملکەچە بۆ لێپێچینەوە و پێوانە و دیاریکردن. ڕەنگە لای من لەو توانستەی داهێنانەوە بەرجەستە دەبێ کە دیاری ناکرێ. لای من سەرەکیەکانیان ئەو شتانەیە کە لە لێپێچینەوە خۆدەدزنەوە. هەر ئەوەشە کە پێویستە کاری لەسەر بکەین، من تەواو ناکۆکم لەگەڵ ئەو ئەدەبەی کە ئەمڕۆ لەبەرامبەر ڕاگەیاندندا تا ئاستی خۆگونجاندن لەگەڵ پێویستیەکانیدا دەنوشتێتەوە. دەبنە بابەتگەلێکی بچکۆڵەی سەروژێر. کە دەکرێ وەکو ئامرازێکی سادە بەکاربهێنرێن. لەڕاستیدا شتێکی ترسناکە کە شتی وا لە شیعر و کاری هونەری دروست بکەین! سەرمایەی ئێمە ملنەدانە بۆ ئەم دیاریکردنانە.

* چییە ئەو شتەی کە تۆ لەم ڕەقیمانەدا بۆی دەگەڕێیت و لە شیعردا نییە؟

– ڕەنگە فۆرمێکی سەربەستی بێت کە دڵنیام بەهۆی سانسۆرەوە لەگەڵ شیعردا ناتوانم پێی بگەم. من لێرەدا مەبەستم لە سانسۆری ڕامیاری و ئایدیۆلۆژی نییە. بەڵکو ئەو سانسۆرەی کە لە فەرهەنگی عەرەبیدا ڕەگی داکوتاوە. بڕوانە چۆن ئەو شیعرانەی کە لە سیاسەت و ئاین و نیشتمانەوە وەرگیراون دەستیان بەسەر ڕۆشنبیری ئەمڕۆدا گرتووە. ئەوانە وەک شیعر بێ بەهان! بەڵام شیعر وەکو گیانبازیەکی ڕۆحیی تەواو، گیانبازیەکی فکری سەربەست. ئەم جۆرەیان بەتەواوی لە جیهانی عەرەبیدا ونە بەهۆی پایە و دەسەڵاتی قورئانەوە لەم جیهانەدا. ئەم ڕەقیمانە ئاسۆیەکیان بۆ کردمەوە هیچ سانسۆرێک دەسەڵاتی بەسەردا ناشکێ. ئاسمانێکە هەموو سانسۆرێک ڕەت دەکاتەوە. چونکە سانسۆر هیچ قورساییەکی بەسەرەوە نییە.

**ژێدەر:**

سایتی (الفتـی الابیض المتوسط)




# ئەوروپا، حیجاب، توندوتیژی

## خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی "سیاسەتی حیجاب"

لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

**قسەكردن** لە حیجاب بێشک قسەکردنە لە جەستە. کارەکتەر کە حیجاب دەکات بەر لە هەرشت دەیەوێت جەستە دابپۆشێت، کەواتە مەبەست لە حیجاب داپۆشینی جەستەیەکە کە نایەوێت ئەوانی تر بیبینن. حیجاب لە کومەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەگەیەکی تر و لە کەلتورێکەوە بۆ کەلتورێکی تر و لە ئاینێکەوە بۆ ئاینێکی تر جیاوازی هەیە.

ئێستا کێشەی حیجاب (veil) یەکێکە لەکێشە هەرە دیارەکانی کۆمەڵگەی ئەوروپی، بەجۆرێک کە زۆرێک لەبەرپرسان، بەتایبەت بەریتانیا، سەبارەت بەم دیاردەیە نیگەرانن‌و دەیانەوێت کەم تا زۆر کۆمەڵگەی بەریتانی لەم دیاردەیە بەدووربێت، ئێمە ئێستا لە کۆمەڵگایەکدا ژیان دەگوزەرێنین کە قسەکردن لە کۆمەڵگەی داخراو، یەک فۆرم‌و یەک شێوە قسەکردن هەیە، کە جگە لە کاتکوشتن چیدی نییە. ئێستاو لەکۆتایی سەدەی بیستدا بەلێشاو موسوڵمانانی جیهان، بەتایبەتی جیهانی عەرەبی، رویانکردۆتە وڵاتە خۆشگوزەرانەکان، بەتایبەت ئەوروپا. هەربۆیە ئێمە ئێستا لەبەردەم کۆمەڵگایەکی فرە کراوەداین کە چیدی ناتوانین مێژوو بگەڕێنینەوە بەو فۆرمەی کە خۆمان دەمانەوێت ئاراستەکانی کۆمەڵگە بگۆڕین. هەربۆیە ناتوانین ئەو راستییە بشارینەوە کە کەم تازۆر کێشەی حیجاب لە وڵاتێکی وەکو بەریتانیا بۆ نمونە، کاریگەری هەیە لەسەر نەستی ئەو کۆمەڵگەیە، دانیشتنی کچێک لە پارکێکدا لەپاڵ کچێکی حیجابداو پێکەوە چونە قوتابخانەی دو خوێندکار کە یەکێکیان خوێندکارێکی سادەو سیکۆلاری ئەوروپییەو ئەوی تریان کچێکی حیجابپۆشی عەرەبی

ئیسلامییە، کەم تازۆر کاریگەری هەیە لەسەر گەڵاڵەبونی پرسیار لەلای تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە، هەربۆیە لامان سەیر نەبێت کە کچێکی بەریتانی خوێندکارێکی حیجابپۆش ببینێت دەپرسێت: حیجاب بۆ؟ خواپەرستی بەم فۆرمە بۆچی؟ یاخود جیاوازی لەنێوان مەسیحیو ئیسلامی لەچ ئاستێکدایە؟ ئەمانەو چەندین پرسیاری تری لەو شێوەیە بەشێوەیەک لە شێوەکان رەنگە کاریگەری هەبێت لەسەر سیاسەتی ناوخۆی بەریتانیا بۆ نمونە.

رەنگە جاک سترۆ لەو پێودانگەوە نیگەرانی خۆی دەربڕێت، بۆ نمونە، بەرامبەر بە رۆژنامەنوسێکی حیجابپۆش کە پرسیاری لێدەکات. لێرەوە لە زاکیرەی جاک سترۆدا ئەم مەترسییە لەئارادایە کە رەنگە کەم تازۆر بونی ئافرەتی حیجابپۆش دەستی هەبێت لە دەستکاریی کردنی جۆرێک لە ژیانی هاکەزایی خەڵک لەو وڵاتەداو گەڵاڵە نەبونی کۆمەڵگایەک پرسیار لە مێشکی کچە سپی پێستێکی ئەو وڵاتە کە هەر لە سەرەتای لەدایکبونیەوە لە دەرەوەی تەوقو بەندەکان ژیان دەگوزەرێنێت، لەسەرو هەموشیانەوە تەوقو بەندی حیجاب.

چیتر ئەوروپاو ئەمریکا بە حکومەتو کۆمەڵو ناوەندە ئەکادیمیەکانیانەوەو بەمەرجەعە ئاینیەکانیانەوە، گەیشتونەتە ئەو راستییەی کە تەنها قسەکردن لە ئازادیی ئاینیو تەساموحی ئاینی ئەمرۆ بەس نییە، ئەو سەردەمە بەسەرچوە کە چیتر کۆنفرانسی گفتوگۆی نێوان ئاینەکانو موجامەلەکردنی ئاینەکان بۆ یەکتری بەسبێتو بارگرژیو خراپ حاڵیبون لەنێوانیاندا نەهێڵێت، چونکە ئەمریکاو ئەوروپا راستەوخۆ لەناو خودی وڵاتەکانیانداو لە پایتەختەکانیاندا توشی هەرەشەو کوشتن بونەتەوەو چاوەڕێی کارەساتو روداوی گەورەتریش دەکەن، بۆیە بەرامبەر ئاینی ئیسلامو چەمکەکانی، تەوژمێک لەکاردانەوە دروستبوە لەناو ئەو وڵاتانەدا، ئەوەتا پاپا راستەوخۆ لە وتارەکەی خۆیدا هاتە سەر قسەکردن لەسەر پەیوەندیی ئاینی ئیسلامو توندوتیژیو چەمکی جیهاد لە ئیسلامدا، کە ئەمانەی هەموو بەستەوە بەو ناعەقڵانیەتەی کە لە ئاینی ئیسلامدا هەیە، پێشتریشو دواتریش چەند کاریکاتێرێک لەسەر ئاینی ئیسلامو کەسایەتیەکانی دروستکرا، لەو بارەیەوە (جاک سترۆ) وەزیری پێشوی دەرەوەی بەریتانیاو سەرۆکی پەرلەمانتارانی لیستی حزبی کرێکاران بەشێوازێکی هێمنانە قسەی لەسەر نیقاب کردوە کە رێگرە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا لەنێوان موسوڵمانانو ئەوانی تردا، هەروەها باسی لەوە کردوە کە پێشی باش نییە نیقاب پۆشەکان لە نوسینگەکەی خۆیدا ببینێ، دواتریش هەمان رای بۆ حیجابیش دەربڕیوە.

هەر لەم راگەیاندنانەدا (تۆنی بلێر)ی سەرۆکوەزیرانی پێشوش پشتراستی راکانی سترۆی کردۆتەوە، وەکو دەریشدەکەوێت تەوژمێکی کۆمەڵایەتیو سیاسی بەو ئاراستەو رەوتەی کە دەیەوێ بەربگرێ بەتوندوتیژی ئاینیو بەو رەوتە ئاینییەی کە لە ئیسلامدا هەیە، کە بەتوندی ئاین دەگرێتو خۆی جیادەکاتەوە لەناو کۆمەڵگە رۆژئاواییەکانداو هەردەم کار لەسەر ئەوە دەکات کە لەو کۆمەڵگەدا نەتوێتەوەو بەها ئەخلاقیو یاساییو فیکرییو کلتوریەکانی بەزۆر شێوە رەتدەکاتەوە.

کۆمەڵگەی ئەوروپیو ئەمریکاییو حکومەتەکانیان، گەیشتونەتە دورییانێک کە چیتر نابێ بێدەنگ بن لەوەی لەسەر زەویەکانیانو لەناو دەزگاو کۆمەڵگەکانیاندا تەشەنەدەکات، ئیتر هەستدەکەن

دەبێ بەهەموو شێوازەکانیانەوە روبەڕوی تەوژمی ئیسلامی ببنەوەو روبەڕوی هەموو ئەو چەمکو فۆرمانە بوەستن کە لەناو کۆمەڵگەدا جیابونەوە دروستدەکاتو رازینابێت بەیاساو کلتورو فەرهەنگو کرانەوەی کۆمەڵگە رۆژئاواییەکان. ئەم تێڕوانینو بڕیارە کە خەریکە لە رۆژئاوا بەتەواوی فۆرمەلە دەبێت، ئەمرۆ لە وتارەکەی پاپاو وتەکانی (سترۆ)و پێشتریش لە بڕیاری قەدەغەکردنی حیجاب لە فەرەنسا لە خوێندنگەکاندا خۆی بەرجەستە کردوە.

ئەم ئاڕاستەو ئەم رەوتە موسوڵمانەکانی ئەوروپاو ئەمریکاو تەنانەت موسوڵمانان لە وڵاتی خۆیاندا دەخاتە بەردەم دوو هەڵوێست، هەڵوێستێکیان بەئاراستەیەکی میانڕەویو کرانەوەی زیاترو بە ئایندا چونەوەو بەخۆداچونەوە هەنگاودەنێ، چونەوە بەهەموو چەمکە ئاینیەکاندا، لەناو ئەوانیشدا چەمکی نیقابو حیجاب کە تاچەندە پەیوەستن بەئاینەوە، هەتا چەندە جۆری پۆشینەکەیو چەندێتی پۆشینەکەی لە ئایندا قسەی لەسەر کراوەو چەند رای جیاواز هەیە لەسەریو دەکرێ چ رایەک لەو رایانە قەبوڵبکرێ؟ هەروەها ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە ڕای نوێو تێڕوانینی تازە سەبارەت بەو مەسەلەیە بخرێتە گفتوگۆی گەرمەوە، ئایا ئەو تێروانینە کۆنانە لە قەیرانێکی جدیدا نین؟

هەڵوێستێکی تری زۆر لە موسوڵمانان لە رۆژئاوا، کە دەکرێ بەتەواوی بەرجەستە ببێت، ئەوەیە کە رۆژئاواو هەموو دنیای نوێ بە دوژمنی ئاین دەزانێتو تێڕوانینە شەکلیو کۆنەکان بەڕاستترین تێڕوانین دەزانێتو زیاتر بەرەو داخرانو چونەوە بەناو قاوغەکاندا هەڵدەبژێرێتو توندڕەوی بەتاکە رێگەو ئەنجام دەزانێت.

ئەم دوو هەڵوێستە هەردوکیان لەململانێدان، ئەگەر پێشتر لەناو دنیای ئیسلامیدا ململانێیان کردبێ، ئەوا ئەمرۆ ئەو دوو هەڵوێستە لە دەرەوەی دنیای ئیسلامیشدا ململانێ دەکەن کە رۆژئاوایە، کە دیارە ئەو ململانێیە لە ئەوروپا یارمەتی ململانێکەی دنیای ئیسلامی دەداتو دەکرێ پشتگیری بێت بۆ کرانەوەی ئاینو ریفۆرم تیایدا.

مەترسیەکی تری بەرپرسە بەریتانیەکان لە حیجابو حیجاب، بەبۆچونی نوسەری کتێبی سیاسەتی حیجاب لەسەر ئەوە نییە کە ئەوان بەجۆرێکی تر حیجاب دەپۆشن، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە ئەوان دەترسن لەناو ئەو حیجابەدا پلانی تر هەبێت بۆ دەستکاریکردنی کۆمەڵگەی کراوە. بەریتانیەکان لەدوای تەقینەوەکانی ساڵی پاردا تەواو نیگەرانن سەبارەت بەبونی رێژەیەکی زۆری موسوڵمان لەو وڵاتەدا.

نیگەرانیی بەریتانیەکان لە حیجاب، کەم تا زۆر نیگەرانییە لە تیرۆر، نیگەرانییە لەوەی کە تیرۆریزمی ئیسلامی ئێستا سنورەکانی تێپەڕاندوەو لە شوقەکانی ئەو وڵاتەدا خۆی پڕ چەک دەکاتو دەتوانێ لە چرکەیەک لە چرکەکاندا، لە قەرەباڵغترین شەقامی ئەو وڵاتەدا خۆیو زۆرێک لە خەڵک لەگەڵ خۆیدا بمرێنێت.

**سەرچاوە:**

bookreview.com

# جینۆساید.. تیۆرەو پراکتیك

**مەروان عەلی**

**لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند**



«دانییل گۆڵدهاگن» نوسەرێکی ئەمریکییەو هەمیشە بەشوێن کێشە گرفتئامێزەکاندا دەگەڕێت کە شایەنی وتووێژو مشتومڕن. چونکە کێشە گرفتئامێزەکان، وەک نوسەر دەڵێ، بە شێوەیەکی بابەتیانە خوێنەر دەوروژێنێتو وایلێدەکات بگەڕێتو بگات بەو دەرئەنجامانەی کە لێکۆڵەرو مێژونوسەکان نەیانتوانیوە پێیبگەن.

«دانییل گۆڵدهاگن»ی توێژەرو مێژونوسو مامۆستای زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی (هارفارد)، لەم کتێبەیدا (خراپتر لە جەنگ)، ڕوبەڕوو دەمانخاتە بەردەم (جینۆساید). بیرۆکەی نوسینی ئەم کتێبە، وەک دانەر خۆی ئاماژەی پێدەدا لەو دەعوەتنامەیەوە هاتووە کە یەکێک لە ڕێکخراوە جوولەکەکان ئاراستەی کردبوو، تاکو لێکچەرێک لەسەر هۆلۆکۆست پێشکەش بکات. بەڵام (دوای لێکچەرەکە، ویستم زیاتر لەو بابەتەدا قوڵببمەوە، ترسناکی بابەتەکە، وایلێکردم بگەڕێم بەشوێن وردەکاریو ڕودانی جینۆساید بەدێژایی سەدەکان. وەلێ لەم کتێبەدا (خراپتر لە جەنگ) گەڕاوم بە شوێن جینۆساید لە هەردوو سەدەی بیستو بیستویەکداو شیمکردۆتەوە، واتە ئەو جینۆسایدە نزیکانەی وەک دەڵێن هێشتا خوێنی قوربانییەکانی وشکنەبووەتەوە).

توێژەری کتێبەکە لە نزیکەی٧٠٠ لاپەڕەدا، بیرۆکەی جینۆساید شیدەکاتەوە، باس لە چۆنیەتی گواستنەوەی بیرۆکەی جینۆساید دەکات لە کارێکی تیۆرییەوە بۆ کارێکی پراکتیکیو هۆکارەکانی ئەو گواستنەوەیە ڕاڤەدەکات. لە جینۆسایدی ئەرمەنەکانەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەم، بۆ هۆلۆکۆست، لەوێوە بۆ تیرۆری (خەمیرە سورەکان) لە کەمبۆدیا، دواتر بۆ تاوانە ڕەگەزپەرستیو نەتەوەییەکانی سربەکان لە بۆسناو هەرسک، پاشان پاکتاوکردنی ڕەگەزی لە گواتیمالاو لەناوبردنی (توتسییەکان) لە ڕواندا، تا دەگاتە سەر تاوانەکانی سەدام حسێن دژ بە کوردو شیعەو تاوانەکانی دارفۆر.

«دانییل گۆڵدهاگن» پێداگری لەسەر ئەمە دەکات، لە هەرکوێیە کەلتوری ڕقلێبونەوەو قبوڵنەکردنی ئەوی دیکە هەبێت، لەوێدا بیرۆکەی جینۆسایدو پراکتیک کردنی توندوتیژی بۆ ڕیشەکێشکردنی ئەوی دیکەی جیاواز، لەدایکدەبێت. لەم کتێبەدا، کارەساتی دارفۆر پانتاییەکی فراوانو گرنگ داگیردەکات، چونکە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، تاکو ئێستا نەیتوانیوە چارەسەرێک بۆ ئەم جینۆسایدکردنەی دانیشتوانی دارفۆر بدۆزێتەوە. «دانییل گۆڵدهاگن» لە تێڕوانینیدا بۆ ئەم کارەساتە مرۆییە جەرگبڕە، لە ڕەخنەیەکی توندەوە کە ئاراستەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیو دامودەزگاکانی کردووە، دەستپێدەکاتو پێیوایە، ئەو دامودەزگایانە کورتکراونەتەوە بۆ حوکمی بەهێزەکانو دەسترۆیشتووەکانو دەوڵەتانی بچوک هیچ شوێنێکیان لەناو ئەو دامودەزگایانەدا نییە. بۆیە ئەنجومەنی ئاسایشو دامودەزگاکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، پێویستیان بە سەرلەنوێ بنیادنانەوە هەیەو لە بڕیارداندا، پشت بە پرنسیبی شەراکەت ببەسترێت، مافی ڤیتۆ بۆ دەوڵەتە هەمیشە ئەندامەکان نەمێنێت، چونکە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی (شەرعیەت) بە بەرژەوەندیو دەستکەوتەکانی دەوڵەتە بەهێزەکان دەدات.

سەبارەت بە ڕژێمی سودانی کە ڕێگرە لەبەردەم دۆزینەوەی چارەسەرێک بۆ کارەساتی دارفۆر، «دانییل گۆڵدهاگن» داوا لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیو ئەوروپاو ئەمریکا دەکات، گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێمی سودانی نەکەنو یەک لایەنە کۆمەڵێ ڕێوشوێن بگرنەبەر. دانەر لەم بارەیەوە دەڵێ: (کاتێ جینۆساید لەئارادابێت، پاساوی سیادە، پاساوێکی بەتاڵو بێ مانایە). ئەمەش دیارترین ئەو ڕێوشوێنانەیە کە دەکرێ بگیرێتەبەر:

*ناردنی هێزێکی سەربازی گەورە بۆ دارفۆر، باشترە لەژێر ئاڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بێت، هێزە سەربازییەکە لەلایەن ئەمریکاو ئەوروپاوە بەڕێوەببرێت.

*کەنارخستنی ڕژێمی سودانیو پچڕاندنی پەیوەندییە دیبلۆماسییەکان لەگەڵیداو دەرکردنی لە مەحافلی نێودەوڵەتی.

*هەڵوەشاندنەوەی سوپای ئێستای سودانو گۆڕینی بۆ هێزی بەرگریو بەس.

*وەڵامدانەوەی سەربازی ڕاستەوخۆ بۆ سەر هێزە سودانییەکانو چەکدارەکانی جەنجەوید.

*ناچارکردنی حکومەتی سودانی، بە بەخشینی پارەیەکی زۆر، وەک قەرەبوکردنەوەی زیانلێکەوتوانو قوربانییەکان.

دانەری کتێبەکە بەشێکی گەورەی بەرپرسیارەتی ئەوەی لە دارفۆردا ڕودەدات، دەخاتە ئەستۆی نەتەوە یەکگرتووەکان، چونکە ئەرکی سەر شانی کە پاراستنی خەڵکانی بێتاوانو مەدەنییە، جێبەجێ ناکات. «دانییل گۆڵدهاگن» زەنگی مەترسی لێدەداتو دەڵێ: (سیستمی جیهانی ئێستا، سیستمێکی مرۆڤانە نییەو هەرگیز دادپەروەرانەش نەبووە)، لەبەر ئەوە داوا دەکات سەرلەنوێ پێداچونەوەی بۆ بکرێتو پێگەی مرۆڤو مافە ڕەواکانی، لەسەرو هەموو بەرژەوەندییە سیاسیو ئابورییەکانەوە دابنرێت.

دانەر زۆر بە وردی جینۆساید تاوتوێدەکات، باس لەوە دەکات چۆن لەوانەیە ململانێیەکی بچوک، گەشەبکاتو بگۆڕێت بۆ جینۆساید. لێرەوە دانەر لەبەردەم وێنەیەکی زۆر ڕوونو ئاشکرای، چۆنیەتی دۆزینەوەی جینۆساید، لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا دامانده‌نێت، تاکو دواتر لەناویبەرین یاخود لانی کەم دەرئەنجامەکانی سوکتر بکەونەوە.

ناوی کتێب: خراپتر لە جەنگ

نوسینی: دانییل جۆن گۆڵدهاگن

چاپی ئەڵمانی: بڵاوکراوەی (سیدلەر) میونخ ٢٠٠٩

ژمارەی لاپەڕە: ٦٨٥

## سەرچاوە:

شرق الاوسط، لاپەڕەی: المنتدی الثقافی، یەکشەممە، ٢٠١٠/٥/٢، ژمارە ١١٤٧٨

# کۆچی دوایی خاوەنی کتێبی ڕەخنە لە عەقڵی عەرەبی

عبد السلام بنعبد العالی
لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

**ڕەنگە** تەنها یەک مەسەلە هەبێت کە کۆچکردوو «محەمەد عابد جابری» پێی ناخۆشبوبێتو خەفەتی بۆ خواردبێت، ئەویش ئەوەیە نەیتوانی پرۆژەکەی تەواو بکات. ئەم پرۆژەیەی، نە ئاسان بوو، نە دەکرا تەواوی بکات. چونکە ئەو پرۆژەیە بە تەنها پرۆژەی تاکە کەسێک نەبوو، بەڵکو پرۆژەی دوو نەوەبوو، پرۆژەی ئێمەشە. «جابری» لە ژیانی فیکری خۆیدا، جیاوازی نەکردووە لەنێوان ئەوەی تایبەتە بەو، لەگەڵ ئەوەی تایبەتە بە ئێمە، ئەمە ئەو سەرنجەیە کە هەرکاتێ دەرفەتی بینینی «جابری»م بۆ بڕەخسایە، لام دروست دەبوو. هەمیشە ئەو هەستەی لا دروست کردوم کە ئەو کۆمەڵێ قورسایی لەسەر شان هەڵگرتووە، لەوە گەورەترە تەنها کەسێک هەڵیگرێت. ڕەنگە هەر ئەوەشبێت وایلێکردووە، ناڵێم بە بەردەوام، بەڵکو بەبێ سنور، ئێش بکات. نەتدەتوانی «جابری»ببینیو ئێش نەکاتو سەرقاڵ نەبێت، بۆیە بەخێرایی خۆتدەبینییەوە هەم لەگەڵیدا توشی ئێشکردن دەبویتو هەم لە تەنیشتیدا.

لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە «جابری»م وەک مامۆستایەک ناسی، گەورەترین سیفەت کە ئەوی جیادەکردەوە، ئەوەبوو وابنەدەکرد هەست بکەیت ئەو زانستێکی هەیە دەیەوێت پێتی بگەیەنێت، بەڵکو هەمیشە ئامادەیی ئەوەی هەبوو لە تۆوە فێرببێت. بەردەوام ئەو هەستەی لا دروست دەکردین زەوی هێشتا چۆڵەوانییەو لەسەرمانە مەسەلەکان لە ڕەگەوە دامەزرێنین. بەم مانایە دەتوانین بڵێین فەلسەفەو وتنەوەی فەلسەفەو بەعەرەبیکردنی فەلسەفە لە مەغریب، لەسەر شانی ئەو جێبەجێکران. ئەو دەیزانی مەسەلەکان لە سەرەتادا وەک پێویست نابن، بەڵام تەواو دەیزانی دامەزراندن، بێ کەموکوڕی نابێتو ڕێگای دامەزراندن، سەختو دژوارە. بۆیە دەتبینی لە پێناو ئەو دامەزراندنەدا،



هەر دەرفەتێکی بۆ هەڵکەوتایە، دەیقۆستەوە. لەم چوارچێوەیەدا، هەموو توانای خۆی خستەگەڕ تا وتنەوەی وانەی فەلسەفە، لە مامۆستاو سەرپەرشتیارە فەرەنسییەکان وەربگرێتەوە، لێرەوە هەستا بە ئامادەکردنی یەکەم کتێبی قوتابخانەیی بۆ وتنەوەی فەلسەفە.

لە وتنەوەی وانەکانی زانکۆو سەرپەرشتیکردنی بۆ نامەو لێکۆڵینەوەکان، پەیڕەوی لە هەمان ئەو شێوازە دەکرد. مامۆستا «جابری» لە ژیانی تەلەبایەتیماندا، بەردەوام ئەو هەستەی لا دروست دەکردین کە ئێمە بەنیازین زانکۆیەکی مەغریبی دامەزرێنین‌و ڕێگای ئەو دامەزراندنەش ئاسان نییەو پێویستە ئێمە هەم زانکۆو هەم بەشی فەلسەفە بەتایبەتی، بگرینە ئەستۆی خۆمان. بۆیە بینیمان خۆبەخشانە چەندین وانەی هەمەڕەنگی دەوتەوە کە هیچ پەیوەندییەکی ئەوتۆ لەنێوان ئەو وانانەدا نەبوو. تەنها ئەو ڕۆحی تێکۆشانەی مامۆستا نەبێت کە دەیزانی کاتێ وانە دەڵێتەوە، پێویستە فێرببێت، ئیدی چەمکی شارەزاییو تایبەتمەندی دواتر دێن‌و هەنووکە کات کاتی چاندنی تۆووەکانە. وەلێ چاندنی تۆوەکان، بەبێ بوونی ڕەگو هۆشیارییەکی مێژوویی نابێت، بۆیە پێویستە لەسەرمان بەسەر کەلتوردا بکرێینەوە، بەسەر دوو کەلتوردا: کەلتوری عەرەبی ئیسلامیو کەلتوری مرۆڤایەتی. بەڵام هەر وەرگرتنێک لەوەی پێیدەوترێت کەلتوری مرۆڤایەتی، پێویستە لە میانەی تایبەتمەندییەوە بێت، تایبەتمەندیمان.

## سەرچاوە:

ماڵپەڕی الاوان، دووشەممە، ٢٠١٠/٥/٣

# جابری لە فەڕەنسا ناسراوە



هاشم سالح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

**گەرچی** لە هەندێ خاڵدا لەگەڵ دکتۆر «محەمەد عابد جابری» ناکۆک بووم، بەڵام کاتێ هەواڵی مردنەکەیم بیست، هەستم بە دڵتەنگییەکی قووڵ کرد. مردنە تاڕادەیەک زووەکەی، بەلامەوە سەیربوو، چونکە ژمارەی ئەو بیرمەندە گرنگانەی تا ئەم ئاستە، نەوەکانی عەرەبیان بە خۆیانەوە سەرقاڵ کردووە، کەمە. ئەوان هێندەی ژمارەی پەنجەکانی یەک دەست یاخود دوو دەست دەبن، ئەوە جگە لەوەی «جابری» تەمەنی زۆر نەبوو، تەمەنی تەنها ٧٥ ساڵ بوو.

لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە، تارمای خوالێخۆش بوو، باڵی بەسەر فیکری عەرەبیدا کێشاوە، دروست وەک «حەسەن حەنەفی» یان «عەبدوڵلا ئەلعەروی» یان «محەمەد ئارکۆن» یان «هیشام جعیگ» یان «جۆرج تەرابیشی» یان «جابر عصفور» یان «نەصر حامد ئەبو زێد» یان «ڕەزوان السید»...هتد.

لەوانەیە هەموو عەرەب، نەک بە تەنها مەغریبیەکان، دوای لەدەستدانی «جابری»، تاڕادەیەک

هەستیان کردبێت هەتیوکەوتوون. ژمارەی بیرمەندە گەورەکان لە مێژودا کەمە، لەبەرئەوەیە دوای کۆچکردنیان، بۆشاییو خەمو خەفەت لە دوای خۆیانەوە جێدەهێڵن. بیرمەندەکان وەک ئەستێرەکانی ئاسمانن، کاتێ دەکەونە خوارەوە، ڕووناکی تۆزقاڵێک کەمدەبێتو پانتایی تاریکی زیاددەبێت. جیهانی ئیسلامی پێویستی بە تاریکی زیاتر نییە، ئەوەندە تاریکیو تاریکبینی تێدایە، بەشی هەموو جیهان دەکات! لێرەوەیە پێماننناخۆش بوو لەم کاتوساتەدا «جابری» لەدەستبدەین.

من هەرچەندە ئەوە دەڵێم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندینجار جیاوازی خۆم لەگەڵ پرۆژەکەی ئەودا دەربڕیوە. من وەک هەموان دەزانن، لە لایەنگرانی پرۆژەی ڕەخنەگرتنم لە عەقڵی ئیسلامی، نەک ڕەخنەگرتن لە عەقڵی عەرەبی. بۆچی؟ چونکە شتێک نییە ناوی عەقڵی عەرەبی یان عەقڵی تورکی یاخود عەقڵی فارسی یان عەقڵی پاکستانی، تەنانەت عەقڵی فەرەنسی یاخود ئەڵمانی یان ئەمریکی بێت. لەدواجاردا عەقڵی مرۆڤایەتی یەک عەقڵە، بەڵام بە قۆناغی گەشەکردنو پێگەشتنی جیاواز جیاوازدا تێدەپەڕێت. عەقڵێک هەیە تیۆلۆژیای ئاینی تەقلیدی هەیمەنەی بەسەردا کردووەو تەحەکومی پێوەدەکات، عەقڵێکی دیکە هەیە خۆی لەو تیۆلۆژیای ئاینە ڕزگارکردووە. بەم مانایە عەقڵی عەرەبی لە عەقڵی تورکی یان فارسی یاخود پاکستانی یان بەشێوەیەکی گشتی لە عەقڵی ئیسلامییەوە نزیکە، تا عەقڵی ئەوروپی یان ئەمریکی کە بوونەتە عەقڵێکی عەلمانیو تا ئاستێکی زۆر خۆیان لە کۆتوبەندی سەدەکانی ناوەڕاستو تیۆلۆژیاکەی ڕزگارکردووە. لەسەر ئەم بنەمایە یاخود لەسەر ئەم سەنگی مەحەکە، دادگایی عەقڵەکان دەکرێت.

بەم مانایە عەقڵێک هەیە عەقڵی ئاینییە یان عەقڵی تیۆلۆژیای سەدەکانی ناوەڕاستەو نوێنەرایەتی قۆناغێکی پێشتر دەکات لە قۆناغەکانی مرۆڤایەتی. عەقڵێکی دیکە هەیە عەقڵێکی زانستییە یان عەقڵێکی فەلسەفی مۆدرێنەو نوێنەرایەتی قۆناغێکی دواتر دەکات، ئەو درزەی نێوان ئەم دوو عەقڵە لەیەکتر جیادەکاتەوە، بریتییە لە دابڕانی مۆدێرنە. با زۆر بە کورتی بڵێین دابڕانێکی ئەبستمۆلۆجی هەیە، واتە دابڕانێکی قووڵی زانستی، عەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست لە عەقڵیەتی سەدەکانی مۆدێرنە جیادەکاتەوە. ئەمە هەرگیز مانای ئەوە نییە ئاین لەسەدەی مۆدێرنەدا کۆتایی پێهاتووە یان دەبێت کۆتایی پێبێت! نا هەرگیز. خۆشبەختانە ئاین هەر دەمێنێتەوە، بەڵام ئاینێکی ڕۆشنگەر، ڕوناک، ئازاد، ڕق لە ئایندا نییە. هەموو ئەوانەش بەهۆی خوێندنەوەیەکی تازەوە بۆ ئاین دێتەئاراوە، ئیدی ئاین دەبێتە ئاینێکی عەقڵانیو فەلسەفی قووڵ، بە پێچەوانەی سەدەکانی پێشترەوە کە ئاینێکی داخراو مەزهەبگەراو بەرتەسک بووە. «پۆل ریکۆر» یەکێکە لە فەیلەسوفە گەورەکانی فەرەنسا، لەیەککاتدا ئیماندارو فەیلەسوف بوو، بەڵام ئیمانی فەیلەسوفانێک کە لەناو زانستدا جێگیربووە، نەک ئیمانی نەزانو دەمارگیرو تەکفیرییەکان. لەم ڕۆژگارەماندا پێویستییەکی زۆرمان بە فەلسەفەی ئاینو ئاشتکردنەوەی نێوان ئاینو فەلسەفە هەیە.

لە واقیعدا «جابری» ڕەخنە لە عەقڵی سەلەفی کۆن دەگرێت کە کۆنترۆڵی کردوینو ئەو هۆکاری چەقبەستنو دواکەوتنمانە. «جابری» لە کتێبە یەک لەدوا یەکەکانیدا کە تەرخانکراون بۆ ڕەخنەگرتن لە عەقڵی عەرەبی، ڕەخنە لە عەقڵی سەلەفی کۆن دەگرێت. لێرەوەیە نهێنی

سەرسامبونی بە «فارابی»و «ئیبن ڕوشد»و بانگەشەکەی بۆ تێگەشتنێکی عەقڵانی بۆ کەلتور وەک دواهەمین چارەسەر. ئالێرەدایە خاڵی ڕێکەوتن لەگەڵیداو سەرسامبوون پێی. من ئەوە دەڵێم، گەرچی پرۆژەکەی لە دوو لایەنی مەنهەجیو ئەبستمۆلۆژییەوە، ناتەواوی تێدایە، وەلێ ئێستا کاتی ئەوە نییە قسە لەسەر ناتەواوییەکان بکەین، بەڵکو کاتی ئەوەیە قسە لەسەر خاڵە پۆزەتیڤەکانی بکەین.

کەواتە بۆچی پرۆژەکەی ناونا ڕەخنە لە عەقڵی عەرەبیو ناوی نەنا ڕەخنە لە عەقڵی ئاینی یان ئیسلامی، وەک ئەوەی «ئارکۆن» کردی؟ لەبەر هۆکارێکی سادە کە بریتییە لەوەی ئەو لە کۆمەڵگایەکی ئیسلامیدا دەژیو لە زانکۆیەکی عەرەبیدا وانە دەڵێتەوە، نەک لە زانکۆیەکی بیانی. هەروەها ئەو بە زمانی عەرەبی دەنوسێت، نەک بە زمانی فەرەنسی یان ئینگلیزی. لێرەوە بلیمەتیەکەی هەرچەندێک بێت، بەڵام پەراوێزی ئازادییەکەی پەراوێزێکی سنورداره. لێرەوە لە هەڵوێستی ئەو تێدەگەینو ڕێزی لێدەگرین. تۆ ناتوانیت لە بارودۆخێکی سەختو چاودێریکردنێکی ترسناکی کۆمەڵگاو شەقامی فێندەمێنیتاڵیزم، داوای شتی زیاتری لێبکەیت، زیاد لەوەی کە پێشکەشی کردووە. ئاشکرایە توندڕەوەکان زیاد لە جارێک پەلاماریان داوە. ئەوەی لە کەناری ڕوبای سین یان تایمز بیربکاتەوەو بنوسێت، جیاوازە لەوەی لە کەناری نیل یان فورات بیردەکاتەوەو دەنوسێت! ئێمەش نەمانوێرا پرۆژەکەی «ئارکۆن» بەناوە ڕاستەقینەکەی خۆیەوە ناوبنێین، تەنها بەم دواییانە نەبێت. هەمیشە لە کاردانەوەی برا سەلەفییەکانمان یان فێندەمێنیتالیستەکان دەترساین. بۆیە دوای سی ساڵ لە وەرگێڕان، وێرام کتێبەکەی «ئارکۆن» بەناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە بڵاوبکەمەوە: (بەرەو ڕەخنەگرتن لە عەقڵی ئیسلامی).

مەسەلەکە هەرچۆنێکبێت، مامۆستا «جابری» لەلایەن فەرەنسییەکانەوە، لە هەموو ئەو ڕۆشنبیرانەی دیکەی عەرەب کە تەنها بە زمانی عەرەبی دەنوسن، لەهەموان زیاتر بایەخی پێدراوە. بەم دواییانە ژمارەیەکی زۆر لە کتێبەکانی وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانی «ڤۆڵتێر»و «مۆلێر»، لەوانە جگە لە تێزەکەی دەربارەی «ئیبن خەلدون»، ئەم کتێبانەی وەرگێڕدراون (دەروازەیەک بۆ ڕەخنەگرتن لە عەقڵی عەرەبی، لە بڵاوکراوەکانی لادیکۆڤێرت، پاریس ١٩٩٥)، (دوێنێو ئەمڕۆی عەقڵی سیاسی لە ئیسلامدا، لە بڵاوکراوەکانی لادیکۆڤێرت، پاریس ٢٠٠٧). سەرچاوە بیانییەکانی «جابری» بۆ خوێندنەوە، وەک زۆرێک لە ڕۆشنبیرەکانی مەغریبی عەرەبی، سەرچاوەی فەرەنسین، وەک «باشلار»، «بیاجیە»، «فۆکۆ»، «لیڤی شتراوس»..هتد. ئەمە جگە لە ڕۆژهەڵاتناسە گەورەکان.

ڕەحمەتێکی فراوانی یەزدان لە «محەمەد عابد جابری»و سوپاس بۆ ئەو خزمەتە گەورەو مەزنانەی پێشکەشی فیکری عەرەبی کرد، بە مەبەستی ڕزگارکردنە سەختەکەی لە کەڵەکەبوونەکانی ڕابردوو تاریکی سەدەکان.

### سەرچاوە:

ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، ٢٠١٠/٥/٨، لاپەڕەی بیروڕا.

# کۆچی دوایی ساراماگۆ...
# شاعیری ئازارەکانی مرۆڤایەتی



**فاضل السلطانی**
**لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع**

**ئەوەتا** ساراماگۆ بە بێدەنگی کۆچی کرد، مردنەکەی پاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی کەم دواکەوت، دواهەمین دەرفەتی لە ژیاندا بۆ ڕەخساند تاکو ماڵئاوایی لە خێزانەکەیو هاوسەرەکەی بکات کە تابڵێی خۆشیدەویست، گەرچی سیو سێ ساڵ جیاوازی تەمەن لەنێوانیاندا هەبوو. هەروەها دەرفەتی بۆ ڕەخساند ماڵئاوایی لە شارە بچکۆلانەکەی لە دورگەکانی کەناری بکات، ئەو شارەی ساراماگۆ بە ئارەزوی خۆی وەک مەنفایەک هەڵیبژارد، ئەمەش دوای ئەوەی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی وڵاتەکەی، پورتوگال، کەوتە ململانێ.

پێرێ ئەو پیاوەی هەموان کۆکن لەسەر ئەوەی یەکێکە لە نوسەرە هەرە مەزنو نەجیبزادەکانی سەدەی بیستەم، بە بێدەنگی کۆچی کرد. ئەو دەستبەرداری فیکرە مارکسییەکەیو ئەندامبوون لە حیزبی شیوعی پورتوگالی نەبوو، گەرچی زۆربەی زۆریان گۆڕانو ئاراستەی فیکری تەواو پێچەوانەیان وەرگرت. هەروەها گەرچی ئەو فیکرە (واتە فیکرەی مارکسیەت-و-) بووەتە شوێنی ناڕەزایی یاخود لەزۆر ناوچەی جیهاندا باوی نەماوە. ساراماگۆ بە نوسینو بە تێکۆشان، لە سەدەیەکدا ململانێی لەگەڵ ژیان دەکرد، هاوڕێ مارکسییەکەیو مێژونوسی بەریتانی «ئاریک هۆبزباوم» ناویدەنێت: (توندوتیژترینو بێزراوترین سەدە).

ساراماگۆ دوای ئەوەی لەساڵی ١٩٩٨ خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەب وەردەگرێت، سەبارەت بەم موفارەقەیە دەڵێ: (خەڵکی ڕاهاتبوون پێم بڵێن ئەو مرۆڤێکی باشە، بەڵام شیوعیە. وەلێ ئێستا دەڵێن ئەو شیوعیە، بەڵام مرۆڤێکی باشە). ئەم فیکرە وایلێکرد پشتگیری هەموو چەوساوەکانی جیهان بکات، هەڵوێستەکانی بۆ پشتگیری کردنی فەلەستینیەکان ناسراوە. دوای جەنگی (جنین)ی بەناوبانگ لە ساڵی ٢٠٠٢، سەردانی کامپەکەی کردو ئەمەی نوسی: (هەموو ئەو زانیارییانەی لەو بڕوایەدابووم لەسەر بارودۆخی فەلەستین هەمە، تێکشکان. زانیارییەکانو وێنەکان شتێکەو واقیع شتێکی دیکەیە. پێویستە پێیەکانت لەسەر زەوی دابنێیت، تاکو بزانیت بەڕاستی چی لەوێ ڕودەدات. پێویستە هەموو زەنگەکانی جیهان لێبدرێت، تاکو بزانیت ئەوەی لێرەدا ڕودەدات تاوانەو پێویستە ڕابوەستێنرێت. ئێرە تەنوری گازی لێ نییە، بەڵام کوشتن تەنها لەڕێگەی تەنوری گازەوە ئەنجامنادرێت. هەندێ شت لەلایەنی ئیسرائیلەوە کراوە، وەک هەمان کارەکانی نازییەکانە. ئەوە کۆمەڵە کارێکە لێخۆشبونی بۆ نییە کە گەلی فەلەستینی ڕوبەڕووی بونەتەوە).

لەکاتی گەمارۆدانەکەی سەرۆکی فەلەستینی «یاسر عەرەفات» لە ڕامەڵڵا، ساراماگۆ لەگەڵ کۆمەڵێ نوسەری جیهانیدا، گەمارۆکەیان شکاند. ساراماگۆ لە شوێنێکدا دەڵێ: (ئەوەی ئیسرائیل دژی فەلەستینیەکان ئەنجامیدەدات، لەوەدەچێت کە نازییەکان لە گیتۆکاندا دژ بە جولەکەکان ئەنجامیاندەدا). ئەم لێدوانەی هەرایەکی گەورەی لە ئیسرائیلدا نایەوە، سیاسیەکانو میدیاکانو ئەدیبەکان هێرشیان کردەسەر. دواتر ساراماگۆ لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسیدا، سەبارەت بەو گلەییو ڕەخنانەی ئیسرائیلییەکان دەڵێ: (ئەوەی وتم بەڵێ وتومە، ئەگەر وشەی گیتۆ توشی سەدمەیان دەکات، ئەوا وشەکە دەگۆڕمو دەیکەم بە تاوان دژ بە مرۆڤایەتی. ئێوە هەڵیبژێرن).

ئیدی لەو سەردانەوە، ساراماگۆ هاوڕێیەتیەکی توندوتۆڵ لەگەڵ «مەحمود دەروێش»ی شاعیردا دەبەستێ کە بەلای ساراماگۆوە شوێنو پێگەی شاعیری شیللی «بابلۆ نیرۆدا»ی هەیە. دواتر ساراماگۆ سەبارەت بە «مەحمود دەروێش» دەنوسێتو دەڵێ: (کە مەحمود دەروێش دەخوێنیتەوە، جگە لەوەی لەبەردەم ئەزمونێکی ستاتیکادایت کە مەحاڵە لەبیرت بچێتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا مانای وایە تۆ سەفەرێکی پڕ ئازار، لەسەر هێڵی ستەمو ئابڕوچون ئەنجامدەدەیت کە قوربانییەکەی میللەتی فەلەستینە لەسەر دەستی ئەم جەلادە ئیسرائیل، نوسەری ئیسرائیلی «دێڤید گۆرسمان» لە چرکەساتێکی ڕاستگۆییدا، سەبارەت بەو جەلادە دەڵێ ئەو هیچ بەزەییەک نازانێت).

(ئەمڕۆ، لە کتێبخانە، هەندێ شیعری مەحمود دەروێشم خوێندەوە، ئەمەش لەپێناو تەواوکردنی کاسێتێکی تۆمارکراوی دیکۆمێنتاری کە بە بۆنەی یادی تێپەڕبونی ساڵێک بەسەر مردنەکەیدا، لە ڕامەڵڵا نمایشدەکرێت. بانگهێشتیان کردم بڕۆم بۆ ئەوێ، بزانم دەتوانم ئەو سەفەرە بکەم، ئەم سەفەرە، بە دڵنیاییەوە، لەلایەن پۆلیسی ئیسرائیلییەوە، نابێتە شوێنی خۆشحاڵی. دەمەوێ یادی ئەو لەئامێزگرتنە برایانەیە بکەم، کە منو مەحمود دەروێش، پێش شەش ساڵ، لە هەمان ئەو شوێنەدا، ئەنجاممان دا. یادی ئەو وشانە بکەمەوە کە بەیەکترمان وتو چیتر ناتوانین جارێکی دیکە بەیەکتری بڵێینەوە. هەندێجار ژیان ئەوەی بەدەستێکی پێتدەبەخشێ، بە دەستەکەی دیکەی لێتدەسێنێتەوە. من لەگەڵ مەحمود دەروێشدا ئاوام لێ بەسەرهات).

ئەم ئەدیبەمان، ساراماگۆ، ئەو هاوکێشە قورسەی نێوان (مرۆڤو داهێنەر)ی بەدەستهێنا. لای ساراماگۆ هیچ ناکۆکییەک لەنێوان ئەو دوانەدا نییە، وەک ئەوەی لای زۆرێک لە نوسەران دەیبینین. پابەندبونی وەک مرۆڤێک بە فیکری مارکسییەوە، نەیخستە ناو تەڵەی ئەوەی پێیدەوترا (ڕیالیزمی ئیشتراکی) کە کۆمەڵێ پێوانەی دیاریکراوی هەبوو، لە چوارچێوەیدا ژمارەیەکی زۆر نوسەر پوکانەوەو تێیدا فیکر زاڵ بوو بەسەر هونەردا، یاخود تێڕوانینی سیاسی زاڵبوو بەسەر گەرموگوڕی داهێنانی هونەری ڕاستەقینە. ساراماگۆ هەر لە ڕۆمانی یەکەمیەوە (وڵاتی گوناه) ١٩٤٧، فیکرو هونەری پێکەوە ئاوێتەکرد، هێزی داهێنانیشی لێرەدایە کە بەوپەڕی لێهاتوییەوە وایکرد خەڵاتی نۆبڵ وەربگرێت، هەروەها ئەو ئاوێتەکردنە نهێنی مانەوەی ئەدەبەکەیەتی کە بە بێدەنگیەکی گەورەو ڕاستگۆییەکی گەورەوە ئەو ئەدەبەی بنیاتنا. ئەو وەک «هیمنگوای» باوەڕی بەوە بوو نوسەر، ئەگەر شتێکی گرنگی نەبێت بۆ وتن، ئەوا پێویستە بێدەنگ بێت. بە ڕاستیش هەر وابوو، ساراماگۆ بۆ ماوەی هەژدە ساڵ بێدەنگ بوو، لەو ماوەیەدا تەنها چەند کۆمەڵە شیعرێکی هاکەزایی بڵاوکردەوەو زۆربەی کاتی خۆی بۆ ڕۆژنامەگەری تەرخانکردبوو. پێدەچێت ساراماگۆ دوای ئەو کودەتا سەربازییەی لە ساڵی ١٩٧٤دا، بووە هۆی ڕوخانی دیکتاتۆر «ئەنتۆنیۆ سالازار» کە بۆ ماوەی چل ساڵ حوکمی وڵاتی دەکردو دوای ئەو پەشێوییانەی وڵاتی گرتەوە، ئەوەی دۆزییەوە کە دەبێت بیڵێ.

ساراماگۆ ساڵی ١٩٨٢، بە گوڕوتینێکی بەهێزەوە هاتە ناو کایەی ڕۆمانی جیهانی، ئەمەش دوای بڵاوبونەوەی ڕۆمانە مێژوییەکەی کە بەم ناونیشانە (بالتازار و بلیمۆندا) وەرگێڕدرا بۆ زمانی ئینگلیزی. تەوەری سەرەکی لە ڕۆمانەکەدا، هەمان ئەو تەوەرەیە کە ڕۆمانەکانی دواتریشی لەسەر بنیاددەنێت: تەوەری نەهامەتی تاک لەبەرامبەر دەسەڵاتدا، سا ئەو دەسەڵاتە چ دەسەڵاتێکی مادیی بێت یان ڕۆحی. ساراماگۆ کاریگەری چەوساندنەوە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانی لەسەر مرۆڤ ئاشکراکرد، مرۆڤێک هەوڵدەداو تێدەکۆشێت لەبەرامبەر کۆمەڵگاکەیدا کە لە ئازادیو مافە بنەڕەتیەکانیو شوناسیو تەنانەت بوونی وەک مرۆڤ بێبەشی دەکات، پارێزگاری لە شوناسی بکات.

ئەگەرچی ساراماگۆ لە زۆربەی ڕۆمانەکانیدا پشتدەبەستێت بە مێژویەکی (وشک)، هەروەها لەسەر شێوازی «مارکیز» پشتدەبەستێت بە وردەکاری واقیع کە تێکەڵ بە ئەفسانەو خەیاڵێکی

سریالی کراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ساراماگۆ لە گێڕانەوەیدا ئەو بارگە شیعرییەی وندەکردووە، بگرە خوێنەر لە کارە باشەکانیدا، هەستدەکات لەپشتی دێڕە درێژو بەناویەکداچووەکانەوە، ئیقاعێکی شاراوە هەیە کە ڕۆمانی (مێژوویی) پێویستی پێیەتی. ئەمە ئەگەر ڕۆمانەکانی ساراماگۆمان ناونا بە ڕۆمانی مێژوویی. وەک ئەوەی لە ڕۆمانی (ئابڵوقەی لەشبۆنە)دا دەردەکەوێت کە لە ساڵی ١٩٨٩دا بڵاویکردەوەو بە بۆچونی ئێمە باشترین کاریەتی. ساراماگۆ بابەتی سەرەکی ئەم ڕۆمانەی لە گەمارۆدانێکی ڕاستەقینەوە وەرگرتووە کە لەشبۆنە لە ساڵی ١١٤٧دا ڕوبەڕووی بووەتەوە. بەڵام ساراماگۆ دەمانگوازێتەوە بۆ ئاستێکی دیکەی حەقیقەت، ئاستێک جیاوازە لەوەی مێژوو وەک پیشەی خۆی تۆماریکردووە. ئەو پێدراوە مێژووییەکان سەرلەنوێ تێکەڵ دەکاتەوە، تاکو بگات بە حەقیقەت، حەقیقەتی مێژوو، مرۆڤ، چارەنوسی مرۆڤایەتی کە لە بەڵگەنامە فەرمییەکاندا تۆمارنەکراون.

جەنگی ساراماگۆ لەگەڵ مێژودا، کە دەسەڵاتی مادیی یان ڕۆحی نوسیویەتیەوە، کۆتایی نەهات. دواهەمینیان ئەو جەنگە بوو کە وایکرد مەنفایەکی ئیختیاری هەڵبژێرێت، ئەمەش دوای بڵاوبونەوەی ڕۆمانی (ئینجیل بەپێی یەسوعی مەسیح) کە تێیدا مەسیح وەک ئەوەی کوڕی یوسف پێغەمبەر بێت وێناکراوە، ڤاتیکان زۆر بە توندی ڕەخنەی لێگرتو حکومەتی پورتوگالیش، لە ڕێگەی قەدەغەکردنی ڕۆمانەکەوە، پاڵپشتی ڤاتیکانی کرد. ساراماگۆ مەنفاکەی لە دورگەیەکی بچوکی، دورگەکانی کەناری هەڵبژارد، ئەوەش هەمان ئەو دورگەیەیە کە ئەم کوڕە جوتیارە، تێیدا کۆچی دوایی دەکاتو تا تەمەنی شەست ساڵی، کەس نەیدەزانی ئەو دەبێتە عەلامەیەکی گەورە لە ئەدەبی مرۆڤایەتیدا. ساراماگۆ لە کتێبەکەیدا (بیرەوەرییە بچوکەکان) کە عەباس ئەلمەفرەجی وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی، باس لە منداڵییە بەئازارەکەی خۆی دەکاتو دەڵێ: (بڕواناکەم قەدیس ئەنتۆنیۆس بەرگەی ئەو ترسەی گرتبێت کە من بەرگەمگرتووە، ترسێک لە میانەی ئەو مۆتەکانەوە توشیدەبووم کە چەندینجار بۆمدەهاتو تێیدا خۆم بە بەندکراوی لە ژورێکی سێگۆشەیی بێ پەنجەرەو بێ دەرگاو بێ ناوماڵ دەبینیەوە، لەیەکێک لە گۆشەکانیدا (شتێک) هەبوو، پێیدەڵێم شتێک، چونکە ناتوانم ماهیەتی ئەو شتە ئاشکرابکەم، بە سستی گەشەی دەکردو وردە وردە قەبارەکەی گەورەتر دەبوو، منیش دەکشامەوە بۆ گۆشە دوورەکەو دواجار بەئاگادەهاتمەوەو ترس سەرتاپامی داگرتبوو، لەناو تاریکیو زوڵمەتی شەودا، نوقمی ئارەقی خۆم ببووم).

## ژیانی ساراماگۆ

*ڕۆژی ١٦ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ لە ئەزینهاگا (ناوەڕاستی پورتوگال)، لە خێزانێکی جوتیار لەدایکبووە.

*سەرەتای ژیانی قوفڵی دروستکردووە، پاشان کاری ڕۆژنامەوانیو وەرگێڕانی کردووە.

*ساڵی ١٩٥٩ لە حیزبی شیوعی پورتوگال بووتە ئەندام.

*ساڵی ١٩٨٢ خەڵاتی یانەی قەڵەمی نێودەوڵەتی وەرگرتووە، ساڵی ١٩٩٥ خەڵاتی کامۆیسی پورتوگالی وەرگرتووە.

*لە ساڵی ١٩٩٢ تاکو ڕۆژی مردنەکەی، لە مەنفا ئیختیارییەکەی لە دورگەی لانزارت، ژیاوە.

*ساڵی ١٩٩٨ خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەب وەردەگرێت.

*لە ٢٠١٠/٦/١٨ کۆچی دوایی دەکات.

ڕۆمانەکانی

*وڵاتی گوناه ١٩٤٧

*کورتەی وێنەو هێڵ ١٩٦٧

*لیفنتادۆ دۆتشار ١٩٨٠

*خودای گۆج ١٩٨٢

*ساڵی مردنی ڕیکاردۆ ڕیس ١٩٨٤

*کەڵەکی بەردین ١٩٨٦

*ئابڵوقەی لەشبۆنە ١٩٨٩

*کوێری ١٩٩٥

*هەمو ناوەکان ٢٠٠٢

*ئینجیل بەپێی یەسوعی مەسیح ١٩٩٢

## سەرچاوە:

الشرق الاوسط، لاپەڕەی مونتەدای ڕۆشنبیری، یەک شەممە، ٢٠ حوزەیران ٢٠١٠.

# کەس ئاگای لە پشیلە ئێرانییەکان نییە

لە فارسییەوە: مەنسور تەیفوری

**کەس** ئاگای لە پشیلە ئێرانیەکان نییە، دوایین فیلمی دەرهێنەری کورد بەهمەنی قوبادییە.
فیلمەکە بەسەرهاتی موزیسیەنە گەنجە ژێرزەمینیەکان و موزیکەکەیان( ژێرزەمینین لە بەرئەوەی موزیکەکەی ئەوان لە لایەن کۆماری ئێسلامییەوە بە نایاسایی لەقەڵەم دراوە) و هەوڵیان بۆ بەرهەمهێنان و خۆپاراستن لە گرتن و لە پۆلیس دەگێڕێتەوە.

لە ئێران بۆ بەرهەمهێنانی مووزیک دەبێت لە وەزارەتی کوولتوور و ئیرشادی ئیسلامی داوای مۆڵەت بکەیت و چاوەڕێ بکەیت. لە کاتی چاوەڕێکردنەکەشدا نواندنی مووزیک نەیاساییە، وەکی تر ژنان ( مەگەر لە گرووپی ٥ کەسیدا بن) بۆیان نیە بە تەنیا یان لەبەردەم بینەراندا مووزیک بنوێنن. ئەگەرچی مووزیکی راپ بە هەموو شێوەیەک نایاساییە.

رەنگە هەندێ بینەر بڵێن " فیلمەکە بەپێی رووداو و کەسایەتی و شوێنکاتی ناڕاستەقینە دروست کراوە". وەک دیارە بەشێک لە فیلمەکە ئیلهامی لەو سەدان کەسە وەرگرتبێت کە ساڵی ٢٠٠٧ لە کۆنسێرتیکی نایاساییدا لە تاران گیران. یەکێک لە خاڵە بەهێزەکانی فیلمەکە بانگ نەکردنی ئەکتەری پرۆفیشناڵە و لەباتی ئەمان ژیانی راستەقینەی مووزیسیەنە" ژێرزەمینی" یەکان دەور دەگێڕێت.

نیگاری شەقاقی و ئەشکانی کووشانەژاد کە خۆشیان مۆسیقارن، بۆ کەسێک دەگەڕێن کە بتوانێت بۆ بەشدارییی لە فێستیڤاڵێکی مووزیکدا لە لەندەن ویزا و پەساپۆرتیان بۆ دروست بکات. ئەشکان تازە لە زیندان بەربووە و ناتوانێت بە شێوەی یاسایی داوای پەساپۆرت بکات. ئەم دوانە دەلاڵێکی زیرەک بە ناوی نادر دەناسن کە دەڵێت دەتوانێت ڤیزا و پەساپۆرتیان بۆ ئامادە بکات و شارەزایەکی تەواوی فرۆشتن و کۆپیکردنی ناسایی مووزیک و فیلمە.

نادر ئەم دووانە بە هەندێ مۆسیقاری ژێرزەمینیی دیکە دەناسێنێت بە هیوای ئەوەی بەر لە رۆشتنیان بتوانن گرووپێک بۆ بەرهەمهێنانی مووزیک درووست بکەن. کە ئەمان دەچنە لای



مۆسیقارەکانی دیکە، بینەران ئاگایان لە تێکەڵکردنی پارچەی موزیکی ئێرانی و مووزیکی مێتاڵ و راک و راپە کە وادەکەن بینەر بڕوا بکات کە ئەم کەسانە لە کوێی دنیا بن زۆر لێک جیاواز نین. لە رێگەی گوێگرتن لە مووزیکەوە گوێت لە داستانەکەیان دەبێت... و تێدەگەیت مووزیکەکەیان چەندە سەرکوت کراوە، چەندە رژێمەکەیان رقی لێیانە. دەوڵەتەکەیان دەڵێ هەموو مۆسیقارە ژێرزەمینیەکان شەیتان دەپەرستن و لە کاتێکدا ئەوان بۆ کردنی ئەو شتەی خۆشیان دەوێت تووشی مەترسی زیندان و تەنانەت مردن دەبن ، تێدەگەی چەندە بەختەوەریت کە لە وڵاتێکدا دەژیت دەتوانی لە کوێ پێت خۆش بوو گۆرانی بڵێیت.

زۆر مەترسیدارە ئەستێرەی فیلمێک بیت کە کەسایەتیەکانی ٤ کاتژمێر پاش دوایین وێنەگرتنی فیلمەکە وڵات جێدێڵن. یەکێکیان ئێستا داوای پەنابەریی لە فەرەنسا کردووە.

فیلمەکە چیرۆکێکی راستەقینەی هەیە و شێوازەکەی نیمچە بەڵگەنامەییە، بەڵام چەندین توخمی هونەری لە خۆی گرتووە.

**سەرچاوە:**

ئەنتەرنێت

# بڵاوكراوەكانی
## دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ئامادەكردنی: باوكی ڕەهەند

**وەك** پیشەی هەموو جارێك، دەزگای سەردەم لەماوەی دوو مانگی رابردودا، كۆمەڵێ كتێبی دیكەی خستە كتێبخانەی كوردییەوە. ئێمە لێرەدا قسە لەسەر دوو كتێب دەكەین كە هەردوكیان ئینسایكلۆپیدیان، یەكێكیان كتێبی (ئینسایكلۆپیدیای گشتی)یەو ئەوی دیكەیان كتێبی (كورد لە ئینسایكلۆپیدیای ئیسلامیدا)یە.

### *ئینسایكلۆپیدیای گشتی*:

ئەم كتێبە سێ بەرگی قەبارە گەورەیە، تا ئێستا بەرگی یەكەمی، كە ٦٣٠ لاپەڕەی گەورەی ئەی فۆڕەو چاپی دووەمی كراوەتەوە، خراوەتە بەردەستی خوێنەری كورد، بەرگی دووەمی چاپەكەی تەواوبووەو لە قۆناغی تەجلیدكردنی بەرگەكەی‌و جزوبەندكردنیدایەو چاوەڕوان دەكرێت لە ماوەیەكی نزیكدا بكەوێتە بەردیدی خوێنەران، بەرگی سێیەمی لە قۆناغی چاپكردندایەو لەوانەیە پێش كۆتایی ئەمساڵ ئەم بەرگی سێیەمەش تەواوببێتو بكەوێتە كتێبخانەی كوردییەوە. بێگومان بە تەواوبونی هەر سێ بەرگەكە، كتێبخانەی كوردی دەبێتە خاوەنی ئینسایكلۆپیدیایەكی نایابی قەبارە گەورە، كە خۆیدا لە نزیكەی ٢٠٠٠ لاپەڕەی گەورە.

ئاشكرایە ئینسایكلۆپیدیا هەروا ئاسان نییەو كاركردن تێیدا بەقەد دەیانو بگرە سەدان كتێب قورسترە، ئینسایكلۆپیدیا كتێبێك نییە باس لە تەنها بابەتێك یان فیكرێك یاخود میتۆدێك یان

هەر شتێکی دیکەی زانستی یان ئەدەبی یان سیاسی یاخود فەلسەفی یان کۆمەڵایەتی...هتد بکات. بەڵکو دەتوانین بڵێین ئینسایکلۆپیدیا باس لە هەموو ئەوانە دەکات. سەرەڕای ئەوە ئینسایکلۆپیدیا ڕۆمانێک یان دیوانە شیعرێک یان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی نییە، دوای خوێندنەوەی ئیدی لە سوچێکی کتێبخانەکەتدا دایبنێیتو چیتر پێویستت پێی نەبێت. ئینسایکلۆپیدیا یەکێکە لەو کتێبانەی دەبێتە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندو گرنگ، بۆ زۆر نوسینو لێکۆڵینەوەو ڕاڤەکردن، دەبێتە ژێدەرێکی دەوڵەمەند بۆ هەموو ئەو کەسانەی سەروکاریان لەگەڵ نوسینو توێژینەوەدایە، هەروەها دەکرێ ببێتە یارمەتیدەرێکی زۆرباشی ئەو خوێندکارانەی نامەی دەرچوونو تێزی ماستەرو دکتۆرا دەنوسنو کۆمەڵێ زانیاری وردیان بخاتەبەردەست کە پێویستیان پێیەتی. چونکە ئەو زانیارییە هەمەڕەنگو فرە جۆرانەی لەناو ئینسایکلۆپیدیادا بەردەستی خوێنەر دەکەوێت، لە هیچ کتێبو سەرچاوەیەکی دیکەدا، بەو شێوەیە بەردەستی ناکەوێت. ئیسایکلۆپیدیا کورتکردنەوەی سەرجەم ئەو زانستو زانیارییانەیە کە لە بەرەبەیانی مێژوی مرۆڤایەتییەوە بەرهەم هاتوون، تاکو گەشتوەتە ڕۆژی ئەمڕۆمان.




ئێمە لە ڕێگەی خوێندنەوەی ئینسایکلۆپیدیاوە، شارەزای بڕێکی زۆری ئەو داهێنانو کارە زانستیو ئەدەبیانە دەبین، کە لە دێرزەمانەوەو لە سەردەمانی پێشوتردا لەسەر دەستی داهێنەرە مەزنەکانیان داهێنراون. ئینسایکلۆپیدیا ئەو دەروازە واڵایەیە کە بەئاسانی لێیەوە تەماشای مێژوی پێشکەوتنو مێژوی داهێنانە گەورەکانی مرۆڤایەتی دەکەیت، هەروەها ئەو دەروازە پانو فراوانەیە کە لێیەوە ئاشنایەتی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری فەیلەسوفو زاناو

سیاسیو ئەدیبو شۆڕشگێڕو شۆڕشو شارو گوندو ڕوبار..هتد دەبیت.

لێرەوە بایەخی چاپکردنی ئەم جۆرە ئینسایکلۆپیدیایە دەردەکەوێت، لێرەوە تێدەگەین بوونی کتێبی ئینسایکلۆپیدیا لەناو کتێبخانەکانمان چەند گرنگو پێویستە.

بەرگی یەکەمی ئینسایکلۆپیدیاکەی دەزگای سەردەم کە لەلایەن بەڕێز «یاسین صابر صالح»ەوە ئامادەکراوە، پیتەکانی (ا، ب، پ، ت، پ) لەخۆدەگرێت، لەم بەرگەدا دەیانو سەدان وێنەی ڕەنگاوڕەنگو ڕەشوسپی، سەرکردە مێژوییەکانی جیهانو شاژنو پاشاکانو نەخشەی شارەکانو دیمەنی شوێنەوارەکانی جیهان دەبینین.

لە ڕاستیدا پێویستە دەستخۆشیو سوپاسی بەڕێز کاک «یاسین ×ابر ×الح» بکەین، کە بە تەنهاو بە هەوڵو ماندوبونو شەونخونییەکی زۆرو بێوێنە، ئەم کارەی ئەنجامداوە. ئاشکرایە نوسینی ئینسایکلۆپیدیا کاری تەنها کەسێک نییە، بەڵکو کارێکی هەرەوەزییەو پێویستی بە دەیانو سەدان خەڵکی پسپۆڕو شارەزا هەیە، بگرە پێویستی بە دەزگاو ناوەندی ڕۆشنبیری گەورەو بەرفراوان هەیە، بەڵام لەگەڵ نەبونی ئەوانەشدا، بەڕێز مامۆستا «یاسین» توانیویەتی کارێک ئەنجامبدات تابڵێی گرنگو پڕ بایەخ.

ماوەتەوە بڵێین ئەم ئیسیاکلۆپیدیا گەورەیە، لەلایەن بەڕێز «جەمال دەروێش»ەوە کاری مۆنتاژی بۆ کراوەو بە فۆنتێکی گەورەش بابەتەکان نوسراونەتەوە کە بە ئاسانی دەخوێنرێتەوە. ئەم ئینسایکلۆپیدیایە بە هەرسێ بەرگەکەی، نرخی تەنها پەنجا هەزار دینارە، ئەم نرخە بۆ ئەو کتێبەو بەو قەبارە گەورەیەی، نرخێکی گونجاوەو کارێکی زۆرباشە. تیراژی بەرگی یەکەمی ئینسایکلۆپیدیاکە سێ هەزار دانەیە.

### کورد لە ئینسایکلۆپیدیای ئیسلامدا:

ئەمە یەکێکی دیکەیە لەو کتێبە گرنگانەی لە ماوەی ڕابردودا، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم بەچاپی گەیاندو خستیە بەردەستی خوێنەران، بەتایبەتی ئەو خوێنەرانەی عاشقی کتێبی مێژویینو حەز بە خوێندنەوەی بەسەرهاتی میللەتانو نەتەوە جیاواز جیاوازەکانی جیهان دەکەن. ئەو خوێنەرانەی دەیانەوێ بزانن کورد چییەو کێیەو کوردستان چییە، پێیانخۆشە بزانن ئەم نەتەوەیە

لە پێش ئیسلامداو لە دوای هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەکەیان، چۆن بووەو چۆن نەبووە، ئەوا دەتوانن ئەم کتێبە بخوێننەوەو زانیارییەکی گرنگو بایەخداری ئەو رۆژگارە دێرینەی کوردو کوردستانیان دەستکەوێت.

دەکرێ ئەم کتێبە وەک پانۆرامایەکی گشتیو زانستیی، سەبارە بە بوونی کورد وەک نەتەوەیەک، لەسەر خاکی کوردستان، لەقەڵەمبدەین. ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ ناساندنی رەگو ریشەی نەژادی کوردو چۆنیەتی بڵاوبونەوەیان بەسەر ئەم خاکەی هەنووکە تێیدا نیشتەجێ بوونو بووەتە خاکی خۆیانو باوباپیرە دێرینەکانیان.




لەڕاستیدا ئەم کتێبە تەنها باسی سەردەمی دێرینی کورد ناکات، تەنها باسی ڕەچەڵەو ڕەگو ریشەی نەتەوەی کوردو خاکەکەی ناکات، بەڵکو لەو سەردەمە کۆنەوە تاکو ساڵانی دوای جەنگی دووەمی جیهانیش باسدەکات. لەو گەشتە دووردرێژەدا باسی گەلێک لە سیماو ئەدگارو ئەو کارەساتو نەهامەتیانە دەکات کە لەمێژوی دوور نزیکدا، بەسەرکوردا هاتووە . بەمانایەکی دیکە ئەم کتێبە زانیارییەکی وردی لەسەر کوردو نەتەوەکانی دیکەی ئەم ناوچەیە تێدایە، زانیارییەک ڕەنگە هەمومان حەز بە زانینی بکەینو پێمانخۆشبێت بیخوێنینەوە . لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم کتێبە لەلایەن وەرگێڕی بە توانا بەڕێز «حەمە کەریم عارف»، بە زمانێکی کوردی پوختو پاراو وەرگێڕدراوە، زمانێک لەکاتی خوێندنەوەیدا هەست بە هیچ گرێو نارەحەتییەک ناکەیتو بە ئاسانی بەدەستەوەدێت.

کتێبەکە لە ٢٦٩ لاپەڕەی نیو ئەی فۆڕ پێکهاتووەو نرخەکەی ٣٥٠٠ دینارەو تیراژی ٦٠٠ دانەیە .

